

١٤٠١هـ - ١٩٨١م

المعهد العالمي للفكر الاسلامي

زنجيرەی پرۆگرامکەرایی ئیسلامی (١)

# قەیرانی عەقڵی موسڵمان

د. عبدالحمید احمد ابوسلیمان

# قەیرانی عەقڵی موسڵمان

د. عبدالحميد أحمد أبوسليمان

پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی
١٤١٤ك / ١٩٩٤ز




الحمدُ لله رب العالمين

والصلاةُ والسلامُ على خاتمِ الأنبياء والمُرسلين

وَقل ربِّ زدني عِلماً

بسم الله الرحمن الرحيم

اقرأ باسم ربك الذي خلق (١) خلق الإنسان من علـق (٢) اقرأ وربك الأكرم (٣) الذي علم بـالقلم (٤) علـم الإنسان ما لم يعلم (٥)

(العلق : ١-٥)

والله أخرجكم من بطون أمهاتكم لا تعلمون شيئا وجعل لكم السمع والأبصار والأفئدة لعلكم تشكرون (٧٨).

(النحل : ٧٨)

ترجم الكتاب عن النسخة العربية ـ الطبعة الثالثة لعام ١٤١٤هـ / ١٩٩٤م

الى الكردية.

عدد النسخ المطبوعة: ١٠٠٠ نسخة.

ئەم پەرتووکە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی لەچاپی سێیەمی نوسخە عەرەبییەکەیەوە ساڵی ١٤١٤ک/١٩٩٤ز.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

أشرف على مشروع الترجمة: د. صلاح عزيز

مطبعة: پەیڤ ـ السليمانية

طبع الغلاف : مطبعة ژيان ـ أربيل

رقم الايداع: ( ٩٢ ) لسنة ٢٠٠٠

سەرپەرشتی پرۆژەی وەرگێڕان لەعەرەبییەوە بۆ کوردی:

د. سەلاح عەزیز

چاپخانەی: پەیڤ ـ سلێمانی

چاپی بەرگ : چاپخانەی ژیان ـ هەولێر

ژمارەی سپاردن: ( ٩٢ ) ی ساڵی ٢٠٠٠

ئەو نوسین و توێژینەوانەی کە پەیمانگە دەری دەکات بۆ ڕاو ئیجتهاداتی نوسەرەکانی دەگەڕێتەوە

پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی

هێرندن ـ ڤێرجینیا ـ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

بەدیاری

بۆ

برایانی ئیمانی و خۆشەویستی و

هاوڕێیانی ڕێباز

سڵاوی خۆشەویستی و دوعاخوازی و

بۆ

لاوانی نەتەوە و زانا و ڕۆشنبیرانی

وشەی حەق و چاوەڕوانی هیوا و

بانگەشەی لێ بڕان و کارکردن

خوایش یارمەتیدەرە لەسەر ڕێ

# ناوەڕۆك

## بەشی سێیەم

## پرۆگرامگەرایی هزری ئیسلامی: ڕێساکان و بنچینەکان

## بەشی چوارەم

## پرۆگرامی ئیسلامی و پێداویستییەکانی بنیاتنانی زانستەکانی ژیاری ئیسلامی



## بەشی پێنجەم

## لە پێشەکییەکانی زانستە کۆمەلایەتییەکاندا



## بەشی شەشەم

## ئیسلام و ئاینده

دەرکردن:

# وتەیەکی پێویست

هەموولایەك لەسەر ئەوە کۆکن کەنەتەوەی موسڵمان بە قۆناغێکی زۆر سەختی داتڵیشان و لێك هەڵوەشان و ونکردنی ناسنامەو داڕوخانی دامەزراوەو دەستەوسانی لە ئاستی خۆڕزگارکردن لەو بارە شپرزەییەی تیایدا ڕاڕایە، تێپەڕ دەبێت.

هەروەها لەسەرئەوەش کۆکن کە گۆڕانکاری کارێکی زۆر پێویستە، پاش ئەوەی نەتەوە ئازارونێشی ستەم و ملکەچ بوونی بۆ ئەزمونە بیانیەکان چەشت لە ماوەی زیاتر لە دوو سەدەدا لە هەوڵی بەزۆر چەسپاندنی بەسەر وڵاتی موسڵماناندا، هەر لەوکاتەوە کە نەتەوەی ئیسلامی هەستی بەوەکردوە لەئەنجامی هەندێك پێکگرتنەوەی لەگەڵ شارستانێتی خۆراوادا کێشەیەك یەخەی پێگرتوە، بەتایبەتیش لە تورکیا و مصردا.

نەتەوەی ئیسلامی لەوماوە دورودرێژەدا لاسایی ئەزمونی خەڵکانی تری دەکردەوە لە کاری سیاسی و فەرمانڕەوایی و، ڕۆشنبیری و بەڕێوەبردن و، ئاداب و کۆمەڵایەتی و زانست و هونەردا، بەڵام نەگەیشتە هیواو ئاواتی خۆی، لە ئاکامدا، بۆی دەرکەوت کە تەنانەت لە باشترین باریشیدا هەر بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، ئەگەر کەلەبەری نێوان خۆیو هاوشێوەکانیشی گەورەتر نەکردبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرکردایەتی نەتەوە نەیتوانیوە وەك پێویست دەرچەی[1] ڕاست و دروست دیاری بکات لە کرداری گۆڕانکاریدا بەرەو ئامانجی خواستراو، پاش لێ وردبونەوەیەکی زۆر لەوکارەو، ئەمدیواودیوکردنی گۆشەنیگاکانی تێڕوانین بۆیو پێداچونەوە بەو ئەزموونە پێشینانەی نەتەوە زەحمەتی تێدا کێشاوە لە پێناو خۆڕزگارکردن لەو قەیرانەو، هەڵسەنگاندنی ئەزموونەکان بەشێوەیەکی بابەتی و دەستپاکانە، بۆمان دەرکەوت خاڵی ڕاستەقینەو دروست لە بەرپاکردنی کرداری گۆڕانکاری دەبێت لە هزرەوە[2]

---

(١) دەرچە: منطلق

(٢) هزر: فکر.

دەست پێ بکات، ئەوەش چونکە هزر پێشەتایەکی سروشتی هەر کارێکە لێوەی هەڵقوڵابێت، جا ڕاست بێت یان هەڵە.

ئەوەش مانای وایە کەهزری ڕاستودروست، ڕابوونێکی دروست بەرپا دەکات،هەر ئەویش دەستی نەتەوە دەگرێت و لەقەیرانی خنکێنەر ڕزگاری دەکات و دەریدێنێت.

بە تایبەتیش لە کاتێکدا ئیسلام خۆی هزری بناغەیی ڕاست و دروست بۆ نەتەوەی ئیسلامی پێك دەهێنێت، لە هەمان کاتدا ڕۆحی نەتەوەش دەنوێنێتو، ویژدانی دادەڕێژێتەوە و دەیهەژێنێت، ئەو وزە جوڵێنەرەی تیادا دادەگیرسێنێتەوە کە توانای داهێنان و بەرپێگرتن و بەخشندەیی تێدایە، کەواتە هزری ڕاستو دروستوپێوست (هزری ئیسلامی‌یە).

لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەو کرداری گۆڕانکاری‌یەی مەبەستمانە، پێش هەموو شتێك کردارێکی هزری‌یە، دەبێت لەسەر بناغەی ئیسلام بێت، ئەو ڕێنومایی بکات، لە میانەی عەقیدەو بەها ڕەوشتی‌یەکانیەوە کاربکات، لەویشەوە سەرچاوە بگرێت.

سەرەڕای ئەوەی (زاراوەی هزری ئیسلامی) زاراوەیەکی گشتی‌یەو هەرکەسەو بەجۆرێك لێی تێدەگات، لەبەرئەوە پێویستە چەمکێکی دیاری کراوی بۆ دەستنیشان بکرێت، بەشێوەیەکی ئەوتۆ پرۆگرام و یاساکان بنوێنێت، چەمکەکان بباتەوە سەر ڕەگ وریشە، تا لە ئاکامدا بگەینە هزرێکی پوختەکراوی یەکگرتوو، سەرەنجام وێناکردنی هەموو لایەکمان یەك ئاسۆ بکاتەوە، ئەم کتێبە بۆ ئەوەیە، تا ببێتە بەشداری‌یەکی ڕاستەقینە لە ڕوونکردنەوەی ئەم دۆزەو باسکردنی هۆکارەکان و چارەسەرکردنیان.

کتێبەکە بە باسکردنی پرۆگرامی کلاسیکی هزری ئیسلام دەست پێدەکات و پاشان ڕەخنەی لێ دەگرێت و هەڵی‌دەسەنگێنێت، بەدوای ئەوەشدا باسی ڕێساو بناغەکانی پرۆگرامگەرایی هزری ئیسلامی دەکات لە ڕووی چوارچێوەو سەرچاوەو دەرچە سەرەکیەکانەوە، دواتر دەچێتە ناویاسی چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو پرۆگرامگەرایی‌یە لە ڕووی ئەوەوە کە تا چ ڕادەیەك بوار و هۆکار دەگرێتەوە، ئیتر بەباسی پرۆگرامی ئیسلامی و زانستەکان بە شێوەیەکی گشتی بابەتەکە بەپایان دەهێنێت.

پاشـان دانـەر دەچێتـە سەرباسـی جۆرەکـانی زانسـتە کۆمەڵایـەتی و مرۆییـە ئیسلامی‌یەکان و پێشـەکی‌یە تایبەتی‌یـەکانی لـە ڕوانگـەی ئیسـلامی‌یەتی مەعریفـەوە، هـەروەها دامـەزراوە زانسـتی‌یە مەبەسـتەکان.

لـە کۆتـایی کتێبەکـەیدا دانـەر هەڵوێسـتەیەك دەکـات تابـاس لـەدووخاڵی گرنـگ بکـات، یەکـەمیان : ئیسـلام و ئـایندە، دووەمیـان: ئـایندەی کـاروانی مرۆڤایـەتی، بـەوەش باسـەکەی کۆتـایی پـێ‌دەهێنێت‌و پوختـەی قەناعـەتی خۆیشـیەتی کـە ئیسـلامەتی دۆزی سـەرەکی نەتـەوەو دەسـتە بـەندی چارەنوسـیەتی، هەرئـەویش قـەدەر و ئامـانج و هۆکاریـەتی بـۆ ڕزگـار کردنـی لـەو قەیرانـەی تیایـەتی، ڕێبـازو ڕێگەیشـە بۆ بنیاتنـانی شارسـتانێتی‌و بـەرپابوونی ڕابوونـی.

بێگومـان ڕاسـتکردنەوەی پرۆگرامـەکانی بیرکردنـەوەو، گەڕاندنـەوەی کاروبارەکـان بـۆ ڕەگو ڕیشـەکانیان‌و گواسـتنەوە لەکەرتـە بەشـی‌یەوە بـۆ هەموایـەتی‌و گشـتگیری‌و لـەڕوکاری کێشـەوە بـۆ کرۆکـی ڕاسـتەقینەی‌و بنیاتنـانی بنچینەگشـتی‌و چەسـپێنە گشـتی‌یەکان و ڕاسـتکردنەوەی دەرچـەکان بـەپێی ڕێنومـایی ئیسـلام، دەبنـە مایـەی مسـۆگەرکردنێکی ڕاسـتەقینە کـەکرداری گۆڕانکـاری هـزری دەکاتـە کردارێکـی ڕاست‌ودروسـت‌و سـەرکەوتوو، بـەوەش نەتـەوە هـەر لـە سـەرەتاوە پێی لەسـەر شـارێگەیەکی دروسـت دەچەسـپێنێ.

ئەمـەش ئـەو مەبەسـتەیە کـە ئـەم کتێبـە هـەوڵ دەدات ئـەنجامی بـدات‌و بـەرەو ئەوێ ڕێگەبگرێتەبـەر.

ڕەنگـە هـەندێ لەخوێنـەران واببینـن کـە دانـەر قەوارەیـەکی گـەورەتری داوە بەدۆزی هـزری، بـەڵام بـێ ڕوپامـایی دۆزی هـزری دۆزێکـی بنچینـەیی پڕبایەخـە بەیـەك دەنگـی بیریـارانی نەتـەوە، پاشـان دانـانی ئـەو دۆزە لەسـەرەتاوە مانـای فەرامۆشـکردنی لایەنـەکانی دیکـە نییـە، کـە هـەر یەکـەیان لـە جێگـەی خۆیـدا دەوری گرنگـی هەیـەو هەموشیان پێکـەوە پێویسـتن بـۆ گەیشـتنە ڕابونێکـی ڕاست‌ودروسـت لەسـەر بناغـەی ئیسـلام.

هەرچـەندە سـەبارەت بـە دۆزی قـەیرانی هـزری‌و پێکـهاتنی عـەقڵی موسـڵمان‌و پرۆگرامگـەرایی ئیسـلامی توێژینـەوەی زۆر کـراوەو نوسـراوە، بـەڵام ئـەم توێژینەوەیـەی دانـەر کـە لەبەردەستتایە جۆرە ئاراستەیەکی تـری تایبـەتی هەیـە.

دانەر لە پێشکەشکردنی بابەتەکەیدا سەبارەت بە قەیرانی نەتەوەی ئیسلامیو ڕەهەندە هزریو پرۆگرامگەراییو ڕەگو ڕیشەی مێژوویی ئەم قەیرانە تیژ بینانە دەڕوانێتە بنەماکان بە شێوەیەك لەم بۆچوون و وردبینیەی سەبارەت بەم لایەنە هاوتایکەمە. بە توندو تۆڵیەوە ئەو بابەتانەی پێك بەست کردووە وەك هەندێ نوسەر بە تیژڕەوی بەسەر دۆزەکاندا هەڵ نەبوردوە، بەڕادەیەك تەنها لەیەك لایەنەوە لێی هەڵبڕوانن و لایەنەکانی تر فەرامۆش بکەن، پەندو وانەدەرهێنانو پرۆگرامی گەیشتن بە ئامانج، لە پەسەندییەکانی ئەو تێڕوانینە گشتیو هەموو گیریانەیە کە دانەری پێ دەناسرێتەوە، چونکە خۆی بە دۆزە لابەلاییو وردە بەشەکانەوە خەریك نەکردووە ، نەشچوەتە ناو کارتەبەشە هونەرییە تایبەتمەندەکان یان قوتابخانەییەکانەوە، ڕێگەش نادات هزری خوێنەر زۆر بەو شتانەوە خەریك بێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەستی خوێنەر دەگرێتو بەرەو پەندو وانەکان دەبیات، لێرەوە شێوازی نوسەر لەسەرەتاوە قورس دێتە بەرعەقڵو دڵی خوێنەری ئاسایی، بەلام دوای ئەوەی جارێکی تر خوێنەر دەیخوێنێتەوە لەبەر ڕۆشنایی ئەو مەبەستو بیرو بنچینەییانەی نوسەر پێشکەشیان دەکات، بە خێرایی ئەو قەناعەتەی بۆ دروست دەبێت کە دەیگەیەنێتە ڕەزامەندیو ئاسودەیی.

تۆش کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، وەك داڕشتنێك نایخوێنیتەوە، خۆیشت لەناو کۆمەڵێ گەردو خولی زمانەوانیو ڕەوانبێژیدا نابینیتەوە، بەڵکو خۆت لە نێوکانێکی جەنجاڵ بە بیرۆکەی هەمە جۆری وادا دەبینیتەوە کە بەسەریەکا کەڵەکەبون تابگەنە عەقڵو ژیریت، سا بەڵکو قەناعەتت بۆ دروست بکەن.

نوسەرەکەیان تێکۆشەرێکی تۆکمەی وایە کە خەمخۆری بانگخوازی ئیسلامیو هەڵگری باری قورسی کێشەو زەحمەتەکانی بووەو هەر لە تافی نەوجەوانیو لاویو پیریشدا، ئەو ئێشو ژانانەش بەلای ئەوەوە بابەتی تەعبیر لێدانەوەو ئامانجێکی هونەریو وێژەیی نین، بەڵکو ئێشو ئازارو سکالای ناخیخۆیەتی، ئەگەر شاعر بوایا ئەوا کتێبخانەکانی بە شعرو هۆنراوەی جوان پڕ دەکرد لە کتێب، ئەگەر نوسەر و دانەرێکی پیشەگەریش بوایە ئێستا ژمارەی لیستی دانراوەکانی یەجگار زۆر دەبوون، تەنانەت هەریەکە لە بیرۆکەکانی دەشێت لەلایەن نوسەرە

پیشـەگەرەکانەوە بکرێتـە کتێبێکـی سـەربەخۆ یـان زیـاتر، بـەڵام دانـەر بڕیـارێکی تایبـەت و نـاوازەو پابـەندە بـە مەبەسـتەکانی نەتەوەکـەی و ئامانجـەکانی بوونی‌یەوە، هـەندێ وشـەش زبرایـی موجاهیدانـەی پێوەدیـارە، تۆکمـەیی پێشـەوایی تیـادا دەرئەکـەوێو ڕاسـتەوخۆ لـە وتـارو پەیڤینـەکانی‌دا ڕەنگـی داوەتـەوە، ئامانجەکانی واڵا دەکاتو تەنـها بـە دەوریـاندا خـول نـاخوات، سـەر لـە خوێنـەریش تێك نـاداتو بەبێ‌هودەش ئـاوڕی بـەملاولادا پـێ ناداتـەوە، بـەڵکو بـە تونـدی هـزری دادەچڵەکێنێـت و ڕووی پـێ وەردەگـێڕێت بـەرەو ئامـانج تافریـای خـۆی بکـەوێتو بـەرچاوی ڕۆشـن بێـت وتائەوکاتـە کەمـەی لـە بەردەسـت دامـاوە لـە کیـس خـۆی نـەدات.

دەرکردنـی ئـەم کتێبـە چـەند ساڵێك دواکـەوت ــ هەرچـەندە بەشـەکانی خرابـووە سـەریەكو کۆبـوو ــ بۆئـەوەی سـەرکردە هزری‌یـە کۆمەڵایەتی‌یـەکانی نەتـەوەی ئیسـلامی بـە تـێڕوانینێکی ڕاسـتگۆیانەو ڕاشـکاوانە پێیدابچنـەوەو بـەم هێندەقوڵایـی‌و گشتبینی‌یە لـە بارودۆخی نەتـەوەی ئیسـلامی تـێ بگـەن، دور لـە سـڵەمینەوەو پـۆزش هێنانـەوە و بەرژەوەندی‌یـە تایبەتیـەکان‌و تـاریکی دەروازەی ئاواتـە سیاسـیە پەلـەخوازەکان. خولانـەوەی زەمـان‌و هاتنەپێشـەوەی کەڵـەرووداوەکان بـوو بـەهۆی دەرکردنـی ئـەم کتێبـە بـەخۆی و دۆزەگەورەکانیـەوە بـەرەو گۆڕەپـانی پـەندو لێکۆڵینـەوەو وانـەو تـێڕوانین‌و دایـەلۆگ، هێنـای‌و کردیـە کـارێکی پێویسـت، ئومێدەواریـن ئـەم کتێبـەمان لێوەربگـیرێتو بابەتـەگرنگو ڕاسـتو دروسـتەکانی بـە بایەخـەوە تەماشـا بکرێـت لەلایـەن نەتـەوەو سـەرکردە هـزری و کۆمەڵایـەتی و لاوانیەکانیـەوە.

لـە خـوای گـەورەش داپاڕێینـەوە کـە پاداشـتی نوسـەر بداتـەوە، بەڕاسـتی خـوای گـەورە توانـای بەسـەر هـەموو شـتێکدا هەیـە.واخـر دعوانـا أن الحمـد لله رب العـالمين.

طه جابر

سەرۆکی پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی

هێرندن ــ فیرجینیا

ڕەبیعی یەکەم: ١٤١٢ك

سێبتەمبەری ١٩٩١ز.

# پێشەکی دانەر

سوپاس و ستایش بۆپەروەردگاری جیهانیان و درود و سڵاو لە سەر سەروەرمان پێغەمبەری ئیسلام ﷺ (محمد) و یارویاوەرانی بە گشتی.

خوێنەری بەڕێز:

ئەم کتێبە دەخەمە بەردەستت، کە کتێبێکی تایبەتی یە، کۆکردنەوەو دانان نیە بەڵکو توێژینەوەو تیڕوانین و شیکردنەوەیەکە بەدرێژایی تەمەنت پێویستت پێی دەبێت چونکە باس و خواسەکانی پەیوەندی بەدڵ و دەروونەوەهەیە، ئەو دۆزەی لەم کتێبەدا باس دەکرێت، دۆزی نەتەوەیەکە، بگرە هەرخۆی (نەتەوەیە)، ئەو ساوایە عەقڵ و دڵی بەڕوی ئێش و ئازارو پەژارەکانیدا کردۆتەوە و ژان و ناڕەحەتیەکانی نوسەرو شاعرەکانی پەی پێ دەبات، هەر لەوکاتەی چاوەکانی توانیویەتی وشە بخوێنێتەوە، وە زاری توانای پیت درکاندنی هەبووە دڵی زانیویەتی چۆنچۆنی واتای لێك بداتەوە. لە مەڵبەندی دابەزینی سروشی خوایی داو پلە گاکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ، وەلە کورسیەکانی وانە خوێندن و لە نێوان چەپکە کتێبەکاندا لە پێش چاوی ئەو لاوەدا لاپەڕەکانی مێژوو والابوو بە شیرین و تاڵیەوە، و بەو ئەندێشەیەوە لەگەڵ مەرداندا دەژی و باشەکانیان لێ هەڵداوێرێت، هەندێ جاریش ئاخ و خۆزگە دەرونی دادەگرێت، و هەستکردنیش بە قولایی قەیرانەکە دڵی پردەکات لە سوربون و خۆڕاگری و پێ داگرتن لەسەر گۆڕانکاریی.

کاروانی ژیان کارامەیی و زانیاری بەنووسەر بەخشیوە، ئەندێشەکانی نەتەوەکەمان درێژەی بە هەستکرنی داوە سەبارەت بەباری نەگریس و ناڕەحەتی یەکان، دەرفەت نەبووە کە پرسیاری لە خۆی نەکردبێت ئاخۆ هۆیەکانی هەڵەنگوتن و داڕمانی نەتەوە چی بێت، عەقڵ و دڵیشی کە لەسەر فیل و لە ڕێ لادان ڕانەهاتون قەناعەت بەوەڵامی ڕاست و دروست نەبێت ناکەن.

هەروەها توێژینەوەی و کارامەیی ئەو ژیانەی کە مەعریفەی کەلتوری و مەعریفەی هاوچەرخی کۆکردۆتەوە یارمەتی داوە بۆ تێڕامان، لێ وردبونەوەو، قەناعەتیشی بەڕێگەی شیوەن و پەرێشانی یان هەڵچونە عاتفی و واتا حەماسی یەکان نەبوو، کاروباری دۆخی نەتەوەی ئیسلامی لە پێش چاوی بینەرانیدا بۆتە دۆزێکی گرنگ و پێویستی بە لێ تێگەیشتن وتوێژینەوەو شیکار هەیەو، دەستکەوتەکانی بەو دۆزەوە گرێ داوە، بەو نیازەوە شەو و ڕۆژ بیرماڵ دەکات،

بە قوڵایی مێژوو بەرووداوەکانی‌دا ڕۆدەچێت، بەمەبەستی تێگەیشتن و شوێنکەوتنی ڕاڕەوەکەی، ڕاستی نەبێت نایەوێت، بەدوای چارەسەردا دەگەڕێت. هیچ شتێك نیە کە مرۆڤ لە پێناو ڕزگار کردنی نەتەوەکەی لە پەژارە و ناڕەحەتی نەیگرێتەبەرو فیدای نەکات.

خوێنەری بەڕێز :

نوسەر کە دەنوسێت، لەڕاستی‌دا لەڕوانگەی ناخی خۆیەوە دەنوسێت، لەبەرئەوە نەخۆشی‌و دەردەکانیش هەرهی خۆیەتی‌و وەبەهی خۆی دەزانێت، ڕووداوەکانی مێژوو و پاشماوەکانی ڕابردوو کێشە و ناڕەحەتی‌یەکانی ئێستاو خۆزگەو ئاواتەکانی ئایندە دەرژێنە قوڵایی ناخ و ناو پەڕەی دڵ و پێچولوولەکانی مێشکی، کەسیش هێندەی ئەو هەست بە ئێش و ژانەکان ناکات و هەستەکانی ماندوو ناکات، ئەو دەتوانێ دەست بخاتە سەردەرمانەکەو هۆیەکانی چاك بونەوەش ڕوون بکاتەوە، هەموو خەمو بەڵاو گیرۆدەبونێك ئەو دەگرێتەوە، هەر کارەساتێکیش کە دەینوسێت هیچی بۆ ڕەخنەو هەست ڕووشاندن و دەست درێژی و نیاز خراپی نیە، بەڵکو دەربڕینی ئاوەزو ووتەی ڕاستو ڕاشکاوە، لەڕاستگۆیی‌یەکەیدا گەرم و گوڕی توندو تیژی و لە ڕاشکاوی‌یەکەیدا تفت وتاڵی‌یەکەی پێ دەبڕێت.

خوێنەری بەڕێز :

کاتێك نوسەری ئەم کتێبە بەم زمانە لەگەڵتدا دەدوێت، وا مەزانە بێئاگایە لەو خێرو بێرەی لە قوڵایی ناخی نەتەوەکەماندا هەیە، یان لەو شکۆمەندی‌یەی ناو جەوهەری و وزەکانی پەل و پۆی و ئەوباوەڕە پتەوەی کە ڕوخساری ڕوناك و درەخشان کردوەتەوە بە هەوڵ و تێکۆشانی دڵسۆزانە، ئەوەی نوسەر لەم بارەیەوە کردویەتی نەبۆ پیا هەڵدان و ناوبانگ بوە، نەبۆ لابردنی گلەیی بووە، کە ئەمەش هەمووی خێرو بێرە، بەڵکو نوسەر وای داناوە کە خۆی کەوتووەتە گرێ پوچکەیەکی بێ چارەو گێژاوێکی دواکەوتویی و شەپۆلێکی زەلیلی و سکاڵای داماوانەوە و داوای فریاگوزاری و یارمەتی و دەربازبوونی دەکات.

ئەگەر لە شوێنێکدا وا بینیت کە نوسەر کەم تەرخەم بوەو گوایە وەك پێویست هەڵوێستی ڕێزلێنانی نەنواندووە بەرانبەر بە شکۆمەندی نەتەوەوبە خشندەیی و ناوبردنی مەردو زانا و سەرکردە و گەنج و موجاهیدەکانی، نەخێر —

بەڵاو کێشەکان ئەوەندە چڕو سەختن ــ نوسەر دەیەوێت دەست بخاتە سەرزامەکان و بەو پێیە بەدوای دەرمانەکانیاندا بگەڕێت.

ئەوەی لەم کتێبەشدا نوسیومە بە وتەو توێژینەوە و تێڕوانینەکانمەوە نامەوێت کەس بە زۆر واڵێ بکەم کە پێوەی پابەند بێت، یان بترسم کە هەڵەیەکی تێدا بکەم و پێم ناخۆش بێت ڕاست بکرێتەوە، نەخێر، بەڵکو هەموو مەبەستێکم ئەوەیە خوێنەر بەشداریم بکات لە توێژینەوەو تێڕوانین دا لەوەی پێی گەییوم لە بینین و چەمکی ئەو هۆکارانەی کە نەتەوەکەمانی گەیاندوەتە ئەم بارودۆخەی کە بە دەستیەوە دەناڵێنێت.

کەس هێندەی من دڵخۆش نابێ کاتێ دەبینم ئەم کتێبە بوەتە مایەی بەرپاکردنی دایەلۆگ و ڕاگۆڕینەوە و دەستاو دەست پێ کردن بە مەبەستی گەیشتنە ڕاستی و لابردنی تەم و مژی گومان و کردنەوەی ڕێگەی ڕزگاری، جا ئەوەش چ جیاواز بێت لەڕای نوسەرو بانگەشەکەی یان لەسەر هەمان ڕاوبۆچوون بێت.

هیچ شتێك لێرەدا لەوشەی هەق و ڕاستی باشترنیە، کە مەبەستی هەق و لێدوان لەریشەو بنەچەی باسەکە بێت وبیەوێت بگاتە چارەسەر.

هەموو ئەوەی ئەم کتێبە دەیخوازێت ئەوەیە کە بتوانێت ببێتە بەشدارێکی ڕاستەقینە لەوێنەکێشانی نەتەوەیەکی موسڵمانی بە تواناو بە هێز، دووربێت لە لێکترازان و سستی و نەخۆشی، جا چ تاکەکانی بێت یا گەلەکانی، یان دامەزراوەکانی، ئەو هەق و ڕاستی و ڕێنومایی‌یە بەرجەستە بکات کە نەتەوەکەمان ئاواتیەتی لە ڕووی هێزو کارەوە، لە باری نمونەیی و واقیعی‌دا، لەڕووی ئامانج و هۆکارەوە.

ئەم کتێبە ــ ئەگەر چی قەوارەیەکی ساکاری هەیە ــ خوێندنەوەکەی سادەو ئاسان نیە، چونکە باس لە بابەتێکی ئاڵۆزی پەل وپۆداری ئەو تۆ دەکات کە بەناخی گەلان و بەرەی مرۆیی و چاخەکاندا درێژبوەتەوەو پەلی بۆ هاویشتووە، بە درێژایی مێژوو پانتایی نەتەوەدا، خوێندنەوەی دێرەکانی پێویستی بە تێشویەکی مەعریفی و مێژوویی هەیە، هەروەها شارەزابوونی دەوێت ، سەبارەت بە سروشتەکان و سوننەت و یاسا خواییەکان لە نەتەوەو شارستانیەتەکاندا تا تێگەیشتنەکان ڕاست و دروست بن لەو ڕووەوە کە نوسەر ئاماژە و دوورو بەرو بومەکانی دەخاتە ڕوو.

ئومێدەوارم کە خوێنەر هەندێ لە کات و ئارامگری خۆی تەرخان بکات بۆ هەندێ لەو شتانەی لەم کتێبەدا باسیان دەکەم بە درێژایی چەندین ساڵ ئەندێشەو سەرنجدان و توێژینەوە، پێ‌ی‌گەیشتوم، تاکو خوێنەر بگاتە ئەوەی کە نوسەر دەیەوێت، بێگومان خێرا خوێندنەوە و پەڕە.. پەڕەکردنی بەپەلە وا لە خوێنەر دەکات تەنها توێکڵی باسەکان ببینێ و وردە باس و چەمکەکان پەی‌پێ نەبات، و بێژەو دەستەواژەکان بە ڕۆتینی ببینێ و نەچێتە قوڵایی مەبەستەوە، ئەوساکەش بینینەکان زیاتر لێڵ دەبن و ڕێگەش تاریکتر دەبێت، ئەم کتێبەش هێندەی بایەخ بە دۆزە زلەکان و کرۆکی بابەتەکان دەدات، هێندە ناچێتە درێژایی باس و بەڵگەونیشانەکان‌و، گفتوگۆی بیروڕا جیاوازەکانەوە.

خوازیارم دام و دەزگا زانستی‌و ڕۆشنبیری و سەرکردایەتی و کۆمەڵایەتی‌یەکانی ئەم نەتەوەیە ئەم کتێبەمان لێ وەربگرن و بایەخی پێ بدرێت بە تایبەتی لە وروژاندنی — دۆزی قەیرانی هزری ئەم نەتەوەیەو لە دەستدانی بینیەی گشتی‌و پرۆگرامگەرایی تەواوکاری تیایداو، خستنە ڕووی جێگرەوەو ڕێگە چارەکان — هەروەها دەخوازم ئەم کتێبە ببێتە سەرەتایەك بۆ پەیڤینی ڕاستەقینەو ڕوون و ڕەوان بەرەو تێڕوانین و توێژینەوە — بێگومان ترسان و تۆقین و ترساندنمان لە ناخی خۆماندا بن بڕکردووە— تاکو بەشێوەیەکی کرداری بچینە قوڵایی ئەو قەیرانەی عەقڵی موسڵمان دووچاری بوە، بەڵکو بگەینە شێوازو هۆکاری پێویست بۆ ڕێگەچارە، بە پێ‌ی توانا، لە پێناو گەیشتنە ئامانج.

لەم کارەشماندا نامانەوێت نرخ و بەهای هیچ گروپ و دەستەیەکی ئەم نەتەوەیە، یان زاناکانی دابەزێنین، نوسەر دەزانێت سینەی ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە و زاناو پێشینەکانی چ باوەڕو جیهادو دڵسۆزی و لێبڕانێکی بێ‌وێنەی تێدابووە و تێدایە.ئەم کارە هەوڵ دانێکە بۆ تێگەیشتنی بابەتیانەی کاروانی مێژووی نەتەوەیەك و ڕوداوەکانی شەوو ڕۆژەکانی، کە پیاوان بەڵکو دەوڵەتانی گەیاندوەتە ڕێگە گەلێك کە ڕێبەر تیایا دەستەوستان و بینین تەماوی‌و جێگرەوەی[1] مەحاڵە، کارەکەش کاری سەرزەنشتی و هەست‌و ڕوشاندن نیە، بابەتێکی دڵدانەوەو پۆزش ئامێزیش نیە، بەڵکو تێڕوانین و تێگەیشتن و توێژینەوەو شی‌کردنەوەیە، نوسەر خوازیاری هاتنەدی ئاواتی ئەودڵسۆزانەیە کە

---

(١) جێ گرەوە: بدیل.

کاردەکەن لەپێناو لابردنی کۆسپەکاندا ئەگەر لە ناخی خۆمان و کرۆکی عەقڵیشماندا بێت.

ئاواتمان ئەوەیە کە بیریارو رۆشنبیرو و سەرکردەو لاوانی نەتەوەکەمان رابن و دەستگەرمانە بە ئەرکی خۆیان هەستن و دەست بدەنە مامەڵەیەکی رون‌و راشکاوانەو راستگۆیانەو ئەو هۆکارە پێویستانەش بگرنەبەر کە بۆ رووبەڕووبونەوە ئاتاجیانە، بەبێ‌ئەوەی نکولی لە سروشت‌و رەوشت‌و ناسنامە بکرێت، ئەوەش تەنها بەداهات بەهەدەردان و قوربانی‌دانی زۆر نابێت، بە بانگەشەی زۆر و زەبەندە بۆ رەوشت‌و بنەماکان نابێت، هەروەها ئامۆژگاری‌و سۆزبزواندنی پەتیش کاریگەری ئەوتۆی نیە، بەڵکو رابوونی ئەو گەورە پیاو و پێشەواو لاوو رۆشنبیرانە بە چاکسازی پرۆگرامەکانی هزر دەستەبەر دەبێت بەسەرەتاو بناغەیەوە، بەگرتنەبەری رێگەی چاکسازی پرۆگرامەکانی پەروەردەو سیستمە کۆمەڵایەتی‌یەکانی نەتەوە و دوبارە بنیات نانەوەی وزەکانی خەڵکی و گرتنەوە خۆی کانگەی مەعریفە و تواناو بەجێگەیاندن.

بابەتی ئەم کتێبە دەستنیشان کردنی نەخۆشی‌یەکان‌و زانینی دەرمانەکانی چارەسەرکردنی و دەرچەکانی چاکسازی‌یەو کرۆکی پەیڤین‌و دایەنۆکەکانە، ئەوەش کەرەسەی سەرەکی هەموو بیریارو رۆشنبیرێکی دڵسۆزە کەمەبەستی گرتنەبەری رێگەی هەق و هەقخوازی بێت گەرچی بۆچوونەکانیش جیاوازبن، بە نیازپاکی‌و رەحنەگرتنی بابەتیانە راوبۆچونەکان پێ دەگەن تا لەگەڵ ئامانجدا یەکانگیرببنەوەو تێروانینەکان تەواو بکەن‌و هۆکارەکانیش زاڵ بن.

**لە ژێر کەلاوەی دیواردا:**

وەك پێشتر باسم کرد ئەم کتێبە لە بنەرەتدا بریتی‌یە لە هەندێ کۆباس[۲] و توێژینەوەکە لەلایەن نوسەرەوە پێشکەش کراوە، سەرەتای دەست پێ‌کردنیشی بەوکارە لەودەمەوە سەری‌هەڵدا کە هێشتا قوتابی‌بوو، بەو نیازەی بتوانێت لە ئایندەدا پێیدا بچێتەوە و بەدور و درێژتر رونکردنەوەکانی بخاتەسەر کتێبەکە بە تەواوەتی جێگەی ئەو باسەی تێدا نەدەبوەوە. کاتێك تەرخان کرام وەك بەرێوەبەری گشتی پەیمانگەی جیهانی بۆ هزری ئیسلامی لە ئەمریکا لە ساڵی (١٤٠٤ك/١٩٨٤ز) دەستم کرد بە پێداچونەوەی ئەو کۆباس و توێژینەوانەی لە

---

(٢) کۆباس: محاضرة.

تویّی ئەم کتێبەدا کۆمکردبوونەوە، بەڵام بە دووساڵ تەواوم کرد بەهۆی سەرقاڵیم بەکاروباری پەیمانگەوە، لەوماوەیەشدا بابەتەکانی کتێبەکەم لەهەندێ وڵاتو سەر وتارگەکاندا پێشکەش کرد، ئەوانەش بە گشتی چاکتر دڵنیایان کردمەوە لە ڕادەی ڕاستی ئەوکێشەیەی کەلەم کتێبەدا خستبومنەڕوو، بایەخی باشتری ئەوانیشم زانی بگرە زۆربەی نوسەران هاوکاری پەیمانگەیان کرد سەبارەت بە چۆنەناو یا لە دەرگادانی زۆرلایەنی دۆزەکە و قوڵکردنەوەی زۆربەی لایەنەکانی، بڵاوکردنەوەی کتێبەکەش دواخرا، تا لە ئەنجامی توێژینەوەو پێشکەشکردنی وەك کۆباس چاکتر بابەتەکە هەرس بکرێتو مەبەستەکانی بۆ خەڵکی ڕوونتر ببێتەوەوو هۆکارە دەرونییەکان بڕەوێنەوەو کرۆکی باسەکە بەهەدەرنەچێت.

ئەمڕۆش کەپشتێن بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبەکە بەستراوە، تاباسەکانی پێشکەش بکات بەڕۆشنبیرانی نەتەوەی بیریارانی، بۆ ئەوەی هاوکاری یەکتری بکەن بۆ قوڵ بونەوە لە لێکدانەوەی ڕەهەندەکانیو هەنگاونانو بۆ جێبەجێ کردنی بابەتەکانیو ئەوشتانەی پەیوەندی پێوەی هەیە هەر لەدۆزە جیاجیاکانو هەوڵو تێکۆشانەکانەوە تا دەستکەوتە زانستی و کردارییە پێویستەکان، بێگومان لێرەدا پێویست بوو دوایین هەڵوێست ئەنجام بدەین سەبارەت بە ڕوداوەکانو شوێنەواری دۆزی ئەم کتێبە سەبارەت بەو ڕووداوانە بزانین.

لێرەدا کەدەڵێم ڕوداوو مەبەستم لە ڕوداوی جیاوازییەکانو جەنگو تراژیدییە عەرەبیو ئیسلامییەکان نییە چونکە ئەوانە تەنیا دوبارەکردنەوەی یەکن بەدرێژایی سەدە ڕابردووەکان دوبارەبونەوەیەك کەمترینیان تیاچونی نەتەوە لە ئەندەلس و زامداربونی قودسو زەوی غەلەستینن.

ئەو ڕوداوانەی لێرەدا مەبەستمانە بریتییە لە تێکروخانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتیمارکسی لەڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و کەوتنە لەرزەی قەوارەی سۆڤیەتی و کەرت و پەرت بونی سەرخانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی.

وە گرنگێتی ئەم ڕوداوانە و کاریگەریان بۆ سەر نەتەوەی ئیسلامی و دۆزە شارستانیەتییەکەی لەو ڕوانگەیەوە کە ئەم کتێبە باسی دەکات بایەخ پێدانێکی سیاسیانە نییە دەربارەی هەرەس هێنانی ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە هەندێ لە دەوڵەتان لە پاڵیدا خۆیان حەشاردابوو تا بپارێزرێن لە دەستی ستەمکارانەی خۆراوایی بەڵام هیچ سودێکی وایان دەست نەکەوت بەڵکو ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە لایەنی هزری و ژیارییە.

پێویستە بزانین کە ناوەڕۆکی بزاڤی مارکسی ئەوەیە کەبزوتنەوەیەکی چاکسازی خۆرئاوایی‌یە لە هزر و کۆمەڵگەی خۆرئاواداو، مارکس یەکێکەلە گەورە فەیلەسوفەکانی‌خۆرئاواوو پێشەوای هزری نوێو سەرکردەی بزوتنەوە چاکسازی‌یەکەی ئەمەش سروشتی ئەو جەنگی ڕاگەیاندنە ناگۆڕێ کە لە نێوان دەوڵەتانی خۆرئاواو دەوڵەتانی شۆڕشی مارکسی‌دا بەرپابوو لە ڕوسیا و خۆرهەڵاتی ئەورووپا و لە نێوان پارتە مارکسی‌یەکانی خۆرئاوای ئەورووپا و ئیتالیا و فەرەنسا و یۆنان و هتد.. کە زۆربەی خەڵکی وایان دانابوو کە بزوتنەوەی مارکسی بزوتنەوەیەکی بەرەنگارەوەبوی دژوارە لەگەڵ هزرو ژیاری ئەورووپی و خۆرئاواییدا.

ناوەڕۆکی بزوتنەوەی مارکسی بریتی‌یە لە پاکژکردنەوەی دەرچەکانی هزرو شارستانی‌یە ئەورووپی‌یە خۆرئاوای‌یە نوێیەکان‌و گەیاندنیانە بە ئاکامە ڕەهاو لۆژیکیەکان.

ئەو شارستانێتی‌یە ئەورووپی‌یە خۆراوایی‌یەی کە لە ژێرکاریگەری شارستانێتی ئیسلامی‌دا پێك هات وەك وەڵامدانەوەیەك بۆی، لەسەرەتاکانی سەرهەڵدانیدا بینی کە مەسیحیەت هەروەکو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نوقمی لادان‌و خورافەت و گەندەڵی بوو، هەروایە و پشتیوانێکی هزری ڕاستەقینەی نیە بۆ ڕاستکردنەوەو چاکسازی،بەڵکو عەقڵ بوەتە سەرچاوەی سەرەکی و ماددەش بوەتە ئامانجی ئایین و تەنها سروت‌و[1] نەریتەکانی بۆ ماوەتەوە لە سنوری کەنیسەکاندا، بێ‌ئەوەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا کاری پێ بکرێت و هیچ ئاڕاستەیەکی پێ ئەنجام بدرێت؛ چارەسازی‌یەکانی شارستانێتی خۆراوا کەوتە جموجوڵ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وزەی تێڕوانینی وردو، هەموو لایەنەکانی ژیان و هۆکارەکانی خستنەگەڕ، لەگەڵ ئەو برە کەمە ڕۆحی‌یە ڕەوشتی‌یەدا کە بەشێوەیەکی لاواز تینی تێدامابوو، لە نێو هەندێ لە کاربەدەستەکانی کەنیسەدا،بەو نیازەی لە چاکسازی‌دا بەردەوام بن.

بەڵام ئەوبارە شڵۆق و پشێوە کەلەبەرێکی ڕۆحی دروست کردو بوەهۆی دروستکردنی کۆسپ و لەمپەری کۆمەڵایەتی بەرچاو، بەڕادەیەك کەسات لەدوای سات ئاسەواری خراپەکانی باشتر دەردەکەوت، لەو دەمانەشدا هزری ژیاری

---

(١) سروت: طقوس

ئەورووپی بەدوای دەرچەیەك دا دەگەڕا، تەنانەت شۆڕشی فەڕەنسیی و بیریارو سەرکردەکانی هەوڵیان دا عەقڵ بکەنە بتێك و پەرستگەی بەپیرۆزگرتنیشی بۆ دابنێن.

هزری مارکسیش هاتەکایەوە تاکو ئەم بزاڤە ژیاریە بەهێزترو روونتربکاتەوەو لەو پشێوی و شلۆقی‌یەش ڕزگاری بکات و لەسەربناغەکانی شارستانێتی خۆراوایی بیگەیەنێتە دوایین سنووری، ئیتر (بوون)تەنها لەروانگەی مادی‌یەوە سەیردەکراو مرۆڤ خۆی و چارەنووسی خرایەلاوە و ناخوایی و بێ بڕوایی ((الکفر و الالحاد)) ئاشکراکران و بانگەشەیان بۆ کرا، ئایینەکان خرانەلاوە، لە هزرونەخشەی چاکسازیانەی مارکسدا شوێنێك بۆ رۆح و سروش نەمایەوە کە دەوری هەبێت لە ئاراستەکردنی مرۆڤدا بەرەوئامانجە رۆحی و رەوشتیەکانی لە ژیاندا.

ئەزمونی بەلشەفی مارکسی لەسەر ئەو بناغەیە دانراوەو بۆماوەی چەند سەدەیەك بە هەندێ کیشوەردا بلاوبویەوە،ـ ئەزمونەکەشی کۆتایی پێ هات ـــ لە ئاکامی ئەو جەنگە نالەبارەی دژی ئەفغانستان بەرپای کرد، ئاکامەکەشی شکست هێنان بوو لەو قەیرانە سیاسیی‌و کۆمەلایەتی‌و ڕەوشتی‌یە توندو تیژەی ڕووبەڕوی بوەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە بەلشەفی‌یەمارکسی‌یەکان پێیان وابوو دەتوانن مەبەستی مارکسییەت بەدی بهێنن و بەرگری لێ بکەن.

دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆراوایی دەهۆڵی شکستیان بۆئەم تێکشکانەی مارکسیەکان لێدا، بەو نیازەی کە قازانجی ئەم تێکشکانەی سستمی مارکسی بچێتە گیرفانی خۆراواو سستمە سەرمایەداریەکەیەوە، تەنانەت هەندێ کەس خەریك بووباوەڕ بەو پڕوپاگەندانە بکەن.

بۆ ئەوەی ـ وێنەی ڕاستەقینەی واقیعی جیهانی و شارستانێتی لەبەرچاومان ون نەبێت کە پاش چەند ساڵێ یان چەندسەدەیەکی تر ویستمان کەلەبەری ئەو نائومێدیە سەیر بکەینەوە ـــ دەبێت بزانین لە کاتێکدا سستمی مارکسی لەژێرکاریگەری ناڕەحەتی‌و قەیرانە ئابوری و رۆحی وکۆمەلایەتیەکاندا هەرەسی هێنا، ئەوا ئەمڕۆش دەوڵەتەکانی خۆرئاوا بەهەمان قەیرانی ئابوری و کۆمەلایەتی و ڕەوشتی دژوار و ترسناکدا تێپەڕدەبن کە هەڕەشە لە قەوارەی کۆمەڵگەکانیان ئەکەن، تەنانەت خەریکە دڵەڕاوکێی‌و نائارامی دەروونی‌و نەبوونی ئاسایشی کۆمەلایەتی و ئابوری دڵی ڕۆڵەکانیان لەبن دەربێنێ.

لاوازبوونی ڕەهەندی ڕۆحی و فەرامۆش کردنی ئەو ڕێنوما سروشتی‌یەی کە مرۆڤی خۆراوایی فەرامۆشی کردووەو تەنهاپشتی بەستوە بەعەقڵو دەروون و هەست و نەستی سنورداری خۆی و وەك شتێکی کەم نرخ و بەها سەیری بەها ڕۆحی‌یەکان دەکات، لە ڕاستیدا ئەوەیە ماکی پەتاو نەخۆشی شارستانێتی هاوچەرخی خۆراوا لەرۆژهەلات و رۆژاواشدا، تا شارستانێتی خۆراوا زیاتر دەست داگرێت لە تواندنەوەی ئەوتۆزە بەهارۆحی‌و پەیامە ئاسمانی‌یەی تیایاندامـاوەو تەنها عەقڵو مادده وەك سەنگی مەحەك بهێڵێتەوە ئەوا بارودۆخی خۆی دژوارتر و قەیرانەکەیشی توندتر دەبێت.

هەرەس هێنانی ئەزمونی ئەو چاکسازیە گەندەڵە شکست خواردوە مارکسیە ژیاری خۆراواو بناغەکانی دەخاتە قەیرانێکی توندترو گرفتو کێشەی گەورەترو ترسناکترەوە و بەرەو خاڵی سفرو بێ ئومێدی دەبیات.

هەروەها گرنگە جیاوازی بکەین لە نێوان بزافی مارکسی دا وەك ئایدۆلۆژیەتێکی هزری چاکسازی خۆراوایی شکست خواردوو لەگەڵ چەمکی دەست تێوەردانی دەوڵەت لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئابوری بە ئاکامێکی مژدەبەخشەوە.

دەست تێوەردانی دەوڵەت و کۆمەڵگە لە هەموبارودۆخ‌و قۆناغو بوارێکی تایبەتی هاوولاتی‌دا کارێکی مەترسی‌دارە، هەروەها واز لێ هێنانی هاوولاتیش لەلایەن دەوڵەت‌و کۆمەڵگەوە و دانەنانی چاودێرو ڕێنموکارێك بەسەریەوە بەشێوەیەك تەنها پشت بەخۆی‌و تواناو هێزی خۆی ببەستێت‌و گوێ نەداتە ڕێساکانی خستنەڕوو و داخوازی ئەوەش هەر کارێکی ترسناکە.

دەوڵەتانی ئاسیاو ئەفەریقیا ملکەچ بوون بۆ دەسەلاتی خۆراوا بە پێی ئەم چەمکە بۆماوەی چەندەها سەدە، هەر بەوشێوە خراپەش مانەوەو بگرە خراپتریش بوون، بەشێوەیەك کە بارودۆخی ڕوسیا و هەرێمەکانی سەر بەیەکێتی‌سۆڤیتی لە ڕووی توانا پیشەسازی و تەکنۆلۆژیەکەیەوە بەوە پێوانە ناکرێت.

ئەگەر ئەمە پەندێك بێت کەلەم قەیرانەوە وەربگیرێت، ئەوا پەندەکە ئەوەیە کەئیسلام بانگەشەی بۆ دەکات لە هاوسەنگکردنی ڕۆڵی تاکو کۆمەڵ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، کەوالاکردنی دەروازەیە بە ڕووی بواری توانای مرۆڤەکاندا بۆ پێشبڕکێ و دەست پێشخەری کردن و کارکردن و هەوڵدان بە مەبەستی پێشکەش کردنی خێرو بێر وەك بەجێگەیاندێکی

ئەركی سەرشان لە ژیاندا و ئاوەدان كردنەوەی زەوی و جێ نشینی كردن لە زەویدا، لە هەمان كاتدا پێویستە كۆمەڵیش بە گشتی چاودێری لاوازو بێ دەسەڵاتەكان بكاتو مافەكانیان بپارێزێ و گیانی برایەتی و دادەدان لە كۆمەڵگەدا دابین بكات.

ڕوسیاش لە ڕووی دەست تێوەردانی دەوڵەتەوە لە كاتێكدا ڕوسیا لە قۆناغی دواكەوتنی پیشەسازیدا دەژیا لە سەدەی نۆزدەهەمدا، سەركەوتوو بوو بۆبینانانی پێداویستیەكانی پیشەسازی و تەكنەلۆژیا، بەڵام بەچەمكێكی گشتی هەمووگیری وا كە زێدەڕەوی تێدا كرا، بەڕادەیەك لە ئاستی پێویست تێپەڕی كردو نرخی كەلوپەل و خۆراكی بەرزكردەوە ووڵاتەكەش لە ڕووی ئەو توانایەوە دواكەوت كە بە كۆمەڵ خەڵكی بەكاردەهێناو نەیتوانی ئەو پاڵنەرانە بخاتەگەڕ كەتاك دەجوڵێنێت و بەرەو دەست پێشخەری ئەركو مافەكانی هانی دەدات لەكاركردن و وردەكاری تیاكردندا، تا لە ئاكامدا سستمەكە لە ژێر فشاری ستەمو نادادی وبیرۆكراتیدا هەرەسی هێنا.

پەندی ڕاستەقینە لەم ڕووداوانەدا ئەوەیە كە تەنانەت تا ئێستاش شارستانێتی نوێ كۆڵەوارتر دەبێتو بەرەو دارمان دەچێت، پێویست بونی زووفریاكەوتنی ئێستا لە جاران پێویست ترە، لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان هەوڵەكانمان چەند هێندی جاران زیاتر بخەینەگەڕبۆ بەگەڕ خستنەوەی پەیامی ئیسلام بەهەمو هاوسەنگیو دەرچە یەكتاناسی و مەبەستەكانی جێنشینیی مرۆڤ لەزەویدا و تەواوكاری كردنی سەرچاوە مەعریفییەكان لە سروش وعەقڵ و فیترەتدا ، وە پاراستنی هاوسەنگی لە پێكهاتەی مرۆڤدا بە ڕۆح و ڕەوشت و مادەیەوە، وە لە ڕۆڵی تاكو كۆمەڵدا، بەم شێوەیە دەتوانین ئەركی سەرشانمان لەبەرانبەر ئیسلامدا ڕاپەڕێنین و موسڵمانان ڕاپەڕێنین و بەباشی بەرەو مرۆڤایەتیان بەرین‌و كۆڵەكەكانی شارستانەتێكی چاكسازی پڕ لە خێرو بێر دابنێین.

بنەچەی دەستپێكردن بەكارێكی لەو جۆرە دەبێت لە هزرێكی ڕاست و دروست و توانای داری واوە سەرچاوە بگرێت كە تەواكەربێت لەگەڵ بنیەی عەقیدەیی و و گیانی و ڕەوشتیی ڕاستەقینەدا بەبێئەوەی نەیار یان نەشیاو بێت، یان پشێوی دروست بكات.لەبەرئەوە هیچ ژیارو هیچ چاكسازییەك لە مێژوودا نیە كە لەسەر عەقیدەو بینیەیەكی شارستانێتی كاریگەر نەبوبێت بە شێوەیەك كەپشتی بەستبێت بەعەقڵ و هزرێكی زیندووی ڕۆشن‌و پرۆگرامێكی هاوسەنگو تۆكمە.

(خوایه هەقمان وەك هەق پێ نیشان بدە و وامان لێ بکە دوای بکەوین، وە ناهەقیشمان وەك ناهەق نیشان بدەو توانای لێ دوورکەوتنەوەیمان پێ ببەخشە).

لە کۆتـــاییدا لـــە خـــوای گـــەورە داواکـــارین کـــە ڕێنومایيمـــان بکـــات و یارمـــەتیمان بدات و سەرفرازمان بکات، بەڕاستی هەر ئەوخوایە بیسەر و وەرگـری نزاکانـە.

د. عبدالحميد أحمد ابوسليمان

کوالالمپور ـ مالیزیا

١٤١٢ك - ١٩٩١ز .

# تەنها ڕەسەنایەتی ئیسلامی هاوچەرخ چارەسەرە

**یەکەم ـ دەرچەی چارەسەر: ڕاپەڕین لە دەرچەی ڕەسەنایەتی‌یەوە:**

توێژەری بارودۆخی نەتەوەی ئیسلامی بەلایەوە گران نابێت گەر بیەوێت ئەو دواکەوتنە شارستانێتی‌و شپرزە سیاسی‌و نارەحەتیە مرۆیی‌یە ڕوون بکاتەوە کە بەسەر نەتەوەکەیدا هاتووە، سەرەڕای ئەو توانا‌و لێهاتنە مرۆیی و ماددی یەی تیایەتی هاوکات لەگەڵ بەهاو بنەما بەرزەکانیشدا.

ئەوەش کرۆکی ئەو قەیرانەیە کە نەتەوەی ئیسلامی تیایەتی لەوڵاتە جۆراو جۆرەکانی‌داو بەدرێژایی بوونی، ئەو بوونە پڕ لەدواکەوتویی یەی تا ئێستاش ئەو ویژدانە ئیسلامی یەی دووچاری شەکەتی کردووە، لەکاتێکدا ویژدانی نەتەوەیەکی بنیاتنەرو پێشەنگ دەنوێنێت، لەبەرئەوە شتێکی سروشتی‌یە کە نەتەوەی ئیسلامی بەرەو ڕابوون و چاکسازی و تازەگەری و ڕاپەڕین داچڵەکێت‌و هەنگاو بنێ.

بۆچارەسەرکردنی ئەو کەمتەرخەمی یەی دووچاری قەوارەی نەتەوەی ئیسلامیمان بوەتەوە بە چەشنێك کە مەرجی چارەسەری سەرکەوتوو مسۆگەر بکات، پێویستە هۆکارو پاڵنەرەکانی ئەو کەمتەرخەمی‌و لاوازی‌یە بزانین کە ڕووبەڕووی نەتەوەکەمان بوەتەوە، هەر لەسەرەتای مێژوویەوە تا هەڕەشەکردن لەبوونی، کە شارستانێتی خۆراوا بەرەنگاری بونیادی ژیانی نەتەوەی ئیسلامی وشێوازو هزرو دام‌و دەزگاکانی بوەتەوە.

هەربۆیە تێگەیشتن لەهۆیەکانی ئەو کەمتەرخەمیانە و ڕەگ‌و ڕیشەی ئەو هەرەس هێنانی شارستانێتی یەی کە نەتەوەکەمان لەم سەردەمەدا بە دەستیەوە دەناڵێنێت، دەبێت تێڕوانینێکی گشتی شیکاریانەی قووڵ و چڕوپڕمان هەبێت بۆ قەوارەی نەتەوەکەمان و ئەو هێڵ و ڕێبازەی ژیانی پێگەیشتووە و تا ئەمڕۆش ئێش و ژانەکانی قووڵتر دەبنەوە.

بێگومان چەندەها سەدەیە نەتەوەی ئیسلامی دادەڕوخێت‌و دەپوکێتەوە، تا بەتەواوەتی هەمووی ـ جگە لەچەند ناوچەیەکی چەقەن‌و ڕووتەن لەقووڵایی ئیسلامەتیدا ـ کەوتە ژێرسایەی دەسەڵات‌و ڕکێفی داگیرکەران و دەوڵەتانی ئەورووپی‌یەوە، لەوەش تاڵترو بەئازارتر ئەوەیە کە تا ئەمڕۆش نەتەوەی ئیسلامی

ناوچــه گــەلێك دەگرێتــەوە كــەجێی دەســت تێــوەردان و بــازاڕی بەرهەمــهێنانی پیشەســازی بیانی‌یــەو ســەرچاوەیەكی هــەرزانی كەرەســە ســەرەتایی و كرێكــارە ناهونەریەكانیشــە،و هــەموویان بوونەتــە گۆرەپــانێك بــۆ ململانــێ لــەنێوان هــێزە جیهانیــەكانداو، خۆیــان پــێ تــێر نــاكرێت و لــەڕووی بنەمازانســتی و تەكنــەلۆژی و پیشەســازی و كارامــەیی و دامەزراوەهونەریــە پێشــكەوتوانەو ســەرجەم بنــەماكانی هێزی خۆیی یەوە بێدەستن.

خۆنەگــەر بمانــەوێت بــەدوای هۆكارەكــانی ئــەم لاوازبــوون و تێكڕوخانــەی نەتەوەكــەماندا بگــەڕێین لــەناخی مێژووەــاندا، ئــەوا بۆمــان ڕوون دەبێتــەوە كــە لەســەرەتاوە هۆكارەكــان نــازانرێن، بــێ گومــان زۆربــەی دەوڵــەتان لەســەرەتای هــەرەس هێنانیشــی‌دا هێشتا پێوەی دیارنیــە، چونكــە لەســەر خــێرو بــێری ڕابــردووی خــۆی دەژی، هــەمان شــێوە بــۆ نەتــەوەی ئیســلامیش ڕاســتە، وەك دەبینــن ئیسلام لەســەرەتای هــاتنی‌دا خــۆی گــرت و دامــەزراو دیاردەكــانی ســامانداری و دەوڵەمــەندی و بیناســازی و توانــاداری تیــادا دەركــەوت، بــەلام دواتــر وردە.. وردە.. دیــاردەی لاواز بــوون و هــەژاری و داڕمــانی تیــا دەركــەوت، بــارودۆخی نەتــەوەش لــەباری هەڵمــەت بردنــەوە گۆڕا بۆ بــاری بــەرگری لــە خۆكردن،و دواتــر ســەركەوتنی دەســت درێژكــاران و ڕامــاڵین و داگیركــاری یــەكانیان لەبــەغداو قــودس و قورتوبــەو شــوێنەكانی تــر.

هــەروەها بــۆ تێگەیشــتنمان لــەهۆكارەكانی لاوازبــوون و تێكڕمــانی نەتەوەكــەمان گرنگــە جیــاوازی لــەنێوان هۆیــە ســەرەكی‌یەكانی ئــەو نەخۆشــیەمان - هــەرەس هێنانمــان - بكــەین لەگــەڵ ئــەو تەنینــەوەو پاشــهاتانەی لەئــەنجامی لێپیــس بوونــی نەخۆشــیەكەدا دووچارمــان بــووە، بۆنمونــە بوونــی جیــاوازی لەمەزهەبــەكانداو پڕوپاگــەندەكردنی لارو وێــری ناحــەزان دژی ئیســلام شــتێكی تازەنیــە، شــتی لــەو جۆرە هــەر لەكۆنــەوە هــەبووە، لــە (سەبەئیە)كانــەوە دەســت پێدەكــات تــا دەگاتــەوە بــە (قرامطــة)و (ئیســماعیلیەكان)و (نمــیری)و (دورزیــەكان)و چــەندانی تــر، هــەروەها بــەهائی و ئەحمــەدی و قادیانیــەكان و بــانگخوازانی نەتەوەگــەری و بــێ بڕوایــش لــەم ســەردەمەدا.

ئەمانــە هــەموویان دیــاردەی دەردو ئافاتــە بنچینەییەكانــە - كــەوەك ڕاســتیەكی مێژوویی - گەشــەیان كــردووە، هێــدی ..هێــدی.. قــەوارەی نەتەوەكــەیان داخورانــدوە لەبەرانبــەر بەربــەرەكانێی ئیمپراتۆریــەتی فــارس و ڕۆمەكانیشــدا ناچــاربووە كــە سەربازی هۆزو لادێنشینەكان بــدات بەدەســتەوە - كــە لەســەرەتادا بــوون ســەبارەت

بە ئاشنابیان بە ئیسلام - ئەوەش قەیرانێکی بۆ هێزو سوپای نەتەوە بەرپاکردووە - تاکو بە ئەقلیەتی هۆزایەتی لەبناغەی قەوارەی نەتەوە بداتو ئاشوبێکی گەورە بنێتەوە، بەرادەیەك کە خەلیفەی سێهەم (عوسمانی کوڕی عەففان) (خوا لێی رازی بێت) تیادا لەناوببرێتو دواتریش دەسەلاتی دەولەتی خەلافەت کۆتایی پێ بهێنرێت کە پایەختەکەی مەدینەی پایتەختی دەولەتی پێغەمبەر بوو(ﷺ)، پاشان دەولەتی ئەوتۆ پێك بێت لەژێر کاریگەری هۆزایەتیو رەگەزگێری کە تێکەلاو لەئیسلامو نەفامی بێت، کە هەرگیز بەراورد ناکرێت بە دەولەتی خەلیفە راشیدەکان، ئەگەرچی ئەمڕۆ گەلێك شت خرابێتە پاڵ ئەو خەلیفانە بە تایبەتیش سەبارەت بە دوارۆژگارەکانی دەسەلاتیان ، کە زۆر بەکەمی هەلەیەکیان لەسەر سەلمابێت ئەگەر بە تێڕوانینێکی زانستیانەی ووردبینی بۆ لایەنەوە تەماشا بکرێت.

جا هەرکات هەستمان بەو زامە قووڵە کرد کە تائەمڕۆ لەجەستەی نەتەوەکەمان دایە، ئیتر هەست بەترسناکی ئەو بارەناهەموارەش دەکەین کە تیایداینو بۆیشمان دەردەکەوێت تا چ رادەیەك پێویستمان بەهەوڵو تەقەلای دڵسۆزانەو ئەودەستگەرمانەی هەنوکەیی دەبێت،تاکو نەتەوەکەمان خۆی رزگار بکات لەو دارمانو کۆست کەوتنو کارەساتانەی رووبەڕووی هەرێمەکانی بوەتەوەو لەملی مەردو رۆڵەکانی نەتەوەکەمان ئالاوە.

خۆ ئەگەر لاوازبوونو هەرەسهێنانو کۆسپو ئێشو ژانو دەستەپاچەیی ئەمڕۆی نەتەوەی ئیسلامیمان کارێکی بابەتیانەی بەرچاوبێتو یەکدەنگی دڵسۆزو ژیرانی لەسەر بێت، بێگومان دەرچەکانی خۆرزگارکردنمان لەو بارودۆخەو لەو قەیرانە پرمەترسیو قووڵو یاخییە، بە خۆی و هۆکارەکانییەوە بە ئەندازەی ئەو قەیرانە روونو یەکدەنگی پێوە دیار نەبووەو وەك پێویست بەهێند نەگیراوە.

لەو قەیرانو دەردەی دووچاری جەستەی نەتەوەکەمان بوەتەوە کە لە مەزهەبگەرایی میللیو رەگەزگێری نەتەوایەتیو خوانەناسیو ئاشوبو ئیباحیەتی هاوچەرخدا خۆی دەنوێنێتو لەهەموو لایەکەوە زیان بە نەتەوەکەمان دەگەیەنێت لەوە تاڵتر ئەوەیە، لەلایەن هەندێ لەبانگخوازی بەناو چاکسازەوە بانگەشەیان بۆ دەکرێتو نەدەدرێن بەمەش دەردەکە گرانتر بوو، رووپامابییان لەبەردا دەکەن، هەموو هۆکارو فیڵو فشارو داوێك دەخەنەگەڕو دژی ئوممە بەکاری دەهێنن، وایش دەیانخەنەروو کە ئەوانە نیشانەی راستیو دەرچەی پێشکەوتنن، سەرەرای

ئەو هەموو ئاسەوارە ترسناکەی لەسەر نەتەوە بەدیاردەکەون و کاریگەرییان هەیە لەقوولکردنەوەی زامەکان و ڕێخۆشکردن بۆ هۆیەکانی لاوازی و دەردو زاڵبوونی دوژمناندا.

ئەو پرسیارەگرنگەی ئەمڕۆ دێتە ئاراوە ئەوەیە: دەرچەی ڕاست و دروست بۆ ڕزگاربوونی نەتەوەکان لەم قەیرانە چییە؟ ـ وەك من دەبینم، وەڵامی ڕاستەقینە ئەوەیە: پێویستە سەرەتا لەدیاریکردنی ئەو دەرچەو جێگرەوانەوە (بدائل) دەست پێ بکرێت کە خراونەڕوو لەبەرانبەر بزافی نەتەوەکامان، ئەم دەرچەی جێگرەوە هاوچەرخانەش کە خراونەتەڕوو، بۆ نەتەوەکەمان لەبنەڕەتدا لەسێ ئاراستەی سەرەکیدا گەڵاڵە دەکرێن، کە ئەمانەیە:

**یەکەم:** دەرچەی لاساییکردنەوەی بیانی، ناومان ناوە(ڕێگە چارەی بیانی)و بریتیە لەکۆمەڵە چارەسەرێکی هاوردەیی کە لەجەوهەردا لە ئەزمونی خۆراوایی و ماتریاڵی نوێوە سەرچاوەی گرتووە بە هەموو شکڵ و شێوەکانیەوە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ و عەلمانی و خوانەناسی (سەرمایەداری و مارکسایەتی).

**دووەم:** دەرچەی شوێن پێ هەلگرتنی مێژوویی، یان ((ڕێگە چارەی کلاسیکی مێژوویی ئیسلامی))، کەبریتیە لەکۆمەڵە چارەسەرێك جەوهەرو ناوەڕۆکیان لەقووڵایی مێژووەوە هەلگوازراوە، لەگەڵ لابردن و فەرامۆش کردنی ڕەهەندەکانی کات و شوێن و کاریگەریەکانیان.

**سێیەم:** دەرچەی ڕەسەنایەتی ئیسلامی، یان ئەوەی کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێت: (ڕێگە چارەی ئیسلامیی هاوچەرخ) کە بریتیە لە ڕێگە چارەیەکی ئەوتۆ کە ڕووبەڕووی تەحەددیاتی ئەم سەردەمە دەبێتەوەو پێشبڕکێی لەگەڵدا دەکات لەدەرچەیەکی ئیسلامییەوە.

ئەگەر نەتەوەو سەرکردەکانی ویستیان هەمان وزە و توانای ڕاستەقینەیان دەست بکەوێتەوە، ئەوا پێویستە لەسەریان ڕەچاوی ئەم چوار خاڵە بکەن:

**یەکەم:** دیاریکردنی دەرچەی ڕاست و دروست بۆ چارەسەرکردن .

**دووەم:** قەناعەتی تەواو بەو دەرچەیە.

**سێیەم:** هەنگاونانێکی چەسپاوانە بەرەو ئەو دەرچەیەو لەڕێی ڕێنماییەکانییەوە.

**چوارەم:** دابینکردنی هۆکارو ئامرازی کرداریی کاریگەر بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەو پەروەردەکردنی نەتەوە لەسەری.

زوربەی بیریارو نوسەرو سەرکردە کاتێك بۆ دەرچەی ڕاستو دروستی چارەسەر دەگەڕێن زیاتر ئەو ئامۆژگاریو ڕێنومایيانە هەڵدەبژێرن کە خۆیان بەلایانەوە دروستن، لایەنەکانی ڕێنومایيەکانیشیان یەکالا دەکەنەوە تاکو جەماوەر قەناعەتیان لەو بارەیەوە بۆ دروست ببێت، بەبێ ئەوەی لایەك بکەنەوە لەو جێگرەوەو چارەسەرە هەڵانەی تر کە کارگەرییان کەمەو لایەنی خراپەیان تێدا زیاترە، کە پێویست وایە ئەوانیش ئاماژەیان پێ بکرێتو لایەنی ناهەمواریشیان بخرێتە ڕوو، لەبەرئەوە ئەم شێوازە وا لەهەندێ لەچینو توێژەکانی جەماوەر دەکات کە لەسەر قەناعەتی خۆیان سووربن کە ئەو ڕێگە لابەلاییانە چارەسەرن، لەبەرئەوە چارەسەری ڕاستو دروست بەزەحمەت دەبینرێت، بە تایبەتیش لەکاتی بەراوردکردنی ئەم چارەسەرە پێشنیارکراوە نوێیەو چارەسەرە کلاسیکییەکەدا.

نوسەری ئەم کتێبە پێی وایە شێوازی کاریگەرترو شایستەتر بە شوێنکەوتنو ئەو شێوازە هەیە کە چارەسەریو جێ گروەکانی تریش دەگرێتەوەو ناوەڕۆكو جەوهەری هەڵەکانی باس دەکاتو هەروەها چارەسەری ڕاستەقینەش دەخاتە ڕوو، سەرەڕای گرتنەبەری هۆکارەکانیو قەناعەت کردن بە پێداویستیەکانی چارەسەرەکە.

لەبەرئەوەی لە نوسینی ئەم کتێبەشدا ئەم شێوازەیان دەگرینەبەر، چونکە پێم وایە ئەم ڕێگەیەیان سەرکەوتوترە بۆچارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەکەمان بە تایبەتیش لە کاتێکدا دووچاری بەرەنگاربونەوەی هزریو ڕۆشنبیری چروپڕ بوەتەوەو کاروانو هەنگاوکانی تاڕادەیەك خستوەتە بەر گەڕەلاوژەو شلۆقیيەوە، لەبەرئەوە نەتەوەکان لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستی بەوە هەیە ئەو هۆکارانە بزانێت کەوایکردوە چارەو دەرچەو هەڵەکان بێبەرهەم بن، پاشان بەنەخشەیەکی جێگیرەوە بەرەو ڕێگەچارەی ڕاستەقینەو پەسەندو سەرکەوتوو ـ بە پشتیوانی خوا ـ هەنگاو بنێت.

## ١- ڕێگە چارەی بیانی:

ئەم دەرچەیە تا ئێستاش لەگۆرەپانی جیهانی ئیسلامیدا زاڵە بەسەر پرۆسەی چاکسازیو ڕێکخستنەوەی باری کۆمەڵایەتیدا هەروەها زیاتر لە دووسەدەیە زاڵە بەسەر بۆچوونەکانی بزافی نەتەوەی ئیسلامیدا، هەرلەو کاتەوە

کە دەوڵەتی عوسمانی بۆی دەرکەوت کە جیهانی ئەوروپا و خۆرئاوا نیازی خراپە بەرانبەر بە موسڵمانانو دەوڵەتی ئیسلامی هێزیشی زیاترە، بۆیە وزەو سیستمەکەی کەوتە کشانەوە لەبەرانبەر ڕووبەڕووبونەوەی سیستمی خۆرئاوا و دەستکەوتەکانیدا.

لەبەر هەمان هۆیسەرەوە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی لەسەر دەستی سوڵتان سەلیمی سێهەمدا بەلێ ڕانەوە دەستی دایە خۆکۆکردنەوەو خۆتوندوتۆڵکردنەوە لەسەدەی هەژدەهەمی زایینییەوە ـ وەك لاساییکردنەوەیەکی ئەوروپییە بیانیەکان ـ پێشی وابوو کە ئەو لاساییکردنەوەیە تاکە ڕێگەیەتی بۆ خۆ بەهێزکردنەوەو بنیاتنانەوە.

قۆناغی ئەو بۆشاییو ون بوونەی نێو بازنەی ئاستی لاساییکردنەوەی بیانی دەستیکرد بە کۆششێك بۆ گواستنەوەی تواناو کارامەییو زانستی هونەری و تەکنیکی بیانیەکان، بەم پێیە دەوڵەت دەستیدایە بنیاتنانی یەکەم خوێندنگەی ئەندازەو زانستەکان، هەروەها یەکەم فێرگەی سەربازی نوێ بۆ مەشقو پێکهێنانی هێز گەلێك لەسەرشێوازی ئەوروپی، عوسمانیەکان ئەوەندە سووربون لەسەر بەجێهێنانی پلانەکەیان بۆ گێڕانەوەی تواناو پایەیان هەرچی تیمە سەربازییە کلاسیکیەکان هەبوون کەناوی (انکشاریە)یان لێ نرابوو لەناویان بردن چونکە دژ بە پلانە نوێخوازییەکەی دەوڵەت وەستا بوونو لەجێی ئەوان تیمی نوێیان لەسەر شێوازی ئەوروپی پێکهێنایەوە(١).

بێگومان وەك ڕاستییەکی مێژوویی پەیڕەوکردنی ئەو نەخشەو شێوازەی لەئەنجامی تێکەڵاوبوونی ئەوروپاو عوسمانیەکاندا هاتەکایەوە، بە قازانجی ئوممەو عوسمانیەکان تەواو نەبوو، تا بەربەرەکانێتی ئەوروپیە بیانیەکانی پێ بکەن، بەڵکو ئەو زانستو مەعریفە گوازراوەیەش چەکەرەی نەکردو بگرە زیاتر پاشەکشێی عوسمانیەکان بەرانبەر بیانیەکان بەردەوام بوو، هاوکات گەشەکردنی هێزو توانای ئەوروپاش درێژەی هەبوو.

دواتر عوسمانیەکان زیاتر ڕۆچوون لەلاساییکردنەوەی ئەوروپیەکانداو چەند خوێندکاریان ناردە ئەوروپا، ئیتر کە دەگەڕانەوە دەبونە تورکێکی ڕۆشنبیرکراو بەڕۆشنبیری ئەوروپا تاکو دەرچەیەکی نوێی لاساییکردنەوە بگرنەبەر، ئەوەش

---

(١) سەبارەت بە هەوڵە تورکیەکان بۆ تازەگەری و بەخۆرئاوایی بوون، بڕوانە ئەم کتێبە :
Gobb, H.A.R. and Eowen, Harold, Islamic Society and the West (U.K Oxford Univerisity Press, 1957 ) vol. One, part II, pp 159-61

بە پێویست زانینی چاکسازی سیاسیو کۆمەڵایەتی بوو لەسەر شێوازی ئەورووپا بە مەبەستی دابینکردنی ژینگەیەکی هزریو کۆمەڵایەتیو چاکسازیی زانستیو کارگێڕیو سەربازی وەك کەرەسەیەك بۆ سەرکەوتنی عوسمانیەکان، ئەگەر بیانەوێت ئیمپراتۆیەتەکەی جارانیان بنیات بنێنەوە، ئەم هزرو شێوازە کاری کردە سەرهەندێ کەسو گەلێك گۆڕانکاریو چاکسازی کۆمەڵایەتیو سیاسیو لیبراڵی لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەی زاییینیدا بەدوای خۆیدا هێنا، کە بەدەستوری (مەدحەت پاشا) دەناسرێت.

وەك ڕاستییەکی مێژوویی ئەوەش ڕوونو ئاشکرایە کە ئەم هەنگاوەش وەك هەنگاوە چاکسازیەکانی تری پێش خۆی بێ خێرو بێربوو، بوە هۆی ئەوەی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم جڵەوی دابو نەریتو یاساکانی بەڕێوەبردنی وڵات بگرێتە دەست خۆی، بەڵام ئاکامەکەی هەوڵدانێکی سەرنەکەوتوو بوو، ئەویش بوو بە پەڵەیەکی ڕەشیتر بە ناوچاوانی مێژووی ئیسلامی لەچوارچێوەی سیستمی دەوڵەتی عوسمانیدا هەوڵەکەش نزیك کردنەوەی زانایانو بانگخوازی بۆ زانکۆیەکی ئیسلامی بوو.

بەڵام بزافی چاکسازی لەسەر شێوازی بیانی بەرەوپێشەوە چوو، لەهەمان کاتدا ڕەهەندێکی تازەی وەرگرت ، کەبریتی بوو لەگرنگیدان بە نەعرەی نەتەوایەتی دەمارگیرانە لەسەر هەمان شێوازی بزاوتە ئەورووپیەکان وەك جوڵێنەرێکی وزەو تواناکانی بنیاتنان لەناو نەتەوەدا.

تورکەکانو سەرکردەکانی چاکسازیو لاساییکردنەوەی ئەورووپی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بانگەشەیان کرد بۆ بایەخی نەتەوایەتی، تورکەکانیش شتێکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد کە ناویان لێ نا (نەتەوەی گەلی تورانی) واتە: چەمکی نەتەوایەتی سەری هەڵداو، ئەو نەتەوە تورکانەش دەگرێتەوە کە بەزمانی تورکی دەدوێن بەدرێژایی ناوەڕاست و خۆراوای ئاسیا، ئیتر بزووتنەوەی (چاکسازیی نوێخوان) بەهێز بوو، لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا بۆ حوکمڕانی خۆی ئامادەکردو بە تەواوەتی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا زاڵ بوو لەژێرناوی (حیزبی ئیتحادو تەرەقی)دا، دواتر کۆتاییان بە دەسەڵاتداری سوڵتان عبدالحمیدی دووەم هێناو لەسەرحوکم لایاندا.

ئەو هەوڵانە بەوە کۆتاییان هات کە تورکەکانو دەوڵەتی عوسمانیش لە جەنگێکی بێ وێنە لەمێژوودا تێك شکانو کرانە دەرەوە، تەنانەت جەرگەی خاکی

(ئەناضول) یش داگیرکرا، ئەوەش لەلایەن یۆنانیەکانەوە کە چەندەها سەدەی پێشتر بەزۆر دەستەو چاو لەبەری خۆیان دەزانین.

لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵە چاکسازیەکان بە ڕوانگەو پێودانگی بیانیانە هەر بەردەوام بوو، بەلام بە ئاوات و تەمای دوورترو فراوانتر بە مەبەستی لەپێشە دەرهێنانی خەلافەتی عوسمانی لەژێر سەرپەرشتی و دەسەڵاتی دامەزرێنەری کۆماری تورکیا ((مصطفى کمال ئەتاتورك)) و ئەو هاوەڵە سەربازییانەی کە بەوپەڕی تیژرو تەسەلیەوە لاسایی دەسەڵاتی ئەوروپایان دەکردەوە، دەستیان دایە گۆڕانکاری سەرتاسەری و سەرومڕ لەسەر شێوازی پەیرەکردنی ئەوروپی، بەمەش ڕۆڵی ئیسلام و ڕۆشنبیری ئیسلامی لەکۆمەڵگەدا کۆتایی پێ هات و چەمکی عەلمانیە کۆمەڵایەتییەکانی ئەوروپای مەسیحی خرایە گەڕو جیاکردنەوەی ئاینی ئیسلام لەدەوڵەت و هەموو سستەم و دام و دەزگاو پەیوەندییە عەلمانییە کۆمەڵایەتییەکان هاتەکایەوە. بەشێوەیەکی زۆر توندوو دڵ ڕەقانە، بەمەش هەموو تەشریعە ئیسلامییەکان هەڵوەشێنرانەوەو بە یەکجار دامو دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانی لابران و یاسای دەوڵەت لەپێشکەوتوترین دەوڵەتی ئەوسای ئەوروپاوە (سویسرا) هێنراو لەجێگەی یاسای ئیسلامی دانراو کاری پێ کرا. هەروەها پیتە عەرەبیەکانیشیان وەلاخست و لەشوێنی ئەوان پیتە لاتینییەکانیان بەکارهێنا تاکو هیچ دەرفەتێك نەمێنێتەوە بۆ کارکردنە سەرنەوەکانی داهاتوو، گەلیشیان بەزۆر پابەندکرد بە لەبەرکردنی پۆشاکی ئەوروپی و ئافرەتانیان ناچارکردن کە پۆشاکی شەرعی لابەرن و سەرپۆش فڕێ بدەن، تەنانەت دەستیان وەردایە ناو بانگدان و بەجێهێنانی شەعائیرە پەرستشیەکانیش، بەڕادەیەك ئەگەر کەسێك بیەوێت ئەوانە جێ بەجێ بکات دەبوو بەزمانی تورکی ئەنجامیان بدات.

حوکمرانی ئەتاتورك کۆتایی پێ نەهات تا دەوڵەتی بنیات نا لەسەر چەمکی دەست تێوەردان لەچۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری ئاراستەکردنی دامو دەزگا کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان، تەنانەت دامو دەزگا دارایی و ئابوریە گرنگەکانیشی دەست بەسەرا گرت وەك بانك و کۆمپانیاکانی دابینکردنی ژیان (شرکات التامین) وە شتێکی ئاشکرایە نەتەوەی تورکی پاش ئەو هەموو شتانە ـ وەك زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی لە دوای ئەوەی توشی هاتن ـ بارودۆخیان باش نەبوو تورکیاش بەهەمان شێوە لەهەرەس هێناندا بەردەوام بوو هەرچەندە هەموو قۆناغەکانی ڕێگەچارەی لاساییکردنەوەی بیانی گرتبووەبەر وەك هێنانە ئاراوەی زانستە

سروشــتی‌یەکان و تەکنــەلۆژیای ســەربازی‌و پێکــهێنانی هــێزی چــەکداری‌و نــوێ گــەرایی‌کردن لەبەڕێوەبەرایــەتی گشــتی‌داو بنیاتنــانی چــەمکی لیــبراڵی‌و وەرگــێڕانی ڕۆشنبیری خۆراوایــی بۆســەر زمــانی تورکــی‌و بەگەڕخســتنی گۆڕانکاری‌یــە سیاســی‌و دەســتوری‌یەکان‌و پــەیڕەوی‌کردنی چــەمکی نەتەوەگــەری و نیشــتمان پــەروەریتی، هــەروەها پــەیڕەوکردنی چــەمکی عەلمانیــەت و بــێ دینــی‌و پــەیڕەو کردنــی یاســاو سســتمە ئەوروپی‌یــەکان‌و گەشــەپێدانی دامــەزراوە دەوڵەتی‌یــەکان بەبەبەســتی زاڵبــوون بەســەردام‌و دەزگــا کۆمەڵایــەتی‌و ئــابوری‌و دارایی‌کــاندا. دەرئــەنجامی ئــەم لاساییکردنەوەیش تەنها زیــاتر لاوازبونــی تورکیــاو دارمــانی بــوو، تــا لــە ئاکــامدا بــە تــەواوەتی کەوتــە ژێردەســەڵاتی خــۆراوا، جەنــەراڵ (عیســمەت ئینۆنــۆ)ی - جێگــری (کــەمال ئــەتاتورك)و هــاوڕێی کاروانەکــەی ناچــاربو دان بــەم شکســتی‌یە سیاســی‌یەدا بنێت‌و مل بۆدەسەڵاتی باڵای خۆراوا کەچ بکات - وەدەســەڵاتی تاکــە حــیزب (حزبــی کۆمــاری)و زاڵبوونــی دەوڵــەت‌و حــزب بەســەر هــەمو چارەنوســەکانی تورکیــادا هــەڵ بوەشــێنێتەوە، و ناچــاربوو بگەڕێتــەوە بــۆ خولێکــی نــوێی چــەندجار دوبــارەکراوەی لیبراڵی‌یــەتی سیاســی و هــەڵبژاردنێکی تــازە ئــەنجام بــدرێ کــە لــەئاکامدا پــارتی دیموکراتــی پێش مونــافس بــە ســەرۆکایەتی (عــەدنان مــەندەریس) ســەربکەوێ.

ئــەم هــەموو هەوڵانــە نەبونــە هــۆی ڕزگــارکردنی تورکیــا لــەو قەیرانــەی کــە تیــایدا بــوو، دەســەڵات‌و تواناکــانی پێشوشــی دەســت نەکەوتــەوە، لەگــەڵ ئــەو هــەموو ســوربونە بەردەوامەشــیان لەپابــەندبونیان بەڕێگــەچارەی لاســاییکردنەوەی بیــانی بەوپــەڕی فراوانیشــەوە، گــەرچی مــاوەی زیــاتر لــە دووســەدەی خایــاند بــەڵام ئاکامەکــەی ســات لــەدوای سات بــەرەو کــاولکردنی تورکیــا و نائــارام بــون دەڕۆیشــت، تــا گەیشتە ئــەو ڕادەیــەی (مــەندەریس) لەســێدارەدرا (١٣٨١ك-١٩٦١ز) لەیەکــەم ئەڵقــەی زنجیرەی کودەتــا ســەربازی‌یەکانی تورکیــاو زاڵبوونــی بەســەر حوکمڕانــی‌دا بەشێوەیەکی ستەمکارانەی ڕوخێنەرانــەی پــڕ لــەنائومێدی، بــاری تورکیــاش هــەروەك خــۆی (مرۆڤێکــی نــەخۆش) درێــژەی کێشــاو ڕۆژ لــەدوای ڕۆژ دەردو نەخۆشــی‌یەکانی زیــادی دەکــردو لەپاشــکۆیەتی خۆراواشــدا بــەلادا دەهــات بــەبێ ئــەوەی ئومێــدی چاکبوونــەوەو چارەســەری لێ بکرێــت.

ئەگــەر بــەم تێڕوانینــە گشــتی‌یەوە بڕوانینــە ئــەزمونی عەرەبی‌یانــەی میســری لەســەردەمی (محمــد علــی)دا لەســەرەتای ســەدەی (١٨)هــەمی زاینــی(١٣)هــەمی کۆچــی‌دا، تــا ئــەمڕۆ و بگــرە دواتریــش لەئەزمونــەکانی وڵاتــانی عــەرەبی و ئیســلامی

ئاسیاو ئەفریقیادا، شتێکمان بەرچاو ناکەوێ کە تازە بێتو خراپێتەسەر ئەزموونی تورکیاو ئاسەوارە ترسناکەکانی، لەهەموو بوارەکاندا حاڵی گەلو وڵاتانی لاساییکەرەوەی بیانی ئەگەر لەهی تورکیا خراپتر نەبێ باشتر نییە.

تا ئێستا لەم سەدەیەشدا جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی نەخۆشو دارماوە، دوکەلکێشی شارستانییەتی نێوان جیهانی ئیسلامیو وڵاتە پێشکەوتوەکانیتر فراوانتر دەبێتەوە، بەبێ ئەوەی لەبەرژەوەندی جیهانی ئیسلامیدا بێت لەکاتێکدا ئەزموونی لاساییکردنەوەی بیانی لە ئارادایە.

نهێنی شکستهێنانی چارەسەر لەدەرچەی لاساییکردنەوەی بیانیدا قورس نییەو بەئاسانی لێی تێدەگەینو هۆکارە بابەتییەکانیشی روونو ئاشکرایە، چونکە نەتەوەکان وەك بوونەوەرێکی مرۆیی زیندو زۆر ئاڵۆزترن لەتاکەکان لەڕووی پێکهاتنو بەزەحمەت بەرەوپێش بردنی بزواندنیان بە مەبەستی بنیاتنانو زاڵبوون بەسەر کانگەو بۆسەی دەردەکاندا.

هەر نەتەوەیەك پێکهاتەی تایبەتی خۆی هەیە لەڕەوشتو بەهاو عەقیدەیو دابونەریتو چەمکەکانیدا لەهەمان کاتدا پاڵنەری تایبەتیو کەسێتیو مێژووی سەربەخۆی خۆی هەیە کە ئەمەش وەك پێکهاتنی مرۆڤەکانە لەسەر ئاستی تاکەکەسی، جائەگەر مامەڵەکردن لەگەڵ هەریەك لەو نەتەوانە بەپێی چەمکی ئەو لایەنانە نەبێت کە باسمان لێکردنو لە ڕوانگەی ئەوپێکهاتەو پاڵنەرانەوە نەبێت، ئەوا زۆر بەزەحمەت ئەو نەتەوەیە دەخرێتە جموجوڵ یان سەرچاوەکانی هێزو ڕەنج و بنیاتنانی دەبزوێنرێت.

مەرج نییە هەرشتێك بوونەوەرێکی مرۆیی ببزوێنێ بتوانێ بوونەوەرێکی مرۆیی تریش ببزوێنێ، هەمان شێوە بۆ نەتەوەکانیش ڕاستە، هەموو نەتەوەیەکیش پاڵنەرو هۆکاری بەرایی خۆی هەیە کە لەسەر ئەو بنچینەیە دەبزوێت، ئەوە هەڵەیە کە هۆکارو پاڵنەرەکانی نەزانینو سەرکوێرانە لاسایی خەڵکی بکەینەوە لەنەخشەکانی کارو چاکسازیدا بەبێ ئەوەی دەرك بە تایبەتمەندییەکانی ئەو نەتەوەیە بکەین، سەرەڕای ئەو خەسڵەتو جیاوازییانەی کە لەنێوان خودی نەتەوەکانیشدا هەیە، گەر وانەبێ ئەوا چارەنوسی ئایندەی نەتەوەی ئیسلامیمان لەڕۆژگاری ڕابردووی باشترو پڕ لەخێروبێرتر نابێت کە چەندین سەدەیە سەرقاڵی لاساییکردنەوەیە.

**چەند نمونەیەك لـە واقعـەوە :**

لـەو نمونـە سـاكارانەی دەیهێنینـەوە كاریگـەری دامـەزراوی بـانكی خۆراوایـە كـە موسڵمانان وەك لاسـاییكردنەوەیەك بنیاتیـان نـا، كـاتێك ئـەم دامـەزراوە خۆراواییـە لـەخاكی خۆیـدا دامـەزراو گەشـەی كـرد وەلامـی پێداویسـتیو كاروبـاری ئـابوریو بازرگـانی یـەكانی وڵاتـانی خـۆراوای دەدایـەوە لـەوڵاتی خۆیـدا، بـەلام هـەمان دامـەزراو كـاتێك بـۆ خـاكی ئیسـلامی گواسـترایەوە لـە سـەرهەمان شـێوەی خـۆراوای خـۆی ئـەوا بـەهۆی جیـاوازی عـەقیدەییو رەوشـتی موسـڵمانانەوە بـە بـەراورد لەگـەڵ خۆراوای یـەكان ئاسـەوارێكی پـڕ لـە زیـانی ناهـەمواری لێكەوتـەوە لـەو ژینگـە تازەیـەوە لـەنێو نەتـەوەی ئیسـلامیدا،و بـوە هـۆی زیـاتر وروژاندنـی ململانـێو ناهـەمواریو لێكـترازاندنی تاكـەكانی كۆمەڵگـەی ئیسـلامی،و زیـانێكی گەورەشـی بەقـەوارەی نەتـەوە گـەیاند لـەڕووی وەدەرخسـتنی بـەفیڕۆدانی وزەو تواناكـانیو سسـتكردنیو كپكردنـەوەی ورەكـەیدا، ڕێگەشـی ئاسـان كـرد بـۆ زاڵبوونـی بیـانی بەسـەر تواناكـانی نەتـەوەی ئیسـلامیو چارەنوسـەكەیدا لـەبری ئـەوەی كـە یاریدەدەرێك بێ بۆ بنیاتنانو گەشەپێدانی ئـابوری.

هـۆی سـەرەكی شكسـت هێنـانی بـانكی خۆراوایـی لەخزمـەتكردنی كۆمەڵگـەی ئیسـلامیداو سـەركەوتنی لەكۆمەڵگـەی خـۆراوایدا دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی كـە كۆمەڵگـەی ئیسـلامی لەدەرچەیـەكی تایبـەتی ئیسـلام بـەهای پـیرۆزی مرۆڤـەوە لـەبورای ئـابوریدا دەڕوانێتـە ئـادەمیزاد، بـەڵكو ئیسـلام مرۆڤـی موسـڵمانو نەتـەوەی ئیسـلامی لـەبواری ئـابوریدا لەبـەردەم دوو جـۆر خیـاردا سەرپشـك كـردووە، یەكـەمیان: خۆدەوڵەمـەند كـردنو بەسـوو سـەلەمەوەو بـەكارهێنانی لەبانكـەكاندا كـە ئاكامەكـەی دەبێتـە هـۆی سزاو ئازار لەڕۆژی دوایـدا. دووەمیشـان : هـەژاریو دەسـت كورتـی موسڵمان لـە دونیـادا كاتـێ پابـەند دەبـێ بـە شـەریعەتی ئیسـلامو ڕەوشـتی بـەها پیرۆزەكانییەوەو قبـوڵ ناكـات مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو بانكانـەدا بكـات كـە سـوو سەلەمەیان تیـا بـەكار دەهێنرێ بەرامبـەر بـە قـازانجو دەسـت كـەوتو سـەرفرازی ڕۆژی دوایـی.

ویژدانـی مرۆڤـی موسـڵمان بـەردەوام بەشـوێن ئاوەدانكردنـەوەو كـاری چـاكو بـەجێدا دەگـەڕێ لـەم دنیایـەداو بـەدوای پاداشـتو دەسـتكەوتو ڕەزامـەندی پـەروەردگارو ئاسـودەییدا دەگـەڕێ لـە قیامـەتدا. ئـەم جـۆرە ویژدانـەش دووڕوویـی

قبوڵ ناکات هەرگیز شتێك ناکات کەمایەی خێروبێر بێت بۆ دنیا، بەڵام بۆ دوارۆژی وانەبێت، دووشتی دژوار لەیەك ویژدانی زیندوودا کۆنابێتەوە.

ئەمڕۆ دامو دەزگاکانی بانکە ئیسلامییەکان وەك هەوڵدانێك بەکاردێن لەڕێگەچارەیەکی ئیسلامیدا وەك بەدیلێك بۆ ئەو جۆرە بانکانە ئەگەرچی کەمیش بێ، بەڵام ئومێد بەخش بێ لەدابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانی ئیسلامیانەی هاوچەرخ کە خزمەتگوزاری دارایی‌و ئابوری دەگرێتەوە بەشێوەیەك لەگەڵ دەروون‌و هزرو دڵی موسڵماندا شیاو بێ‌و پشکی حەرامی تێ نەکەوێ.

**نەتەوەو ڕێگەچارەی هاوردە:**

ڕێگەچارەی بیانی هێنراو بۆ وڵاتانی ئیسلامی لەڕووی لەیەك چونەوە وەك ڕێگە چارەیەکی شانۆگەرییانە وایە، نەتەوە وەك چاویلکەیەك لێدەکا لەسەر شانۆ کە هیچ ڕۆڵێکی لەو ڕوداوو باس و خواستانەی سەر شانۆکەدا نییە بەڵکو تەنها کات کوشتن‌و نواندنێکە کە ڕەنگدانەوەی هیچ ڕاستییەك نییە، تەنها ئەرکی ئەوەیە هەڵوێستێکی کارلێکەرانەی ناهەموار وەربگرێت لە فیکەو چەپڵە لێدان‌و هاتوهاوار کاتێك تیپە شانۆییەکە دیمەنێکی کاریگەر نمایش دەکەن، ئەمەش لە ڕاستیدا مانای ئەوە دەگەیەنێ کە نەتەوە هیچ پەیوەندییەکی نییە بەو شتانەی لە شانۆگەری یەکەدا ڕوودەدەن لەنێوان ئەکتەرەکاندا لەسەرکردە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان‌و، لەبەرئەوە هەرکاتێ هەر شانۆگەری یەك تەواوبوو سەرکردەیەك ڕووخاو دەورەکەی کۆتایی هات کۆمەڵی خەڵکەکە هەڵدەستن‌و دەچنە سەرباروو شوێنی خۆیان هەروەك هیچ شتێ ڕووی نەدابێ ، تا شانۆگەرییەکی ترو، کۆمیدیایەکی نوێ و سەرکردایەتییەکی تازەو خولێکی تری ڕێگەچارەی لاساییکردنەوەی بیانی دەست پێدەکاتەوە.

جیاوازی لەنێوان هزری نەتەوە پێشکەوتوەکان‌و سەرکردەو سستەمەکانیان لەخاکی خۆیانداو سەرچاوەکانیاندا لەگەڵ هزری نەتەوە دواکەوتوەکان و سیستم و سەرکردایەتییەکانیاندا ئەوەیە کە نەتەوە پێشکەوتوەکان هزرو سستم و ڕێگەچارەو سەرکردایەتی ڕاستەقینەی وایان هەیە کە لەخودی قەوارەی نەتەوەکەو نەفسییەت‌و بەهاو پێداویستییەکانیانەوە هەڵقوڵاوە، وە لەهزرو سیاسەت و ڕێنماییەکدا خۆی دەنوێنێ کە لەسەرکردەکان‌و کۆمەڵتیم گەلێك بۆ

کاری بنیاتنان‌و گەیشتن بەردەوامی کاروانی ئامانجدارانە پێك بێت لەژیانی نەتەوەکانیاندا.

ئەم چەمکە ریشەییەشە کە راڤەی راستمان بۆ دەخاتەروو سەبارەت بە شتێك کە ناومان لێ ناوە (گاڵتەجاڕی پیاوانی سیاسی‌و سیاسەت) لە جیهانی ئیسلامیدا بە تایبەتی‌و بە گشتیش پێی دەوترێت (جیهانی دوا کەوتوو)، وە جیاوازیشی لەگەڵ سروشتی ئەو سیاسەت‌و حوکمڕانی‌و بەڕێوەبردنەی کە نەتەوە بەتواناکان (پێشکەوتوەکان) پەیڕەوی دەکەن هەوەرها ڕەنگدانەوەی ئەو پەیوەندی‌یە ئاوێتەیەیە کە کۆمەڵگەو کارو بزاوتێك دەگرێتەوە هەڵقوولاوی واقعەو مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و کاری تێ دەکات‌و دەشکەوێتە ژێر کاریگەرییەکانیەوە.

پێویستە لەسەرمان لەو ڕەهەندە هزری و ڕۆشنبیری‌یە تێبگەین کە لەڕێگەچارەی هاوردەکراوی بیانی‌دا هەیە بۆئەوەی چیتر کاتمان بەفیڕۆ نەدەین لەلاساییکردنەوەو پاشکۆیەتی‌کرندا چیتر ئێش‌و ژان و ناڕەحەتی‌و پەشیمانی دووچاری خۆمان‌و نەتەوەکەمان نەکەین.

ئەوە بێویژدانیەو نادادی‌یە دەرهەق بە نەتەوەکەمان کەبەردەوام سەرکردە فیکری‌و سیاسی‌یە نەتەوەیی‌و مارکسی‌یە عەلمانیە بەخۆراوای کراوەکانمان بەئاراستەی ڕێگەیەکی داخراو بمانبەن پاش ئەوەی سەدەها ساڵیان لەهەوڵی سەرنەکەوتوودا بەفیڕۆدا، وەك زمانحاڵی خۆیان‌و هزرو دام‌و دەزگاکانیان دوای هەموو سەرنەکەوتن‌و شکست خواردن‌و کارەساتێك لەوەی پێشووتر سەخت‌و ناهەموارترە ووشە شاعیری گاڵتەجاڕ بێت کە دەڵێ : (بەشتێك تیمارم بکەن کە هەر خۆی دەردە) واتە حاڵی هزری سەرکردە عەلمانی‌یە بە خۆراوایی‌کراوەکان لەجیهانی ئیسلامیدا بەهەموو جۆرەکانی‌یەوە، چ نەتەوەیی چ مارکسی ـ تەنها بەشێك لەهزرێکی کەم دەنوێنن کە هیچ بەڵگەیەکی سەراسەری سەروو بەخۆشیان بەدەستەوە نییە کە لەو بازنە بەتاڵو ڕێگە فراوانە ڕزگاریان بکات کە تێی کەوتون تا ببێتە مایەی ئاراستەکردنی تێڕوانین‌و سەرچاوەهزری‌یە کانیان.

لەسەر بیریارە موسڵمانەکان‌و سەرکردە موسڵمانە پێگەیشتووە جددی کارەکان پێویستە کە ڕێگەیەکی کراوەی ڕاست‌و دروست بگرنە بەر نەگەرچی ئەو ڕێگەیەش لەسەرەتادا سەخت‌و هەڵدێر بێ، هەروەها دەبێ دڵنیابن کە ڕێگەچارەی ڕاستەقینە دەبێت لەئاین‌و خاك‌و مێژوو پاڵنەرەکانی خۆیانەوە هەڵ بگوازن، هەر بەوانەش ململانێی سەردەم بکەن کە ئەوەش ڕەسەنایەتی خۆیانە، ئەگینا ئەو

ئەزمونە تاڵو شكستانەی كە جیهانی ئیسلامی لەسەدەكانی ڕابردیوودا بەدەستییەوە دەینالآند هێندەی قنچكە پیازێكیش نابێ لەچاو ئەو كێشەو گرفتە تازانەی وا چاوەڕوان دەكرێت لەئایندەدا ڕووبەڕووی جیهانی ئیسلامی ببێتەوە.

وە پێویستە هەمو سەركردە موسڵمانەكان بەجیاوازی بیروڕایانەوە كە جەماوەری موسڵمانو سۆزی موسڵمانیشیان لەگەڵدا بێ - خەون بە خۆڕزگاركردنو پێشكەوتن و هێزو عیززەتی جارانیانەوە ببینین، ئەگینا چارەنوسیان ئەگەر هۆكارو شێوازو پرۆگرامی بیركردنەوە بەوردی گۆڕانكاری یان بەسەردا نەهێنرێتو ئامانجەكانیش بەوردی دەستنیشان نەكرێن دروێنەیەكی زۆر تفتو تاڵ ترە لەوەی كە تا ئەمرۆ نەتەوەی ئیسلامی چەشتویەتی.

پێویستە بیریارو سەركردە كۆمەڵایەتییەكانی نەتەوە پێكەوە بەدوای ڕێگەچارەی ڕەسەنو بەدیلی ڕاستەقینەدا بگەڕێن، و ئامانجو سەرچاوەو پێوەرە ڕاستەقینەكانی نەتەوەكەیان بەهەند بگرنو هەوڵبدەن لەهزری ڕۆڵەكانی نەتەوەدا بیچێننو هەروەها لەنێو كاروباری ڕۆژانەو دامو دەزگاكانیاندا ڕەنگ بداتەوە.

**٢ـ چارەسەری كلاسیكی مێژوویی:**

نەتەوەی ئیسلامی چەندین سەدە بەرلەئێستا هەوڵی داوە كە ئەم ڕێگەچارەیە لەدەرچە كلاسیكیەكەیەوە بگرێتەبەر كە بەشێوە هەرەمەكییەكەی ڕەهەندە شوێنو كاتیەكانی قەوارەی نەتەوەو كاروانە مێژووییەكەی بێ نەخشەو مەبەستانە ڕەتكردوەتەوە، ئەوەش لەسەردەمە دواییەكاندا كشانەدواوەیەكی بەردەوام دەنوێنێ لەئاستی ململانێكانی ژیانی هاوچەرخانەو هێزی دوژمنكارانەی هەڵمەت بەر بۆسەر عەقڵو هزری نەتەوەی ئیسلامی، ڕوونو ئاشكرایشە كە ئەم ڕێگەچارەیە ئەو ئەنجامەی بەدەستەوە نەدا كە مەبەست بوو، بۆ ڕزگاركردنی نەتەوە، ئەگینا باروداۆخی نەتەوە بەم جۆرە هەرەسی نەدەهێناو دوژمنانیش نەیاندەتوانی ئەم قەیرانە دروست بكەنو هێندەش نەتەوەكەمان ئازاری نەدەچێشت بەو نەگبەتیو نەهامەتیانەی دووچاری بونەتەوە.

هەموو ئەو كۆسپانەش كە بەرەنگاری نەتەوەكەمان بونەتەوەو بوونەتە ڕێگر لەپەیدابوونی شوێنەواری پێویست بۆ كاریگەریەكانی ڕێگەچارەی كلاسیكی بۆ واقیعی مێژوویی نابنە بیانووی پێویست چونكە لەسەر هەر ڕێگەچارەیەكی ڕاستو دروست پێویستە كە ئەو كۆسپانە سەر حساب بكاتو بەشێوەیەكی

سەرکەوتوو ڕووبەڕوویان بێتەوە لەهەنگاوەکانی بەرەو سەرکەوتن چوونیدا، چونکە لەڕاستیدا ئەم کۆسپانە بەشێکن لەو کێشەیەی مەبەستمانە چارەسەری بکەین و لێی جیانابنەوە.

چارەسەری کلاسیکییانەی مێژوویی کاروبارەکان ئاسان دەکات، کاتێك ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لەسەرەوە بە جەخت کردن لەسەر سەلامەتی دەرچەکەی و بە هەڵەزانینی هەموو ئەو باروودۆخ و کە وەڵامی پێداویستی و داخوازییەکان نادەنەوە یان حەزناکەن یان ناتوانن، ببنە شایەت بۆ بەخشش و بەرهەمەکانی.

ئەگەر هەر چارەسەرێك کە دەگیرێتە بەر یاریدەدانی دوژمنانی لەلابردنی کۆسپەکانی سەرە ڕێیدا بەمەرج دانا بێت بۆ ئاسانکردنی بەجێهێنان و سەرکەوتن، ناکرێت بە چارەسەرێکی نمونەیی لەقەڵەم بدرێت، چونکە بەم شێوەیە دەبێتە بەشێك لەو ئاڵۆزی و کێشەیەی کە دەمانەوێت بەرەنگاری ببینەوەو خۆمانی لێ ڕزگار بکەین.

ئەو چارەسەرە کلاسیکییە مێژووی یەی کە هزرو ئەندێشەی نەتەوەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن گرتبووە، کە بریتی بوو لەپێ داگرتن لەسەر دووبارەکردنەوەی هەمان وێنەی ماددیەتی مێژوویی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەچاخی زێڕینیدا، بەڵام بەداخەوە بێ گوێ دانە ئەو هۆشیاری و دەلالەتە مێژوویی و گۆڕانکارییە ماددیانەی کە ڕوویاندا، ڕاڤەی شکستهێنانی ئەم ڕێگەچارەیە لەم دەرچەیەوە دەکات لەوەی نەتەوە لەو باروودۆخەی ڕزگار بکرێت و زاڵ بێت بەسەر ئەو کۆسپانەی کە دێتە ڕێی ئەگەر چی نەتەوەکەش بە ئایینی ئیسلام پابەندبوەو ڕەگ و ریشەی ئیسلامیش بە ناخی مێژوویدا چوەتە خوارەوە، هەروەها ئەم چارەسەریە تەفسیری کشانەوەی فیقهی مەزهەبگەرایی کلاسیکیش لەبوارە سیاسییەجیاوازەکان و مامەڵە نوێکانیش دەکات بەڕادەیەك کە هێندە تەنگەبەرکرایەوە تەنها لەبازنەی دروشمە پەرستشییەکان و کاروبارە کەسێتییەکاندا خۆی ببینێتەوە لەپانتایی سەراسەری جیهانی ئیسلامیدا.

ڕەنگە لەو نمونانەی کە هەڵەکانی ئەم دەرچەیە بەرجەستە دەکەن لە نێو گەورە ناودارانی نوێی چاکسازی ئیسلامیدا بانگەشەکەی (جەمال الدین ئەفغانی)یە کاتێك بە هەڵەداچوو لەتێگەیشتنی پەیوەندییەکانی سستمی کۆمەڵایەتی و سیاسی سەردەمی جێنشینە ڕاشدییەکاندا بەتایبەتی لەکاتێکدا

لەپوختەی بۆچوونەکەیدا کە پێچەوانە بوو بووەوە جەختی لەسەرئەوە دەکردەوە نەتەوەی ئیسلامی بە (ستەمکارێکی دادپەروەر) نەبێت چاك نابێت!

ڕوون و ئاشکرایشە لەسیاسەت و حومکڕانیدا ستەمکاری دژی دادپەروەرییە، ئەو ڕاستییەش یەکەمجار لەسەرەتای دابەزینی قورئانی پیرۆزەوە خراوەتەڕوو کەدەفەرموێت:﴿ کلا إنَّ الإنسانَ ليطغى ۝ أن رآه استغنى﴾ قلم: ٦-٧، واتە: (نەخێر مرۆڤ دەستدرێژ کارە کاتێ خۆی لەدەوڵەمەندی و بێ باکیدا دەبینێتەوە)، یان دەفەرموێت:﴿ وشاورهم في الأمر﴾ الاعراف: ١٥٩، واتە: (ئەی محمد ڕاوێژ بە یاوەران و موسڵمانانی دەوروبەرت بکە لەکاروبارە کانتاندا). هەروەها لە وەصفی موسڵماناندا دەفەرموێ ﴿ و أمرهم شورى بينهم ﴾ الشورى: ٣٨، واتە: (کاروباری ناو خۆیان بەڕاوێژ دەکەن) .

یەکەم شتێك کە پێویستە بایەخی پێ بدەین و لای لێ بکەینەوە لەو باس و خواسانەی پەیوەندی بە چەمکی ئەم دیاردە کلاسیکییە مێژووییەوە هەیە، ئەوەیە کە ڕەگ و ڕیشەی گەشەکردنی لەقووڵایی مێژووەوە بزانین، بنچینەی ئەم دیاردەیە کاتێ سەری هەڵدا کە جیاوازی دروست بوو لەنێوان سەرکردایەتی هزری و سەرکردایەتی سیاسی نەتەوەدا، ئەوەش لەدوای ئەو گێچەڵەی بووە هۆی تیاچونی دەسەڵاتی جێنشینە ڕاشدیەکان لەئەنجامی ململانێی نێوان سەرکردایەتی دەوڵەتی ڕاشدەو ئاراستە تیرەیی و دەمارگیری و بۆچوونی هۆزە عەرەبە بیابان نشینەکاندا ڕوویدا هەروەها بزوتنەوەکانی تر کە دوایی پەیدابوون لە بزوتنەوەی (الردە) و یاخیبونی سیاسی کە گشت جارێك هەمان هەڵەیان دووبارە دەکردەوە تا لەئاکامدا بەڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆ کۆتایی پێ هات لەنێوان دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی مەدینە کە پابەندبون بە سیاسەتی گشتیی ئیسلامەوە، وەك (حسێنی کوری عەلی) و عەبدوڵای کوڕی زوبەیرو، (محمد ذي النفس الزكية) و زەیدی کوڕی عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت) هتد، وە لەنێوان پیاوانی سەرکردایەتی سیاسی کەسەر بە خێزانی حوکمڕانان بوون هەروەها سەرەك هۆزەکانیش، ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی دەرچەی ڕەگەزپەرستێتی و تیرەگەری ئەو چەرخەش کەچەرخی ڕووبەڕووبوونەوە بوو کۆتایی هات بەتێکشکاندنی سەرکردە هزرییە پابەندەکان بە ئیسلامەوەو پاشەکشێ کردنیان لەشێوەی دەستەی زانایان و سەرکردە ئایینییەکان لەسیاسەت و حوکمڕانیداو

بەشێوەی دابڕاوو نەیارانە مانەوە. بەتێپەڕبوونی کاتیش ئەم دابڕانو گروپگەرایی‌یە درێژەی کێشاو چەند سەدەی خایاندو لە ئاگامدا شوێنەواری خۆی لەسەر هزری ئیسلامی‌و هزری پیاوانی ئەو بوارەو بابەخەکانیان بەجێ هێشت، لێرەوە قوتابخانەی کلاسیک‌و لاساییکردنەوە سەری هەڵداو وردە وردە تێڕوانینی بەشگەرایی (النظر الجزئي) هاتەکایەوەو تاك پەیڕەوگەرایی زمانەوانی بۆ تێگەیشتن لەسروش‌و دەقەکان گەشەی کرد، مەترسی لەسەر شەریعەتی ئیسلامیش بەهۆی دەست تێوەردانی لاوازو شوێنکەوتەکان بووە هۆی ئاراستەکردنی کلاسیك‌و دۆگمایەتی، وە شتێکی سروشتی‌یە کە ئایندەی ئەم قوتابخانە هزریەش لەسەدەکانی دواتردا دەبێتە هۆی وەستانەوەی هزری ئیسلامی لەسەر حاڵەتی چاخی سەرەتایی ئیسلام‌و گەڕانەوە بۆ هەمان وێنەی مێژوویی‌و نوقم بوونی لەشتەبێ بابەخەکان‌و یادداشتە مێژووییەکانداو پۆچوون لە بە پیرۆز گرتنیاندا. بەم شێوەیە ڕەگو ڕیشەی هزریی سەرکردە کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی‌یەکان وشك هەڵات‌و ئەم سەرکردانە چۆکیان داداو لەشێوەیەکی کەوتەیی‌و کولبونی فیکرو نەفامیی سیاسیدا. ئەمانەی باسمان کرد بێگومان دەبنەهۆی ئەوەی نەتەوە بکەوێتە ناو گێژاوێکی کلاسیکی و چەق بەست‌و لەکارکەوتنی هزری سەرکردەی فیکری، واتە (زاناکان) ئەوانەی کە ئیتر نەیانتوانی ڕێگە بەرنەوەسەر سەرچاوەکانی ژیانی کردارییانەی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی کە لێی هەڵگۆزن لەلایەکەوە، وە کەوتنە نێومستی ستەم‌و قین‌و داروخانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی لەلایەکی ترەوە، سەرکردە سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌یەکان لە هەمان کاتدا نەیانتوانی بناغەیەکی هزری وا دابڕێژینەوە کە پشتی پێ ببەستن‌و تینوێتی چارەسەرکردن‌و پەرەسەندن‌و دۆزینەوەی بەدیلەکان بشکێنن.

بەم پێیە لاساییکردنەوەو چەق بەستنی هزری لەلایەکەوە گەمارۆی نەتەوەی‌داو قین‌و ستەمی سیاسیش لەلایەکی ترەوە، کە بەتەواوەتی وێنەی مێژووی دەوڵەتە دواکەوتوەکانی جیهانی ئیسلامی نیشان دەدات‌و یەکێکیشە لەگرنگترین ئەو هۆکارانەی کە بوونەتە هۆی کەوتنە ژێر چەپۆکی داگیرکەران‌و زاڵبونی دەسەڵاتی بیانی هاوچەرخ بەسەر نەتەوەدا ـ دوای داگیرکاری مەغۆل و خاچ پەرستان ـ. ئەوەی لێرەدا گرنگە باسی لێوە بکەین ئەوەیە کە هەرەسهێنانی نەتەوەو تێکڕمانی دام‌و دەزگاکانی‌و سنور بەندی لەبیرکردنەوەیدا لەسایەی پرۆگرامێکی مێژوویی کلاسیکی‌دا مەترسی‌یەکی گەورەی هێنایە ئاراوە ئەویش

بریتی بوو لەوەی کە نەتەوەی ئیسلامیو سەرکردەکانی بەدوای دەرچەی چارەسەری تازەدا بگەڕێن ئەویش بەلاساییکردنەوەی شارستانێتی بیانی، جیا بەخۆشی بێ یان بە زۆرو ملکەچی بێت، بەڵام ئەمەشیان لەئاکامدا بووە هۆی زیاتر لاوازبونی نەتەوەو هەرەس هێنانی، نەتەوە دووچاری دیاردەیەك بوو کە توێژەرەوان پێی دەڵێن دیاردەی (فراوان بوون و کشان لە جیابوونەوەی شارستانێتیدا لەڕووی ( ئابووری تەکنەلۆژی)یەوە لەنێوان باکورو باشوردا یان لەنێوان دەوڵەتە پیشەسازیە پێشکەوتوەکانو دەوڵەتە دواکەوتوەکانی جیهانی سێهەم کە دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامی زۆربەی پانتایی و دیارترین نیشانەکانی دەنوێنن.

گرنگترین ئەو پەندانەی کە لەهزری بەش بەش بوونو دابڕانو خۆ خواردنەوەدا وەردەگیرێت بریتییە لەشکست هێنانی قوتابخانەی کلاسیکی مێژوویی‌وە گەڕانەوە بۆ ژیانی نێوخەونە مێژوویەکان کارێکە دژ بە سروشتی شتەکان و جمو جوڵو بزافی ژیان بەپێی کاتو شوێنو هزرو تواناکان.

سوربون لەسەر گرتنەبەری ئەو شێوازانەی پێشوو لەهزرو دەرچەکانی کلاسیك لەچاکسازیو کاروبارەکاندا شتێکە نابێت خۆمانی پێ بدەین بە دەستەوە ئەگەر زووتر شانمان نەدابێتە بەر ئەو ئاکامە ترسناکانەی لێی دەکەوێتەوەو کەپێشتر باسمان کرد دواکەوتن و لاوازبوون و هەرەسهێنان و تێك شکان لەبەردەم ئەو جەنگە هزریانەی یەخەی بەوڵاتمان گرتبوو گرتوە.

پێویستە نەتەوەکەمان ڕێگەیەکی نوێ بگرێتەبەرو سەرکردەو بیریارەکانیشی لەهەوڵێکی نوێو ڕاستو دروست دا بن بۆ گرتنەبەری ڕێگەی سەرکەوتنو خۆلادان لە ڕێچکە داخراوەکانو پرۆگرامە نەزۆکەکان.

بەڵام دەپرسین ئایا ئەو شێوازە نوێیە کامەیە؟ ئەی دەرچە تازەکان چین؟ ناوەڕۆکیان چییە؟ ڕوخسارەکانی چین؟ چۆن تاقی بکەینەوە تا بزانین ئەم ڕێگەو شێوازە باشترو پڕ لەخێروبێرتر دەبێ لەوەی پێشتر و دەتوانێت ئەو شتانە بنێتەدی کە تا ئەمڕۆ نەهاتونەتە دی؟ بۆ ئەوەی ئەوە بهێنێتەدی پێویستە لەسەرەتاوە لەم دیاردەیە تێبگەین، بزانین چۆن سەری هەڵدا؟ بزانین چۆن لاوازیو هەرەسهێنان دەستی پێکرد؟ کەیو بۆچی؟ چۆن گەشەی سەند؟

تێگەیشتن لەو نەخۆشیەی کە دووچاری جەستەو مێژووی ئیسلامی بوە، و زانینی چۆنیەتی گەشەکردنو شوێنەوارەکانیو درێژەکێشانی پێویستن بۆ

تێگەیشتن لەخەسڵەتەکانی ئەو دەرمان و چارەسەرەی کە بۆی دانەنێین لەگەڵ جۆری ئەو هەوڵدانەی کە پێویستە بۆ چاکسازی و نەخشەکێشانی پراکتیزە کردنی.

### ٣ـ دەرچەی ڕەسەنایەتی ئیسلامی هاوچەرخ:

وەك لەناوەکەیەوە دیارە دەبێ ئەم دەرچەیە دەرچەو چارەسەرێك بێ بەوپەڕی وردییەوە لەسەر بنچینەی ئیسلام دامەزرابێ لەمەبەستو عەقیدەو وێناکانیدا، چونکە ئەو نەتەوەیەی کە مەبەستمانە گەشە بکات، ببزوێت، بنیات بنێت، نەتەوەی ئیسلامییە بە خۆی و عەقیدەو بەها ڕەوشتی و پێکهاتە دەروونی و هزرییەکەیەوە، جگە لەوەش هیچ ڕێگەیەکی‌تر نییە بۆ خستنە جوڵەی نەتەوەو بەرەو پێش بردنی ڕەوڕەوەی، پێشکەوتنیشی لەم ڕاستییە بنچینەییە لانادات سەبارەت بە تێگەیشتن لە کەسێتی نەتەوەو خانەکانی وزەو تواناکانی و پاڵنەرەکانی بەگەڕخستنی ئەگەر چی زام و دەردو نەخۆشی دایگرتبێت و تەنگانەو ناڕەحەتی ڕەنگ و ڕوخساری گۆڕیبێ.

بێگومان ئەوەندەش بەس نییە کە جەوهەری چارەسەرو دەرچەی ئاراستەکردن تەنها ئاراستەیەکی ئیسلامی پەتی بێ، چونکە ئیسلام کۆلکەی هاوبەشە لەنێوان (ڕێگەچارەی کلاسیکی مێژووی ئیسلامی) و (چارەسەری ئیسلامی هاوچەرخانەی ڕەسەن)، لەبەرئەوە پێویستە هەموو لایەنەکانی ئەم ڕێگە ڕەسەنە ئیسلامی و هاوچەرخە دیاری بکەین کە ئەم ڕێگەیەی پێ جیادەکرێتەوە لەڕێگەکانی ترو مەرجەکانی کاریگەرێتی تیادایەو هۆکارەکانی سەرکەوتنیشی لەخۆگرتووە.

ئەو دیاریکردنەی کە لێرەدا پێویستە جەختکردنەوەیە لەسەر ڕەسەنایەتی و هاوچەرخێتی ئەو ڕێگەچارەسەرەی کە پێشنیارکراوە، بەو واتایەی کە ڕێگەچارە کە لە دەرچەی عەقیدەو بەها ڕەوشتی و ڕەمەکە ئیسلامییەکانەوە بەرەو واقعی هاوچەرخانەی نەتەوەو ئەو کێشانەی کە هەیەتی و پەیوەندییان بەوەوە هەیە لەدەرك کردن بەڕەهەندەکانی کاتو شوێن هەنگاو بنێ و بەتێگەیشتن لەکەلتورو ئەزمونی ئیسلامی چاخی سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلام لەلایەکەوەو دەرك کردن بەواتای گۆڕانکارییە چەندێتی و چۆنیەتییەکانی ژیانی مرۆڤ بەگشتی بۆتێگەیشتن لەگشتگیرێتی و قووڵبونەوەو کارامەیی و شیکردنەوەش لەلایەکی تر،

ئەمەش جیاوازە لەڕێگەچارە کلاسیکیو دەرچە لاساییکردنەوەکان تا دەگەینە چارەسەرو سیاسەت وێنای ئیسلامی هاوچەرخ کە تەعبیر بێت بگرە هارپێکیش بێت لەگەڵ پێداویستییەکانی واقعی نەتەوەو ئەو خواستانەی پێویستێتی لەڕووبەڕوبونەوەیەکی ڕاستەقینەدا، وە لەسەر بنچینەی بەهارەوشتییەکانو وێناو ئامانجە ئیسلامییەکان. بەم شێوەیە دەتوانین تواناکان بۆ نەتەوەکەمان بگێڕینەوەو ببێتە شیاوی سەرکردایەتی، وە بەخۆیو بەهارەوشتیو ئامانجە بەرزەکانییەوە ئاراستەی کاروانی مرۆڤایەتی بەرەو چاکی دەبەن.

لێکدانەوەو چەمکی ئێمە بۆ (ڕەسەنایەتی هاوچەرخ) (٢) واتە مامەڵەکردن لەگەڵ واقعی هاوچەرخانەدا لەدەرچەکانی نەتەوەو خودییەتی ئیسلامیانەیدا بەواتای گشتگیرییە بە پلەی یەکەم، بەم پێیە واتە تێگەیشتنی هەموایەتی لەبەجێهێنانو سیاسەتە ئیسلامییە بەراییەکان بە هەموو ڕەهەندە شوێنیو کاتیەکانیشییەوە، وەتێگەیشتنو هەلگواستنی ئامانج و مەبەست و پەیوەندییە ڕاستو دروستەکانی تا ببێتە بنچینەیەکی مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو لایەنەکانی ژیانو کۆمەڵگەی هاوچەرخدا و تاکو نەتەوە بچێتە سەر کورسی سەرکردایەتی شارستانێتی (ژیاری).

ڕەسەنایەتی هاوچەرخ پێویستی بە تواناو شارەزایی هونەرییو سەلامەتی پرۆگرام هەیە هەروەها دەرچەی توێژینەوەو شی کردنەوەش لەسەر بناغەکانی سروشتو فیطرە ناسیو کارامەییو مومارەسە دەگرێتەوە، مومارەسەکەش دەرچەی واقیعو دۆزو کێشەو تواناکانی بە ئاراستەی ئیسلامو گشتگیرێتیو مەبەستو بەهارەوشتیو ئاراستەکانییەوە دەگرێتەبەر. وە بە پرۆگرامی گشتی

(٢) لەڕووی تیۆری تەجریدیەوە، زاراوەی ڕەسەنایەتی پێویست بەهیچ باسکردن و خستنە سەرێك ناکات،چونکە مەبەست لەهەڵقولانە لەخودو مامەلکردنە لەگەڵ واقعدا بەشێوەیەکی هەموار،بەلام بەهۆی ئەو لێك کەوتنە ڕۆشنبیری یە ئیسلامییە شێوێندراوە دوفاقەی هاتۆتە ئاراوە زاراوەی ڕسەنایەتی لەلای کەسانی سەر بەقوتابخانەی کلاسیکی تەنها گەڕانەوە بۆ مێژوو دەگرێتەوە بەخۆی و ئەو دۆزو ڕوداوانەی لە سەردەمە ڕابردووەکاندا ڕوویان داوە، بەلام زاراوەی هاوچەرخێتی کە پێچەوانەی ڕەسەنایەتییە لای ئەوان مانای مامەڵەکردن لەگەڵ دۆزەکانی جیهانی ئێستاو ئەم سەردەمەدا ناگەیەنێت بەلکو واتە بەغەرب کردنو داڕنینی نەتەوەی ئیسلامی لە بەهاو بنەماکانی، وە بەناو ڕۆشنبیرە مەدەنیو خۆر ئاواییەکان پێیان وایە کە زاراوەی ڕەسەنایەتی واتە کۆنەپەرستی، وەزاراوەی هاو چەرخیش واتە بەغەربی کردن، بەم شێوەیە هەردوو زاراوەکە لەم قۆناغەدا پێکەوە کۆبونەتەوە وە ئەو مانایەی کە ئێمە مەبەستمانە ڕوونو ئاشکرایە کە بریتییە لە هەڵقەلانو لە بەهاکانی خودو بنەماکانی ئیسلامەوە بەرەو مامەڵە کردن لەگەڵ دۆزە هاوچەرخەکەیدا.

کردارییانەی زانستی دەکرێت گواستنەوەی هێزو شارستانێتی پێویست لەجێ بەجێ کردنو موماەرەسە جۆراو جۆرەکان لەکۆمەڵگەی شوان کارەییو کشتوکاڵیو بازرگانێتی سادەوە بەدیبهێنرێت بۆ جیهانی پەیوەندەی کردنی میکانیزمیو جمو جوڵی بەردەوامو ئەو شتانەی پەیوەندییان بەو بوارانەوە هەیە لەگۆڕان هێنان بەسەر جۆری تواناکانو مومارەسەو پێشرەوی کردنەکانیدا لەشێوەی سامانو بەروبومو هۆکارو گۆڕان هێنان بەسەر پێداویستییەکانو فرمانەکانی تاکو کۆمەڵو دامو دەزگا سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابورییەکاندا تا وەلامی مل ملانێو ئەو مەترسیو دەرفەتانەش بداتەوە کە جیهان کەڵکی لێ دەبینێو بەهۆی قەیرانەکانیشییەوە سکاڵایان لەدەست دەکات. کەواتە دەبێ بە بیرکردنەوە لەدەرچە هەموانەییو گشت گیرییەکانەوە دەست پێ بکەین تا چاوپێداخشانەوەو وردەکاری کردن لەگەڵ جمو جوڵەکانی کۆمەڵی مرۆییو چڕیو مامەڵاتی گشتییاندا. ئەمەش بەپلەی یەکەم واتە هۆشیار بوونی تەواو چڕو پڕ سەبارەت بە مەبەستەکانی شەریعەتو هێزی کۆمەڵایەتی هاوچەرخو دارشتنەوەی ئەو سیستمو ڕێك خراوانەی کە جمو جوڵەکانی ئاراستە دەکاتو جڵەوگیری دەکات، بەشێوەیەك کە کۆمەڵگەی ئیسلامی بە خەسڵەتی ئیسلامیانەی خۆیەوە بمێنێتەوە کە بەدادپەروەرییو ڕاوێژو هاوکارییو برایەتییو بەها ئیسلامی یەکانی ترەوە ناسراوە بەبێ ئەوەی کە لاوازیو پیربونو بەش خوران ڕوی تێ بکات یان فەسادو زێدەڕەوی و ملەجڕێ بیگرێتەوە.

بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجەی ڕەسەنایەتی ئیسلامی هاوچەرخ دەبێ جارێکی تر پرۆگرامی باسو توێژینەوەی ئیسلامی دابرێژینەوە تا بەدەرچەیەکی ئیسلامیانەوە بناغەی مومارەسەو دەرك پێ کردنو کارامەییدا بنێین بەرەو ئیسلام و مەبەستو بەهاو ڕێکخستنە شارستانیو کۆمەڵایەتی یەکانی، ئەمەش مانای دوو بارەکردنەوەی یەك پەروەردەیی دەگرێتەوە بە هەردوو لایەنی ڕۆحیی بەهادارو هونەریی کردارییەوە لەهەموو قۆناغەکانیدا و بایەخدان بە دەرچەو فەلسەفە ئیسلامی یەکەیو قووڵ بونەوە تیایداو پسپۆریەتی زانستیانەی لەهەموو لقەکانی زانیاریدا، بە تایبەتیش لایەنی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتی یەکان.

لەکۆتاییدا ڕەسەنایەتی ئیسلامی هاوچەرخ دەبێتە هۆی پێداچوونەوەو ڕێکخستنەوەی یەکەمینە ییەکان (الاولويات)و دوو بارە دارشتنەوەی پرۆگرامو هێز بەشێوەیەك کە ئامرازو هۆکارەکانی پەروەردەی ئیسلامی ڕاستەقینە

لەبەردەستدا بێت و جارێکی تر داموو دەزگاو دامەزراوەکان دابڕێژرێنەوە بە سیاسیو کۆمەلایەتی یانەوە تا بەتەواوەتی ئەو ڕێکخستنە ڕاست و دروستە پێک بهێننەوە لەچۆنیەتی جموو جوڵی کۆمەڵگە بەرەو ئاوەدان کردنەوەو دوبارە بنیاتنانەوە لەسەر بناغەی بەها ڕەوشتییەکانی ئیسلامو مەبەستە پیرۆزەکانی.

دەرچەی ڕەسەنایەتی هاوچەرخ لەسەر دوباسك بەندە جا هەرکاتێ ویستمان چاکسازیو دەسەلات و پێشەنگێتی مرۆڤایەتی بکەین ئەوا دەبێ ئەو دوباسکە پێکەوە وەربگرین، پەندە مێژوییەکانیش هەموو جارەکان لەمێژوودا بەدرێژایی چەندین چەرخ و نەوە ڕێنمایی بۆ ئەوە دەکەن کە لەگۆڕانکارێتی شارستانێتیدا کە ئەو دوو باسکەش لەبینیەی عەقیدەیی پتەو لەگەڵ بالا دەستی هەزری کاریگەردا خۆیان دەبیننەوە. ئەمەش لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا بوو کە عەقیدەی ئیسلام هێندە بێ گەردو کاریگەر بووە بیریشیان بەڕادەیەك بالا دەست بوو کە لەسەر لاپەڕەی کاراییەکانی پیاوانی ئەو سەردەمەدا دیار بوو بۆیە توانییان دەست پێش خەری بکەن لەبڕینی شادەماری بازرگانێتی قورەیشدا، هەروەها توانایان لە نەخشەکێشانی سەربازیو دبلۆماسی جەنگی خەندەق و (صلح حدیبیە)و ڕزگارکردنی شاری مەککەدا، هەروەها لەو کارە بێ وێنەیەدا کە بڕینی بیانی شام بوو بۆ بەهانا چوونی سوپای موسلمانان لە جەنگی (یەرموك)دا لەگەڵ ڕومانەکاندا، هەروەها لەگەلاڵەکردنی دیوانەکان و نەخشە سیاسییەکان و داکوتانی بناغەو دامەزراوەی تۆکمە، و بنیاتنانی مزگەوت و کردنی بەفێرگەی پەروەردەو فێرکردن و بلاوکردنەوەی زانست و زانیاری، کە هەمو ئەمانە شایەتن لەسەر بالادەستی بیرتیژی نەتەوەی ئیسلامی و پیاوە هەلکەوتوەکانی چاخی سەرەتای ئیسلام بەسەر شارستانێتی گەندەڵ و خراپ کاریان دەسەلاتی هۆزایەتی و تیرەگەری بێسەروبەر کە لە چواردەوریان بوون.

هەمان حاڵ بەسەر ئەو ڕابون و ڕاپەڕینە ئەوروپییە هاوچەرخەشدا هات کە پاڵنەری عەقیدەی بەکارهێنا لە پێکهێنانی بزووتنەوەی چاکسازی(پرۆتستانتی) کە لە ڕوانگەیەکی مەسیحیانەی کاریگەرەوە دەڕوانێتە ژیان و ڕۆڵی مرۆڤ تیایدا بەمەبەستی چاکسازی کردنی تێڕوانینی ئایینی مەسیحیەوە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لەکاتێدا لەو سەردەمەدا مەسیحیەت لەناو خورافات و جادوگەریدا نوقم ووبوو، لەپاڵ ئەمەشدا چاکسازی کردن لە پرۆگرامەکانی هەزری ئەوروپیدا دەق و خواروخێچ و بەندکرابوو چەمکی حەرفی دەقەکان بۆ چیرۆکی خورافی پرۆبلاو کە

زۆرێکی لە ئەسفارە پیرۆزەکانی گاور و جولەکەدا تۆمار کرابوو تا عەقڵ و توێژینەوەی زانستی ڕێکوپێك لەناو ئەو قاڵبەدا بمێنێتەوە.

بەم جۆرە هەروەك چۆن ئیسلام و غەیری ئیسلام لە بنیاتنانی شارستانیەتدا تێڕوانینی عەقیدەیی و باڵادەستی بیرتیژی‌یەکی کاریگەریان کۆکردبووەوە بۆ ئەو پرۆژەیە هەروەها ڕابونە هاوچەرخەکەی ئەورووپاش هەمان کاریکرد.

دەرچەی ڕەسەنایەتی هاوچەرخ تا ئەمرۆش لەسەر ئەو دووباسك و کۆڵەکەیە وەستاوە و دەوەستێت کە یەکەمیان عەقیدەیەکی بنیاتنەرانە و دووەمیشیان بیرتیژی‌یەکی کاریگەریانەیە.

تەنها جەخت کردنەوە لەسەر لایەنی عەقیدەیی هیچ سودێك بە بزاڤی ئیسلامی ناگەیەنێت گەر تاقیکردنەوەیەك نەبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو عەقیدەیە بە شێوازێکی ڕێکوپێك، هەروەکو چۆن عەلمانی و خۆرئاوایی خوازەکانیش بەهەمو جۆرکانیەوە پابەندبونیان تەنها بەهزری خۆیان و باڵادەستیان لە دامێنانی هاوچەرخانەیان هەر تەنها لە بوارەکانی فکردا بێسوودە، بەڵکو پێویستە هەردوولایەنەکە لێك بدرێتەوە هەردو ڕیزەکە پێکەوە کاربکەن بۆ هێنانەدی جێنشینی لەسەر زەوی‌داو بنیاتنانی شارستانێتی.

بەیەکاچوونی هەردولایەنی عەقیدەیی و هزری لە ئاکامدا دەگاتەوە ئەوداڕشتنەی کە سروش و عەقڵ پێکەوە دەبەستێت، واتە خستنەکاری لە دەرککردن بە سروش و بابەتو دۆزەکانی و ڕێنمایی کردنی عەقڵی بەئامانج و مەبەستەکانی ژیان و سروش (الوحی) لە گشتگیرێتی گەردوونی و ڕەوشت و بەها بەرزەکانی ژیان و شارستانێتی‌دا. کرداری چاکسازی بەوشێوەیەی کە باسمان کرد کە تیایدا هەردوو جۆرەکە یەك دەگرنەوە لە ئاکامدا دەبێتە کردارێکی هزری لە پرۆگرام و شێوازدا واتە ئەو قەیرانەی کە ئەمرۆ نەتەوەکانی گرتوتەوە لە بنەڕەتدا قەیرانێکی هزری‌یە.

بێ گومان بانگەشەکردن بۆ دەرچەیەکی ڕاستەقینە و یەکالاکردنەوەی لایەنەکانی و دیاریکردنی پێشینی‌یەکان و خستنە ڕووی پلان و نەخشەکانی لە ئەستۆی ئەو بیریارو نوسەرو سەرکردە سیاسی و کۆمەڵایەتی‌یە هۆشیارانەدایە کە پێویستە لەسەریان خەبات بکەن لە ڕوون کردنەوەی وێنەیەکی پاك و بێگەردی شارستانیەت و هۆشیارکردنەوەی نەتەوەدا و بنیاتنانەوەی بناغەکانی تا تۆوی درەختی چاکسازی چەکەرە بکات و گەشەبکات و بەرهەمداربێ.

وا دەردەکەوێ کە ڕێگاکە لێڵ و پێچاوپێچ بێ ئەمەش سروشتی دەست پێکردنی هەمو کارێکە لەسەرەتاوە، هەمو سەرەتایەکیش قورس و گرانە، بەڵام ئایا چ کاتێ خەڵکی تەنها لەبەرئاسانی ڕێگەیەکیان هەڵبژاردووە؟! بەڵکو خەڵکی بۆئەوە چاکیان کردووە بەلاداو خۆیان توندو تۆڵ کردۆتەوە تا بگەنە ئامانج نەك تەنها ڕێگاکە لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە.

## دووەم - ڕەگی مێژووی ئەم قەیرانە:

### ١- گۆڕانی بناغەی سیاسی: دەشتەکی‌یەکان و ئاژاوە و ڕوخانی جێ‌نشینە ڕاشدەکان:

وەك پێشتر باسمان کرد بۆمان دەرکەوت کەبێ‌گومان ڕێگەچارەی ئیسلامی کارێکە هەردەبێ بگیرێتەبەر بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەکەمان لە قەیرانی لاوازی و لێك هەڵوەشان و دواکەوتنی لە بواری ئاوەدانی‌س و دیارنەبونی لە کاروانی گەشەپێدانی شارستانیەتی ئەمڕۆدا. لەلاپەڕەکانی پێشوودا بە کورتی ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی نەتەوەمان باسکرد کە چۆن ڕەنجی کێشاوە لە پێناو خۆڕزگارکردن و تازەگەری‌دا هەرلەوکاتەوە کە ڕوبەڕوی ململانێی شارستانێتی خۆرئاوای هاوچەرخ بۆتەوە و بەوهۆیەشەوە گەلێك تاڵی و دەردەسەری و خەم و تێکشکانی چەشتووە، بۆیەکەم جاریش لەمێژوودا بە شێوەیەکی زۆر وێران کەرانە ڕووبەڕوی نەتەوەکەمان بونەوە کە ئەویش ململانێی شارستانێتی‌بو، زانیشمان کە چۆن نەتەوەکەمان لە هەمو هەوڵەکانی‌دا شکستی خوارد کاتێ دەیویست خۆی لەم قەیرانە ڕزگار بکات، و بەرەنگاری ڕووبەڕووبوونەوەی شارستانێتی خۆرئاوابێتەوە.

ئەگەر دڵنیا و سوربین لەسەرئەوەی کە تەنها ڕەسەنایەتی ئیسلامی ئەم نەتەوەیەمان لەو قەیرانە ڕزگار دەکات و پشتی ئەولاوازی و تێك ڕمانە دەشکێنێ کە یەخەی پێ گرتووە، لە ئەنجامی ئەو شی‌کردنەوەیەی کە کردمان و ئەو واقعەش کە نەتەوەی ئیسلامی تیایدایەتی ـ ئەوا پێویستە ناخ و ناوەڕۆکی ئەو قەیرانە بزانین هەروەها جەمسەرەکانیشی بناسین تا لەوێوە بڕۆینە ناو جەوهەری ئەو قەیرانەی کەوای لێکردین کە بەهۆی نەناسینیەوە جیابوینەتەوە لەکاروانەکەمان و وای لێکردین چەندجار لە پێچ و قۆرتەکانی سەرەڕێ‌ماندا بەدرێژایی مێژووی نەتەوەکەمان بکەوین و هەڵسینەوە.

بێگومـان ئـەنجامدانی کـارێکی بـەم جـۆرە کـە ڕۆچـون و قوڵبونـەی دەوێ بـۆ قوڵایـی باسـەکان و گەیشـتنی بەرەگوریشـەکان وە نـاڕازی بونـە بـەتوێکڵی دەرەکی‌یـان هەرچـەندە لـە بناغـەی پـەروەردەیماندا وە لـەکارپێکردنی عـەقڵماندا درێغیمـان کـردووە پاڵنـەرەکانی تـرس و هەیبـەتداری و پیرۆزیمـان لـە دەسـت دابێـت، هـەندێ جار هـەنگاوی دڵسـۆزانەشمان بـۆ نـابێت و زۆر جـاریش وانـەبوویـتین، لـەژێر کاریگەری‌یـەکانی ململانـێی نەتەوایـەتی و گـروپ گـەرایی و تایەفەگـەری و هـزری‌دا بـەدرێژای ژیـانی نەتەوەکـەمان و مێـژووی درێژخایـەنی‌دا، کـەمجار لـە مێـژوودا ڕووی ڕاستەقینەی ئـەم نەتەوەیە خراوەتـە بـەرچاو بـەڵکو لەزۆربـەی حاڵـەکاندا وون بـووە بـەهۆی ترسـم وبیـم و پـیرۆز ڕاگرتنـەوە و کـە عـەقڵ و هزرەکـان توشـی ئیفلیجـی دەهـاتن و نـەیان دەتوانـی بگەنـە ڕاستی و عـەقڵ و کـردار.

لەبەرئـەوە پێویسـتە لەسـەرمان جـارێکی تـر چاوبخشـێنینەوە بـە قـەوارەی خۆمـان و مێژوومـاندا لەسـەرەتاوە تـا ئـەمڕۆ بەشـێوەیەکی گشـتی، بەچاوپیاخشـاندنێکی وردو پشـکنەرانەی‌دا کـە تێگەیشـتنێکی ڕاسـت و دروسـت بێنینـە ئـاراوە نـەك بـەپیرۆز گرتنێکـی بێنـاوەڕۆك یـان سەرزەنشـت کـردن و زڕاندنێکی چەپـەڵی نەزۆکانـە.

سەرەتای سـەرهەڵدانی ئـەم قەیرانـەی ناوقـەوارەی خـودی نەتـەوەو مێژووەکـەی بـەرپابوونی ئـەو فیتنـە گەورەیـەبوو کەلەگـەڵ خۆیـدا زنجیرەیـەك شـەڕی نـاوخۆی لەناو کۆمەڵگە و دەوڵـەتی ئیسلامی‌دا هێنایـە کایـەوەوە، ئـەوەبو خەلیفـەی سـێهەم (عوسمـانی کـوڕی عـەففان) پاشـان (علـی کـوڕی ئـەبو تـالیب) (خوایـان لێ ڕازی بێـت) شـەهید کـران، ئیتر خەلافـەتی ڕاشدین ڕووخـا لـە شوێنەکەیدا سـوڵتان و پاشـای قـین لـەدڵ و مـاڵ خۆشەویسـتو دەمارگـیر دەسـەڵاتیان گرتـە دەسـت کـە بـە دەوڵـەتی (بەنی ئومەییـە) دەستی پـێ کرد.

بـەرپابوونی ئـەو فیتنـە و ئاژاوەیـە و نـەمانی دەسـەڵاتی ڕاشـدین لـە ڕوداوە گرنگـەکانی مێژوومانـە و نـاکرێت بەسـەریا هـەڵبورین تـاڵێ تێنەگـەین و ئـەو هۆکارانـەش نـەزانین کەبونـە هـۆی کەوتنـەوەی ئـەو ئاژاوەیـەو ئـەو شـوێنەوارە ترسـناکانەی لـە دوای خۆیـەوە بـەجێی هێشـت کـە هـەندێ لەوانـە تـا ئێسـتاش کەریگـەری هەیـە لەسـەر چارەنوسمـان. تـاکو ڕێـڕەوی مێژینـەی نەتەوەکـەمان بـە تـەواوەتی بزانـین بـەرچاو ڕۆشـن بـین لەوساکەوە تـا ئـەو قۆناغـەی ئـەمڕۆ تیـایدا ئـەژین کە بە دەست هـەندێ لـە ناهەمواری‌یەکانی‌یـەوە دەنـاڵێنین.

ئـەو هۆکـارەی کەبۆتـە بـەرپابونی فیتنـەو هەرەسـهێنانی خەلافـەتی ڕاشـدین و ئـەو گۆڕانکاریەیـە کـە ڕوی‌دا بەرلـەوەی پێشـتر لای بـەلادا کرابێتـەوە، یـان توانـای پێویست بۆ تێپەڕاندنی دابین کرابێ، ئەوەش ئەو گۆڕانـە بـوو کـە بەسـەر ئـەو بناغـە سیاسی‌یەدا هـات کـە سـەرکردایەتی و خەلافـەتی ئیسـلامی ڕاشـدی لەسـەری بـەندبو، دوای ئـەوەی کـە هـاوەڵان و سـوپای هـاوەڵان و (کادێرەکانیـان) ئـەوان بناغـەی دەوڵـەتی پێغەمبـەر(ﷺ)بـوون لـە ڕەنجـی شـانی ئـەوانیش دەوڵـەتی جێنشـینە ڕاشـدیەکان پێـك هـات بـە خۆیـان و ئـەو هـەمو ڕەوشـتەبەرزو ئاراسـتەجوان و ئامادەباشـی و پێگەیشـتنە کامڵـەی تیایـاندابو، هـەر ئـەوانیش بـون کـە توانیـان بـەرگری لەدەوڵـەتی پێغەمبـەر(ﷺ) بکـەن لـە چاوتـێ بڕیـن و دەسـت درێـژی ئیمبراتۆرەکـانی ئـەو سـەردەمە کـە فـارس و ڕۆم بـون بیپـارێزن، کـەچی وردە وردە دەرفـەت کرایـەوە وە مـاوە زۆر بـوو تاسـەرەك هـۆزو دەشـتەکی‌یەکان بـەخۆیان وخەسـڵەتە دەمارگیریەکانیانـەوە بێنـەناو سـوپاوە شـان بەشـانی ئەمـەش وردە وردە ڕۆڵـی هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) کـەم بـووەوە بـەهۆی شـەهید بـوون پیربونیانـەوە، لەئەنجامدا کەڵەکەبوونی ئەو دەشتەکی و سـەرەك تیرانـە لـە نـاو سـوپا و دەوڵـەتدا گەیشتە ڕادەیـەك کـە خەسڵەتەکانی خۆیان بخەنـە پـاڵ بنـەما گشـتی‌یەکانی ئیسـلام و چـەمکی تیرەگـەری و دەمارگـیری تێکـەڵاو بـە ئیسـلام بکـەن، وە ئەوانـەی کـە خۆیـان ملکـەچ نـەکرد بۆ شـتێك کـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەو پـەڕی ملکـەچیان لەبەرامبـەردا نواندبـوو ئـەویش لایـەنی پـەروەردەیی و مەشـق و هۆشـیارکردنەوە بـوو بـەدرێژایی سـاڵانی بـانگ خـوازی و زەحمـەت کێشـان بـوو لـە پێنـاو بنیاتنـانی دەوڵـەت و کۆمەڵگـەی موسـڵمان بەڕابـەری پێغەمبـەر (ﷺ) و دواتریـش خەلیفـە ڕاشـیدە پێشـینەکان.

وە بـە تێپـەڕبوونی کـات هێـدی هێـدی سـەرەك هۆزەکـان و دەشـتەکی‌یەکان توانیـان کـە سـوپای فـەتح و خەلافـەت بخـە ژێرپکێفـی خۆیانـەوە و ئـەو بنچینـە سیاسی‌یانەش گۆڕانیـان بەسـەردا هـات کـە دەسـەڵاتی خەلافـەت پشـتی پـێ بەسـتووە ئـەو بەهارەوشتی و ئامانج و مەبەست و پێـوەرە پـڕ لـە دڵسـۆزیانەی کـە پێغەمبـەر (ﷺ) کـاری پـێ دەکـرد جیابو لـەو مەبەست و پێوەرانـەی کـە سـوپای تـازەو بناغـەی سیاسی تـازە پشتی پـێ بەستبوو.

لەبەرئـەوە بـێ‌گومـان بـەدور نـە ئـەزانرا کـە ئاژاوەیـەکی بـەوجۆرەی کـە ڕویـدا بـەرپابێ و دەسـەڵاتی خەلافـەت بڕوخـێ و سـوڵتانی خـاوەن هـۆز ودەمارگـیری

ستەمکار لە جێگەیدا حوکم ڕانی بکەن، گۆڕان بەسەر بەڕێوەبردنی سیاسیدا هات، ئیتر سوورشتی بوو کە دەسەلات گەیشتە دەست سولتانی (بنی أمیە) و بنجی نەبەست بۆ عوسمان یان علی یان حەسەن (خوا لێ یان ڕازی بێت).

ئەوەش هەرشتێکی سروشتییە کە بەدرێژایی زیاتر لە سەدەیەک هیچ دەسەلات و کاروبار نەدرێتە دەستی ئەوژمارە کەمەی پیاوانی پابەند بە ئیسلامیەوە لەمەککە و مەدینەدا، بۆیە بەدورنەدەزانرا کە ڕیزەکانی حوسەینی کوڕی عەلی و عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر محمد (ذی النفس الزكية) و زەیدی کوڕی عەلی هتد... لە چەند جەنگێکی ئەهلی ماڵ وێرانکەردا کەزاڵ بوون تیایاندا بۆ نەریتی هۆزایەتی و تیرەگەری بووەوئەوئاڕاستەیە بەهێزتربوو لەگەڵ ئاڕاستەی ئەو گەلانەی هاتنە ناوئیسلامەوە بەفارس و ڕۆم و هندو تورك و گەلانی ترەوە بەشێوەیەکی نەرمەکی و بەبێ ئەوەی دەرفەتێکیان بۆ برەخسێنێ کەتیایدا پەروەردە بکرێن و مەشقیان پێ بکرێ تالە ناو بۆتەی ئیسلامیدا بتوێنەوەو لەهەموو خلتەی نەفامی و دەمارگیری پاکژبکرێنەوە .

بەم پێیەش سەرەتای لەڕێلادان و دوورکەوتنەوە لەئامانجە پیرۆزو چەمکە بێگەردو پرۆگرامە بەرزەکەی ئیسلام، بەزاڵ بوونی ئەعرابی لەپیاوانی خێڵەکی دەستی پێکرد بۆیە بناغەی سیاسی گۆڕانی بەسەرداهات تالەئاکامدا نەتەوە ڕۆژی بەڕۆژێك گەیشت کەتیایدا ستەم و سەرکردایەتی تێکەڵەیەك بوو لەئیسلام و جاهیلییەت .

## ٢ـ لێك ترازانی نێوان سەرکردایەتی هزری و سەرکردایەتی سیاسی :

ئەگەر سوپای ڕزگاریکاریی ئیسلامیو جێ نشینە ڕاشدینەکان دەشتەکیەکان پێکیان هێنابێ هەر ئەوانیش درێژەیەیان بەدەسەلاداریتی(بنی امیە) دابێ دەکرێ هەرئەوەش یەکەم هۆ کاربوبێ بۆ گۆڕانکاریو لەڕێ لادان، بەڕووبوومی ئەم گۆڕنکاری یە لەڕووکاردا کاری کردەسەر دەوڵەتی ئیسلامی بەلام کاریگەری مەعنەوی زۆر خراپتر، چونکە بووە هۆی کەرتو پەرت بوونو بەش بەش بونی ڕیزەکانی سەرکردایەتیە کۆمەلایەتییەکان ئەوەش لەجیابوونەوەی سەرکردەی هزریو سیاسی دا خۆی بینییەوە ئەمەشیان دیسان بوبەبناغەیەکی تر بۆ بەرپابونی هۆکارەکانی لاوازی و تێك ڕوخانو لێك ڕەوینەوەو گەڕانەوەی ئەو توانا زۆرانەی کە ئیسلام لەناخی خەلك و نەتەوەکاندا تەقاندییەوە .

دوای بەرپابونی دەسەلاداریتی دەمارگیریو قین لەدلی لەنێو سستمی کۆمەلگەی ئیسلامیدا ئیتر سەرکردایەتی هێزی ئیسلامی پابەند بەئیسلامەوە کەلەخاکی حیجازو مەلبەندی خەلافەتی ڕاشدیندا دابوو ئەم گۆڕانکاریە تازەیەی پەسەند نەکردو، هەروەها هێزی گۆڕانکاری نوێو ئامانجەکانیشی هەر پەسەند نەکردو خۆی ئامادەکرد بۆ بەر پەرچ دانەوەو بەربەرەکانی کردنی ئەو دەسەلاتە لەسەر بنچینەیەکی عەقیدەییو هێزی، نەك لەسەر بنچینەیەکی تیرەگەری .

کاتێ شەڕی ناوخۆیی بۆ ماوەی زیاتر لەسەدەیەك ئەو بیریارو کەسە ئایین پەروەرانەی شەکەت و ماندوو کرد کە نەیان توانی ئەو جەماوەرە لەخۆیان کۆبکەنەوە کەچەمك و سستمی تیرە گەراییو هۆزایەتی گۆڕانی بەسەر عەقلو بیرو بۆ چون و پەروەردەیاندا هێنابوو، ڕیزەکانیان ناچاری پاشەکشەبوونو لەسەرکردایەتی سیاسی دوور کەوتنەوەو وازیان لە شێوازی کوشتارو ڕووبەڕوبونەوە هێنا، ئیتر سەرکردایەتی سیاسی نوێش هەستا بەڕێگە تەسك کردنەوەی ئەو کەسانەو گەمارۆ دانیان تابەرگرییان نەمێنێوەهەولیدا ناچاریان بکات تامل بدەن بۆ گوێڕایەلی فرمانەکانیان تەنانەت زانا پایەبەرزەکانیش لە سەرووشیانەوە هەرچوار پێشەوا لەو پشکە بێبەش نەبوون ئەوەبوو پێشەوا (ئەبو حەنیفە) لە بەندینخانەدا کۆچی دوایی کرد لە سالی(١٥٠ ك/ ٧٦٧ ز)، بەلام ئامادە نەبوو کەدەسەلات دارێتی سولتەی سیاسی ناپابەند بە ئیسلامەوە قەبول بکات. پێشەوا مالیکیش (١٧٩ك/٧٩٥ن) کۆچی دوایی کردووە، هێندەی لێ درا تادەستی تووشی ئیفلیجی هات لەبەر ئەوەی بەئاشکرا فەتوای دابوو لەسەر بەتال کردنەوەی (تەلاقی بەزۆر) وەئەم فەتوایەش دەلەلاتێکی سەلبی دژ بەدەسەلاتی سیاسی لەو سەردەمەدا هەبوو،(٣) هەروەها پێشەوا ئەحمەد (٢٤١ك/ ٨٥٥ن) کۆچی دوایی کردووە گەلێ سزاو ئازار درا کەنەیاربوو بەنەخشەو پلانەکانی سولتەی سیاسی سەردەم، پێشەوا شافعیش (٢٠٤ك/ ٨٢٠ن) کۆچی دوایی کردووە ناچاربوو کەخاکی ژێر دەسەلاتی سولتان جێ بێلێ کە بەغدابوو دوای ئەوە گروپێکیان لە یەمەنەوە ناردە سەری بەهۆی ترسانی سولتەوە لە هێزو چالاکی یە

---

(٣) خەلیفە عەبباسی‌یەکان پەیمانیان لەپیاوانی وولات سەبارەت بە بەیعەت و گوێ ڕایەلیان بۆ خەلیفە وەردەگرت ئەویش بەوەی سوێندیان دەدان کە ئەگەر لەو پەیمانە لابدەن تەلاقی ژنەکانیان بکەوێت.

سیاسیەکانی تاناچار پەنای برد بۆ میسر ـ ئەوسا کە دوور بوو لە دەسەڵاتی مەرکەزی سوڵتانەوە ـ بۆ ئەوەی ڕزگار ببێ لە ڕاونان و ئەشکەنجەوە. ئەم لێک ترازانەی نێوان سەرکردایەتی هێزی ئیسلامیو سەرکردایەتی سیاسی کۆمەڵایەتی بووە هۆی ئەوەی کە تواناکانی مرۆڤی موسوڵمان چەق ببەستێو موسوڵمان ببێتەوە بەخوریو هێزی سستەمە

ئیسلامیەکە برمێو زیاتر دەروازە واڵابێ لە بەردەم هێزەکانی فەسادو کاولکاریو ڕمانندا. وورده وورده ووزەو گڕوتینی ئیسلامەتی بەرەو لاوازبوونو خامۆشی دەچو، هیچ شتێك لەشارستانیەتی ئیسلامو ئەو بەخشیشانەی کە داویەتی بەنەتەوە لە بەردەستا نەمان مەگەر ئەو پاشماوانە نەبێ کە لەشێوەی (معالم الاسلام) دا وەك نوورێکی ڕێنمایی لەدڵی خەڵکیدا مابۆوە.

ئەم لێك ترازانە لەنێوان سەرکردایەتی هێزیو سەرکردایەتی سیاسیدا بوو بەزەمینەیەکی لەبار بۆ گەشە کردنی ئەو دەردو نەخۆشیانەی کە لەئایندەدا دوو چاری نەتەوە بوون ئەمڕۆش لەڕووی هێزیو ماددییەوە ـ لەگەڵ ئەوەی کە لاوازەو قەوارەو بوونیشی لەژێر هەڕەشەی دوژمنانیدایە ـ تەنگە نەفەسە لەبەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەو ململانێی شارستانێتی هاوچەرخی خۆرئاوادا کە قوت بۆتەوە بەرامبەر ئەم نەتەوەیەو هەڕەشەی ماددیو مەعنەویو بەوێران کردنو ڕووخان لێ دەکات.ئەم لێك ترازانە بووە هۆی دابڕینی سەرکردایەتی هێزی لە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتیو مومارەسەی کرداریدا، ئەمەش لەلای خۆیەوە هۆکارێکی بنچینەیی‌یە لەپشتی پەککەوتەیی عەقڵی موسوڵمانو خاوبوونەوەی تاوای لێهات بڕواتە گۆشەی مزگەوتەکانەوەو لەو کتێبە تیۆریو مێژووییانەدا بگەڕێ کە لەناوەڕۆکدا بەشێوازێکی وەصفیو پرۆگرامێکی تەنها زمانەوانی دەوێت شیکاری مەبەست دەقی قورئانو سوننەت بناسێنێ وەهەوڵدانێکە کە سوڵتانو دارو دەستەکەی لەبەکارهێنانی ئەو دەقانەدا ئەنجامی بدەن وەك هۆکارو ئامرازێك بۆ شەرعاندنی خوارو خێچیو لەڕێ لادانەکانی سوڵتان، تا لەئاکامدا ئەم جەنگە بەداخستنی دەرگای (اجتهاد) کۆتایی هات. لە ڕاستیدا(اجتهاد) دەرگایەك نییە تاکلۆم بدرێ خانوویەکیش نییە تابڕوخێنرێت، بەڵکو لێرەدا مەبەستمان لەئاکامی کاروبارەکانە بەچی گەیشتن دوای ئەوەی ئەو خاوبوونەوەیە هێزی موسوڵمانانی گرتەوەو وای لێکردن کە سەرکردە سیاسیەکان پابەند نەبن بەئیسلامەوە دواتر هەموو هەوڵە سیاسیەکانی سوڵتان ئەوەبوو کە قین لەدڵ بێو ستەم بکاتو بەلای

ڕاستو چەپدا خەڵکی ئازار بدات وەهەموو شتێك بکاتە قوربانیی لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیو کورسییەکەیو دەستو پێوەندەکانی، ئەمەش وای کرد کەتەنها مزگوتیان بەدەستەوە بمێنێ لەهەموو ڕووداوێکی نوێو دەسەڵاتو سیاسەت بێ ئاگابن.

هەر ئەم لێك ترازانە جارێکی تریش دەستی خۆی وەشاندەوە کەبووە هۆی بێ ئاگایی سەرکردایەتی سیاسیو بیرنەکردنەوەی هەبوونی جەماوەرو بنچینەیەکی هزریوا کەخزمەتی بکات، تەریب لەگەڵ گۆڕانکارییەکانیدا بڕواتو بەهزری نوێو سیاسەتو بەدیلەکان سوڵتە دەوڵەمەند بکات، لەبەر ئەوە نامۆ نەبێ بەلاتەوە کە سەرکردایەتی سیاسی لە سەرانسەری مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیدا بەرەو دەسەڵاتێکی ستەم کارو فێڵ باز چوبێتوبەرقو کینی خۆی جەماوەری سەرکوت کردبێو نەتەوە هیچ دەرفەتێکی ڕاوێژکاری لە بەردەستا نەبوبێ وە هیچ پشکێکیشی نە بوبێ لە ڕاپەڕاندنی کاروباری خۆیدا یان بەگەڕ خستنی قەناعەتو توانایەك کە تیایدا بەدی دەکرێ. هەروەها بەلاتەوە نامۆ نەبێ کە لەئاکامدا تێکڕایی نەتەوەی ئیسلامی بەرەو لێك هەڵوەشانو نائومێدیو پاش گەز بوونەوەی شارستانێتی هەنگاوی نابێ لە قەوارەو،ڕونیو هزرییەکەیو لە دامو دەزگاکانیشدا،

کارێکی گران نییە کە خوێنەر دەرك بەو ڕمانو هەڵوەشانەوە سیاسییە بکات کە دووچاری جەستەی نەتەوەی ئیسلامیو یەك بوونەکەی بۆتەوە هەر لە سەردەمی ڕووخانی دەسەڵاتی خەلافەتەوە بەڵکو ئەوە گرنگە خوێنەر جیاوازی بکات لە نێوان ئەو ووزە پاڵنەرە شارستانێتییەی کە بەدەرکەوتنی ئیسلام هەڵ قوڵا لەگەڵ ئەو توانا مادییەو ئەو کەڵەکەبوونو یارمەتییانەی بۆتە یەکێك لە ئاسەوارەکانی پاڵ نەرە ئیسلامییەکان لە سەرەتادا، کە بەهۆی لاوازبوونو پوکانەوەی نەتەوەکانی دەورووبەرییەوە بۆی هەڵکەوت، سەرەڕای ئەو وێران کارییەی دووچاری نەتەوەی ئیسلامی بۆوە وە ووزەی بەرەو پێش چوونی لاوازبوو، چونکە لێرەدا شتەکە ڕێژەییە تەنانەت لەو کاتەشدا ووزەی پاڵنەرە ئیسلامیەکە گەورەبوو بەڕێژەیەك. هەروەها ئەو شتانەشمان لە یاد نەچێ کە دووچاری سەرچاوەکانی ووزەی ئەم نەتەوەیە بووە لە لێك هەڵوەشانو شی بوونەوە، چونکە ئەو شتانەی پەیوەندی بەم ئاراستە گشتییانەوە هەیە کارێکە ناتوانرێ بەڕوونیو ئاسانی تێبینی بکرێ مەگەر پاش ماوەیەکی درێژ خایەن کە

وورده وورده شـــوێنەوارەكان دەردەكـــەونو ڕووكـــارە ئاشـــكراكانی دەڕوخێـــتو پاشمـــاوە كەڵەكـــە بووەكـــەیش دادە خورێـــتو وورده وورده لارو وێرییـــە هـــزریو كۆمەلایەتییـــەكان دەردەكـــەونو تـــەمو تـــۆزی ســـەریان دەڕەوێتـــەوە، هـــەروەك چـــۆن ئێستا ئێمە بەڕوونی بارودۆخی نەتەوەكـــەمان دەبینـــین.

## سێهەم: ناوەڕۆكی قەیرانەكەو بوارەكانی ڕاستكردنەوەی ڕێڕەو:

### ١- قەیرانی هزر نەك قەیرانی عەقیدە:

سـەرەڕای بوونـی چـەند بازنەیـەكی بـەتاڵ لـەو هەوڵـە شكسـت خواردووانـەی كـە دراون بـۆ چارەسـەرو بەدیلـە كلاسیكییەكان، جـا مێژوویـی بـن یـان بیـانی، هێشـتا تـێڕوانینی ئیسـلامیانە ڕوون نەبۆتـەوە، بـەڵكو تێكـەڵ كردنێكـی زۆر لـەنێوان هـزرو عـەقیدەدا بـەدی دەكرێـت، وەك ئـەوەی هـەردووكیان یـەك شـت بـن وەسروشـتێكی ڕەهـاو پیرۆزییـەكی هەمیشـەییان هـەبێ. ئەمـەش بـەهۆی ئـەو شـێواندنەی كـە دوژمنانمـان بەهـەموو هۆكارەكـانی ڕاگـەیاندنیانو ڕۆشـنبیریو پـەروەردەییان كـە تیامـاندا دروسـتیان كـردووە بـەهۆی هەوڵـە بەردەوامـەكانیان لـەچوار چێوەیـەكی ڕێـكو پێـكو لەبازنـەی ئـەو توێژینـەوە خۆرهـەلات ناسـیو داگیركەرانـەی تایبـەتن بەتوێژینـەوەی كاروبـاری ئیسـلامو جیـهانی ئیسـلامی. هـەروەها شـتێكی دیكـەش بووەتـە هۆكـار لـە لێـل كردنـی جینسییەی ئیسلامی هاوچەرخ دا ئەویش بریتییـە لـەو كۆسـپە دەروونییانـەی كـە عـەقلی موسـوڵمانی وەك عـەقلی گیـاندارێكی درنـدە نیشـانداوە، وای لێ كـردووە كـە تـێڕوانینێكی شـیكارانەی نـەبێو وەك پێویسـت نەڕوانێتـە كـەلتورو پیرۆزییـەكانی ڕابـردووی تـا دەرك بـە ناوەڕۆكەكـەی بكـاتو جێگـەی بایـەخ پـێ دانـی بـێ، جیـاوازی بكـات لـەنێوان شـتە نـەگۆڕو ڕەهـاو بنچینەییەكان بەو شتانەی كـە دیـاری كراونوبـۆ ماوەیـەكن هـەروەها هەست بكـات بـە جیاكردنـەوەی ئـەو شـتانەی پـەیوەندییان بەجەوهـەرەوە هەیـە لەگـەڵ ئـەو شتانەی پـەیوەندییان بـە بـەجێ هێنـانو شـێوازەوە هەیـە بـەهۆی ئـەو شـتەی لـە نـاخی دەروونمـاندا چاندمـان لـە واتاكـانی تـرسو توانـاو متمانـە بـەخۆ نـەبوون توانامـانی ئیفلیـج كـرد لـە تـێڕوانین بـۆ ڕووداوەكـانی ڕابـردوو خسـتنە ڕووی كـەمو كوڕییـەكانی، لـە بەرئـەوە تائـەمڕۆش عـەقلی موسـڵمان دیلـی ئـەو چـەمكو دەرچـە بناغەییانەیـە كـە وای لێ كـردووە ببێتـە گـیر خـواردووی هەڵـەكانی ڕابـردوو لـەڕێ لادانـەكانی بـەبێ ئـەوەی بتوانێـت لـەو نـاوە ڕۆكانـە تـێ بگـاتو جیایـان بكاتـەوەو

ڕێڕەوەکان ڕاست بکاتـەوە وە بـەقوڵایی ئـەو دۆزانـەدا شـۆڕبێتەوە کـە ڕووبـەڕوویان دەبێتـەوە وە دەسـت کـەوتنی ئـەو مەبەستانەی لـە پشـتیەوەو لـە نێـوان لۆچـەکانیدا هەیـە تـاکو کاروانەکـە بـە سـەرکوتوویی و بەمتمانـە وە ڕێگـە بگرێتـە بـەر بـەرەو ئاییندەیەکی گەشـەدار نـەك دەسـتە پاچـە لـە گۆشـەو کـەنارەکانی ڕابـردووی پـڕ لـە تەم و مژدا دابنیشـێ.

جا ئەگـەر پرۆگرامـی بیرکردنـەوە گۆڕانـی بەسـەردا نەیـەت وە دەرچـەکانی ڕاسـت نەکرێتـەوە ئـەوا عـەقڵی موسوڵمان بەسستی و بێ توانـایی دەمێنێتـەوە، نـاتوانێت بـە تێڕوانینێکی ڕەخنـە گرانـەو بینیەیـەکی باشـەوە بڕوانێتـە شتەکان، لـە بەرئـەوە تەنـها لـە جێگـەی خۆیـدا چـەق دەبەسـتێ بـەبێ ئـەوەی بـەرەو پێشـەوە بـڕوات، بـەرەو چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـەو گرفتانـەی کـە ڕۆژانـە بـە شـێوەیەکی شکسـت خـواردوو بە درێژایی چـەندین سـەدەو چـەرخ و دەوڵـەت دووبارە بوونەتـەوە، بـەڵکو ئـەم جـۆرە هەوڵـە هەڵانـە تەنـها نەتـەوەمان مـاندوو دەکـەن و بـەرەو تێـك ڕمـانی دەبـەن.

وە لـەو کارانـەی کـە بـاری عـەقڵی موسـوڵمان زیـاتر قـورس و گـران دەکـات ئـەوەیـە کـە گروپـە سـەرکردەیی‌یە فیکـری و سیاسـیەکانی نەتـەوە بـەکۆ - جـا بەمەبەسـتەوە بـێ یـان بـێ مەبەسـت - پـاش بـێ ئومێـدی زاڵ بوونیـان لـە مـل ملانێکانیـان دا دەسـتیان دایـە مـل پـێ کـەچ کردنـی نەتـەوەو تۆقـاندنی عـەقڵی ڕۆڵـەکانی لـە ڕووی مـاددی و دەروونیـەوە بەشـێوەیەکی وا هـەر گروپـەی ڕۆڵ و پلـەی لـە سـەرکردەیی نەتـەوەو ڕووبـەڕوو بوونـەوەی لایەنەکـەی تـردا بـەهێزو مسـۆگەر کردبـوو. بـەم شێوەیە سـەرکردایەتی سیاسـی شـێوازی تـۆ قـاندنی مـاددی گرتبـوە بـەر - ئیـتر بـە هـەر نیـازێ بووبـێ - هـەروەها سـەرکردایەتی حزبیش تۆقـاندنی دەروونـی. ئەمـەش بـۆ ئـەوەی عـەقڵی تـاکی موسـوڵمان لێ بکـەوێت و مـل کـەچ بـێ بـۆ دەسـەڵاتی ئـەم سـەرکردایەتییانەو هـەر ئـەمانیش دەسـت بخەنـە نـاو کـاروو بـاروو ژیـانی تایبـەتی تاکەکان و جـم و جۆڵـە کۆمەڵایـەتی و ڕێـك خسـتنە کانیشـیان، بـەچاو پۆشـی کـردن لـە ناخی نیـازو مەبەسـتەکانیان و چۆنیـەتی لێ تـێ گەیشـتنی هەریەکـەو لـەو گروپانـە لـە ڕۆڵی خۆیـان و پاکانـەکردنی خۆیان لـە گرتنەبـەری ئـەو ڕۆڵـەی کـە هەیانـە. وەجـێی پێکـەنینێکی گریانـاوی‌یـە کـە ئـەم تۆقـاندن و تیرۆری‌یـە گەیشـتۆتە ڕادەیـەك خـودی سـەرکردایەتی‌یە سیاسـی و حزبیـەکانیش دەربـاز نـەبوون لـە کاریگەری‌یـە وێـران کەرانەکـەی و بـەلاوازبوونی بنکـە سیاسـی و ژیاریـەکانیان خۆشـیان لاوازبـوون تەنانـەت سـەر بەخۆییشـیان لـە دەسـت داو. وەمل کـەچ بـوون بـۆ هێـزە بیانی‌یـەکانی دوژمنـان و

چاو برسی‌یان، بەبێ ئەوەی هیچ خیارێکی مەبەستەکانی خۆی لە بەر دەستدا مابێ.

بەم کۆت و بەندانە بینیەی عەقڵی موسوڵمان بەند کراوە لەنێوان دوو ڕێگەدا جا یان دەبێ مێژووی ڕابردووی خۆی پێ قەبوڵ بکرێ بە هەموو گرێ و گۆڵ و لە ڕێ لادانەکانی‌یەوە وەبەو جێ پەنجە ڕەشانەش کە بەسەر پرۆگرام و هزرو دام و دەزگاکان و کۆمەڵگەکەیدا بەجێی هێشتووە، یان ڕێگای دووەم هەڵ بژێرێت کە بەشێوەیەکی گشتی کەلتورەکەی و مێژووەکەی و هەموو بنەماکانی کەسێتی قەوارەی خۆی ڕەفز بکات وبیداتە دوواوە، گوایە کاروانی مێژووی نەتەوەکەی بەدرێژایی چەندین سەدە دووچاری کۆسپ و نەهامەتی هاتووە، وە هەروەها (معالم)ی کەسێتی خۆشی دوچاری نەخۆشی و ناشرین کردن و دەردو زام هاتووە، دەرەنجامی ئەم تێڕوانینە تەڵخەش تێکەڵکردنی هزرو عەقیدەوە ئامانج و هۆکارەکان ئاین و مێژوو وەبنەماکان و کەسانی هەڵکەوتوو هەروەها بەها ڕەوشتی‌یەکان و ڕووداوەکان چەملەوداب و نەریتە بۆ ماوەکان، لە بەر ئەوە عەقڵی موسوڵمان دابەش بووە بەسەر دوو گروپدا یەکێکیان بانگی لێ دەکات کە هەموو ئەو شتانە وەر گرێت و قبوڵی بکات یان هەمووی بەلاوە نابەجێ بێ وازی لێ بێنی، وە نەیتوانیوە لە بانگەشە کردنەکەیدا جیاوازی بکات لە نێوان ئاین و مێژوودا هەروەها لەنێوان ئامانج و هۆکاردا، گروپەکەی تریشیان بانگەشەی بۆ ئەوە کرد ئەو گەل و نەتەوانەی توشی دەردو بەلا لە داهاتی ماددی‌دا هاتون بێ گومان لە بنەڕتدا قەیرانەکەیان قەیرانێکی مەعنەوی‌یەوپەیوەندی بە ئاین و بەها ڕەوشتی و بناغە کەسێتی و پاڵ نەرەکانی بزواندنی‌یەوە هەیە. دروشم و بانگەوازەکان بەسەر یەکدا تێکەڵاوبوون بینیەیان هێندە تەڵخ کردووە کە تائێستاش نەتەوەی ئیسلامیمان سەر گەردانەو نازانێت ڕوبکاتە کوێ و بەرەو کوێ هەنگاو هەڵگرێ و چۆن خۆی ڕزگار بکات و بەچ لایەکدا ڕابکات.

بێ گومان دەبێ نەتەوەی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی کارەکە هەمووی لەبەرچاو بگرێت و حسابی بۆ بکات هەموو ئیسلام قبوڵ بکات هەروەك چۆن پێی گەیشتووە چەنکە قەوارەی خۆی لەوەدا دەبینێتەوەو هەروەها بنەما کەسێتی‌یەکانی خۆشی، وەناکرێ کە بەشێکی لێ فەرامۆش بکات و وازی لێ بێنی، ئاین و بەها ڕەوشتی‌یەکانمان شتێکی بنچینە بن بۆ مان، مێژوو داب و نەریت و پێشینەکانمان ڕاستی‌یەکی ئاشکران، ئەمانە واقعن و ناکرێ نکوڵی یان لێ بکرێ

یان دەست بەرداریان ببین وە بەبێ ئەوەو بەبێ دان پیانانیشمان بەوە ناتوانین پێکهاتەی کەسێتی خۆمانو بناغەی دەرونیمان تەواو بکەین یان مامەڵەیەکی دروستو دڵسۆزانە بکەین.

دۆزەکە لێرەدا ئەوە نییە کامە وەردەگرینو کامەیان وەرناگرین بەڵکو پرسیارەکە لێرەدا ئەمەیە: ئایا شوێن کاری هەریەکە لەو موفرەداتی بنەماو مێژووەمان کامەیە لە عەقلو دەروونماندا؟ پێویستە لە سەرمان ئاینەکەمان هەر هەموو وەربگرین بە عەقیدەو بنەماوییەها ڕەوشتیو چەمكو دەرچەكانییەوە، وەدەبێ هیچ شتێك وە هیچ ڕووداوێكی مێژوویيو كلاسیكيو نەفامیو دەمارگیریو لادانو بەربەستەکانی کاتو شوێن بەر چاومان لێل نەکات، تاکو نەتەوەو عەقلی ئیسلامیمان وەتێ ڕوانینی پاکو بێ گەردمان لە پەیامی ڕێنومایی خوایيەوە هەڵ بگوازین، مێژوو دابو نەریتی بۆ ماوەو پابەند بوون پێیانەوەو ڕووداوەکانو کاتو شوێنیش وەك پەندو وانەیەك سودیان لێ وەربگرینو بۆ نەخشەکێشانو تێ ڕوانینەکانمان کۆمەکمان بن، هەریەکە لەوانەش دەبنە پێشەنگو ئەزمونو ماددەیەکی گرنگ بۆ بەرچاو ڕۆشنیمان لە دووبارە کردنەوەی ئەو هەڵەو لادانو دژ وەستاندنە مرۆییانەی کە بەم زەوییەوە دەمان بەستێتەوەو کۆتو قورسایيەکانیش لە ئەستۆو بازوو گەردنمان بکەینەوە.

ئێمە توانایەکی ماددی باشو داهاتێکی زۆرو زەبەندەمان لە بەر دەستایە. ئەمەش ڕاستییە کە هیچ مرۆڤێکی ژیر نکۆڵی لێ ناکات، خاكو زەوی موسوڵمانانیش شایەتە بەخۆیو کیشوەرو دەریاو زەریاکانییەوە، کەواتە قەیرانی نەتەوەکەمان هەر لە قەوارەی خودی نەتەوەکەدایەو پەیوەندی بەبواری دەروونیو مەعنەوییەوە هەیە، بەڵام گرفتەکە لێرەدایە ئایا مەبەست کام بەشەی ئەو لایەنە دەروونییە مەعنەوییەیە؟ ئایا مەبەستیان هزرو دابو نەریتە کانی نەفامیو تیرەگەرایيە؟ یان مەبەستیان دابو نەریتەکانە؟ یاخود مەبەست پێیان خورافیاتو جادووگەری میللییە؟ ئایا مەبەستیان ئەو بگرەو بەردەو هزرییانەیە کە هاتونەتە وڵاتی موسوڵمانانەوە؟ ئایا مەبەستیان لایەنی هەناوی ڕۆمییە کەنامۆ بێت هاتبێتە ناومان؟ زۆربەی ئەوانەی لەم دەرچەیەوە دەڕوانن یان لە ڕووی نامۆی هزرو نەزانینی زانیارییەوەیە یان لە ڕووی فرتو فێلو دوژمنایەتییەوەیە، زۆربەی ئەوانەش مەبەستیان ئاینو عەقیدەی ئیسلامە.

بەو کەسانە دەڵێین کە کەوتونەتە تەڵەی نامۆی هزرو نەزانینی زانیاری بە عەقیدەی نەتەوەو کە لەپورەکەی کە بەنیازی پاکەوە تێکەوتون، بەو کەسانە دەڵێین کەمەودا لە نێوان خورافەو جادوو گەری‌و نەفامی لەگەڵ ئاینی ئیسلام‌و عەقیدەو بەها رەوشتی‌یەکانی‌دا زۆر بەرین‌و دووره، ئایا دوژمنانمان چیان لە ئاین‌و عەقیدەی ئێمە دەوێ کە هێندە بە پەرۆشن بۆ تۆڵە سەندنەوە؟ ئایا گەلانی موسوڵمان بێجگە لە عەقیدەو بەها ئیسلامیەکان بەولاوە دەتوانێت خێرو بێر لە هیچ شتێکی تردا ببینێت‌و دادی بدات؟ وەئایا لە دەروونی رۆڵەکانی ئەمرۆی نەتەوەکەماندا هیچ خێرو بێرێك دەبینرێت جگە لەو ئیسلام‌و عەقیدەو بەها رەوشتیانەی کە لەدەروونیاندا ماوەتەوە؟

ئایا ئەوانە چ شتێك لە ئایینی ئیسلام دا بە عەیب دەگرن؟

ئایا بەوە لۆمەی دەکەن کە ئیسلام بناغەی یەکتاپەرستی‌و بڕوا هێنانە بەخوای حەق‌و داد پەروەر؟ئایا دیسان ئەوە بەعەیب لەسەر ئیسلام دەگرن کە هەمیشە نیازی خێرو چاکسازی‌و داد پەروەری‌و باوەڕداری‌و جێ‌نشینێتی زەوی مەبەستە؟ ئایا لەسەر ئەوە لۆمەی دەکەن کە ئیسلام تەرازوی پاداشت‌و سزای کردەوەکانی هەڵگرتووە بۆ قیامەت؟ هەروەها لەسەر چەندین شتی تری وەك ئەوەی کە ئیسلام سەرچاوەی راوێژکاری‌و بنەمای دروست کردنی برایەتی‌یەو نیازی هاوکاری‌و رەوشت بەرزی‌و شکۆمەندی‌و پاك‌و خاوێنی‌و ئیستقامەی هەیەو داوای رێ نمایی کردن لە خوا دەکات‌و خەڵك بانگ دەکات بۆ سەر رێی راست‌و زانست‌و زانیاری؟ یان لەسەر ئەوە گلەیی‌یان لە ئیسلام هەیە چونکە بەربەرەکانی هێزی شەڕو فەسادو سەرکەشی دەکات؟ یان لەسەر ئەوەی کە ئیسلام لەسەر موسوڵمان پێویستی دەکات کە راستگۆبێ، سپاردە بپارێزێ، داد پەروەربێ، کاروبارەکانی بە رێکی راپەڕێنێ، سۆزو خۆشەویستی لە نێوان خەڵکی‌دا بڵاوبکاتەوە؟ ئەمانەی باسمان کرد دەرچەو بە هاوبنەماو ناوەرۆکی ئیسلامن جگە لەمانەو پێچەوانەی ئەمانەش نەفامی‌و سەرگەردانی‌یە یان تێکەڵ بووە بە خورافەو جادوگەری ئەگەر چی هەندێ لەو کەسانەش جۆرەها شێوازو فروفێڵ بگرنەبەرو ملی ووشە بەئارەزوو بابدەن‌و خەنجەر لەسەپرۆگرام‌و گەوێرییەکانی (الانحراف) بووە شێنن.

لێرەدا بەکورتی بەڵگەی قورئان و فەرموودە دەخەینە ڕوو تادڵنیابین لەو ڕاستییەی کە پەیامی ئیسلام چییەو چۆن دەتوانین لە پرۆگرامێکی ڕاست و دروستەوە خۆمان لە هەموو گەوێرییەکی (تێگەیشتن و ئامانجەکان) بپارێزن.

**أ - لەچاوگەکانی بەها ئیسلامیەکان لە قورئانی پیرۆزدا:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

**دەربارەی یەکتایی (ربوبییەت و ئولوهییەت):**

**ئایەتەکان:**

﴿ **أنما الله اله واحد سبحانه** ﴾ النساء: ١٧٠.

﴿ **فاعلم انه لا اله الا هو** ﴾ محمد: ١٩.

﴿ **ما اتخذ الله من ولد وماكان معه من اله** ﴾ المؤمنون: ٩١.

﴿ **فذلكم الله ربكم الحق** ﴾ يونس: ٣٢.

﴿ **ليس كمثله شيء وهو السميع البصير** ﴾ الشورى: ١١.

﴿ **ولو اتبع الحق اهواءهم لفسدت السماوات والارض ومن فيهن** ﴾ المؤمنون:٧١.

﴿ **ان الله بالناس لرؤوف رحيم** ﴾ الحج: ٦٥.

﴿ **والهكم اله واحد لا اله الا هو الرحمن الرحيم** ﴾ البقره: ١٦٣.

﴿ **ذلكم الله ربكم خالق كل شيء لا اله الا هو** ﴾ غافر: ٦٢

﴿ **هوالله الذى لا اله الا هو عالم الغيب والشهادة** ﴾ الحشر: ٢٢.

﴿ **انما الهكم الله الذى لا اله الا هو وسع كل شيء علما** ﴾ طه: ٩٨.

﴿ **هل من خالق غير الله يرزقكم من السماء والارض لا اله الا هو** ﴾ فاطر: ٣.

﴿ **ما اتخذ الله من ولد وما كان معه من اله اذا لذهب كل اله بما خلق ولعلا بعضهم على بعض سبحان الله عما يصفون** ﴾ المؤمنون: ٩١.

﴿ **لو كان فيهما الهه الا الله لفسدتا فسبحان الله رب العرش عما يصفون** ﴾ الانبياء:٢٢.

﴿ **وما خلقنا السموات والارض وما بينهما الا بالحق** ﴾ الحجر: ٨٥.

﴿ **ذلك بان الله هو الحق وانه يحيى الموتى وانه على كل شيء قدير** ﴾ الحج:٦.

﴿ **فذلكم الله ربكم الحق** ﴾ يونس: ٣٢.

﴿ ان الله يامر بالعدل والاحسان وايتاء ذى القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغى ﴾ النحل: ٩٠.

﴿ قال ياقوم اعبدوا الله ما لكم من اله غيره ولا تنقصوا المكيال والميزان ﴾ هود: ٨٤.

دەربارەی یەك ڕەگەزی ئادەمیزادو مەبەست لەبوونی و بەرپرسی ویژدانی‌دا دەفەرموێ:

﴿ يا ايها الناس اتقوا ربكم الذى خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساءا واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام ان الله كان عليكم رقيبا﴾ النساء: ١.

﴿ يا ايها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقاكم ﴾ الحجرات: ١٣.

﴿ واذ قال ربك للملائكة اني جاعل فى الارض خليفة قالوا اتجعل فيها من يفسد فيها ويسفك الدماء ونحن نسبح بحمدك ونقدس لك قال اني اعلم مالا تعلمون * وعلم آدم الاسماء كلها ﴾ البقره: ٣٠ ــ ٣١.

﴿ واذ قال ربك للملائكة اني خالق بشرا من صلصال من حمأ مسنون * فاذا سويته ونفخت فيه من روحى فقعوا له ساجدين * فسجد الملائكة كلهم اجمعون * الا ابليس ابى ان يكون مع الساجدين ﴾ الحجر: ٢٨ ــ ٣١.

﴿ قل هل يستوى الذين يعلمون والذين لايعلمون ﴾ الزمر: ٩.

﴿ وقالوا لو كنا نسمع او نعقل ماكنا فى اصحاب السعير ﴾ الملك: ١٠.

﴿ ولقد كرمنا بني ادم وحملناهم فى البر والبحر ﴾ الاسراء: ٧٠.

﴿ وصوركم فاحسن صوركم ورزقكم من الطيبات ﴾ غافر: ٦٤.

﴿ انا جعلنا ما على الارض زينة لها لنبلوهم ايهم احسن عملا ﴾ الكهف:٧.

﴿الذى خلق الموت والحياة ليبلوكم ايكم احسن عملا ﴾ الملك: ٢.

﴿ لا اكراه فى الدين قد تبين الرشد من الغي ﴾ البقره: ٢٥٦.

﴿ وما لكم لا تقاتلون فى سبيل الله والمستضعفين من الرجال والنساء والولدان﴾ النساء: ٧٥.

﴿ لا ينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم فى الدين ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم وتقسطوا اليهم إن الله يحب المقسطين * إنما ينهاكم الله عن الذين قاتلوكم في الدين واخرجوكم من دياركم وظاهروا على اخراجكم أن تولوهم ومن يتولهم فاولئك هم الظالمون ﴾ الممتحنة: ٨ - ٩.

سەبارەت بە دادو چاكسازى فەرمويەتى:

﴿ ولا تنس نصيبك من الدنيا واحسن كما احسن الله اليك ولا تبغ الفساد فى الارض ان الله لا يحب المفسدين ﴾ القصص: ٧٧.

﴿ ثم توفى كل نفس ما كسبت وهم لا يظلمون ﴾ البقره: ٢٨١.

﴿ اليوم تجزى كل نفس ماكسبت لا ظلم اليوم ان الله سريع الحساب ﴾ غافر:١٧.

﴿ ان الله لا يظلم الناس شيئا ولكن الناس انفسهم يظلمون ﴾ يونس:٤٤.

﴿ ان الله يامر بالعدل والاحسان وايتاء ذى القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي يعظكم لعلكم تذكرون ﴾ النحل: ٩٠.

﴿ كونوا قوامين بالقسط شهداء لله ولو على انفسكم او الوالدين والاقربين ﴾ النساء: ١٣٥.

﴿ واذا حكمتم بين الناس ان تحكموا بالعدل ﴾ النساء: ٥٨.

﴿ ولا يجرمنكم شنآن قوم على ألاّ تعدلوا اعدلوا هو اقرب للتقوى ﴾ المائدة:٨.

﴿ وقاتلوا فى سبيل الله الذين يقاتلونكم ولا تعتدوا ان الله لايحب المعتدين ﴾ البقره:١٩٠.

﴿ ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويامرون بالمعروف وينهون عن المنكر واولئك هم المفلحون ﴾ آل عمران: ١٠٤.

﴿ وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الاثم والعدوان واتقو الله ان الله شديد العقاب ﴾ المائدة: ٢.

﴿ وجزاء سيئة سيئة مثلها فمن عفا واصلح فاجره على الله، انه لايحب الظالمين ﴾ الشورى: ٤٠.

**له بارەی ڕوونەدان و نەبوونی (بشێوی و ستەم و زیادەڕەویش)ە وە دەفەرموێ:**

﴿ فهل عسيتم ان توليتم ان تفسدوا فى الارض وتقطعوا ارحامكم ﴾ محمد:٢٢.

﴿ ولا تفسدوا فى الارض بعد اصلاحها ذلكم خير لكم ﴾ الاعراف: ٨٥.

﴿ فاذكروا آلاء الله ولا تعثوا فى الارض مفسدين ﴾ الاعراف: ٧٤.

﴿ وما خلقنا السماء والارض وما بينهما باطلا ذلك ظن الذين كفروا فويل للذين كفروا من النار * ام نجعل الذين امنوا وعملوا الصالحات كالمفسدين فى الارض ام نجعل المتقين كالفجار ﴾ ص: ٢٧ ـ ٢٨.

﴿ قال ياقوم اعبدوا الله مالكم من اله غيره ولا تنقصوا المكيال والميزان انى اراكم بخير وانى اخاف عليكم عذاب يوم محيط * وياقوم اوفوا المكيال والميزان بالقسط ولا تبخسوا الناس اشياءهم ولا تعثوا فى الارض مفسدين * بقية الله خير لكم ان كنتم مؤمنين وما انا عليكم بحفيظ ﴾ هود: ٨٤ ـ ٨٦.

﴿ والذين ينقضون عهد الله من بعد ميثاقه ويقطعون ما امر الله به ان يوصل ويفسدون فى الارض اولئك لهم اللعنة ولهم سوء الدار ﴾ الرعد:٢٥.

﴿ فاستقم كما امرت ومن تاب معك ولا تطغوا ﴾ هود: ١١٢.

﴿ هذا وان للطاغين لشر مآب ﴾ ص: ٥٥.

﴿ ولا تطيعوا امر المسرفين ﴾ الشعراء: ١٥١.

﴿ ان فرعون لعال فى الارض وانه لمن المسرفين ﴾ يونس: ٨٣.

﴿ وان مردنا الى الله وان المسرفين هم اصحاب النار ﴾ غافر: ٤٣.

﴿ فويل للذين ظلموا من عذاب يوم اليم ﴾ الزخرف: ٦٥.

﴿ انما السبيل على الذين يظلمون الناس ﴾ الشورى: ٤٢.

﴿ ثم ننجي الذين اتقوا ونذر الظالمين فيها جثيا ﴾ مريم: ٧٢.

﴿ وقيل للظالمين ذوقوا ماكنتم تكسبون ﴾ الزمر: ٢٤.

﴿ وعنت الوجوه للحي القيوم وقد خاب من حمل ظلما ﴾ طه: ١١١.

**لەسەر ڕاستگۆیی و سپاردەو چاکەکردن: فەرمویەتی:ـ**

﴿ ان المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات والقانتين والقانتات والصادقين والصادقات والصابرين والصابرات والخاشعين والخاشعات والمتصدقين

والمتصدقات والصائمين والصائمات والحافظين فروجهم والحافظات والذاكرين الله كثيرا والذاكرات اعد الله لهم مغفرة واجرا عظيما ﴾ الاحزاب: ٣٥.

﴿ قال الله هذا يوم ينفع الصادقين صدقهم ﴾ المائدة: ١١٩.

﴿ ليجزى الله الصادقين بصدقهم ﴾ الاحزاب: ٢٤.

﴿ الذين ينفقون فى السراء والضراء والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس﴾ آل عمران: ١٣٤.

﴿ وانفقوا مما جعلكم مستخلفين فيه ﴾ الحديد: ٧

﴿ والذين يكنزون الذهب والفضة ولاينفقونها فى سبيل الله فبشرهم بعذاب اليم ﴾ التوبه: (٣٤).

﴿ وفى اموالهم حق للسائل والمحروم ﴾ الذاريات: ١٩.

﴿ والذين استجابوا لربهم واقاموا الصلاة وامرهم شورى بينهم ومما رزقناهم ينفقون ﴾ الشورى: ٣٨.

﴿ ان المصدقين والمصدقات واقرضوا الله قرضا حسنا يضاعف لهم ﴾ الحديد:١٨.

﴿ يا أيها الذين آمنوا لاتبطلوا صدقاتكم بالمن والاذى ﴾ البقره: ٢٦٤.

﴿ ولاتجعلوا الله عرضة لايمانكم ان تبروا وتتقوا وتصلحوا بين الناس ﴾ البقره:٢٢٤.

﴿ ارايت الذي يكذب بالدين * فذلك الذى يدع اليتيم * ولا يحض على طعام المسكين ﴾ الماعون: ١ ـ ٣.

﴿ يمحق الله الربا ويربى الصدقات ﴾ البقره: ٢٧٦.

﴿ وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر ﴾ العصر: ٣.

﴿ وتواصوا بالصبر وتواصوا بالمرحمة ﴾ البلد: ١٧.

﴿ ان الله يأمركم ان تؤدوا الامانات الى اهلها ﴾ النساء: ٥٨.

﴿ والذين هم لاماناتهم وعهدهم راعون ﴾ المعارج: ٣٢.

﴿ قل تعالوا أتل ماحرم ربكم عليكم الا تشركوا به شيئا وبالوالدين احساناولا تقتلوا اولادكم من املاق نحن نرزقكم واياهم ولا تقربوا الفواحش ما ظهر

منها وما بطن ولا تقتلوا النفس التى حرم الله الا بالحق ذلكم وصاكم به لعلكم تعقلون *ولا تقربوا مال اليتيم الا بالتى هى احسن حتى يبلغ اشده واوفوا الكيل والميزان بالقسط لانكلف نفسا الا وسعها واذا قلتم فاعدلوا ولو كان ذا قربى وبعهد الله اوفوا ذلكم وصاكم به لعلكم تذكرون ﴾ الانعام:١٥١ـ ١٥٢.

﴿ وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما فان بغت احداهما على الاخرى فقاتلوا التى تبغى حتى تفىء الى امر الله فان فاءت فأصلحوا بينهما بالعدال واقسطوا ان الله يحب المقسطين * انما المؤمنون اخوة فاصلحوا بين اخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمون * يايها الذين امنوا لايسخر قوم من قوم عسى ان يكونوا خيرا منهم ولا نساء من نساء عسى ان يكنَّ خيرا منهن ولا تلمزوا انفسكم ولا تنابزوا بالالقاب بئس الاسم الفسوق بعد الايمان ومن لم يتب فاولئك هم الظالمون * يايها الذين امنوا اجتنبوا كثيرا من الظن ان بعض الظن اثم ولا تجسسوا ولا يغتب بعضكم بعضا ايحب احدكم ان ياكل لحم اخيه ميتا فكرهتموه واتقو الله ان الله تواب رحيم ﴾ الحجرات: ٩ـ ١٢.

﴿ ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هى احسن﴾ النحل: ١٢٥.

سەبارەت بە زانستو مەعریفەو ئاوەدانكردنەوەش: دەفەرمویٚ:ـ

﴿ اقرأ باسم ربك الذي خلق * خلق الانسان من علق * اقرأ وربك الاكرم * الذى علم بالقلم ﴾ العلق: ١ـ ٤.

﴿ فامشوا فى مناكبها وكلوا من رزقه ﴾ الملك: ١٥.

﴿ ان الله يحب التوابين ويحب المتطهرين ﴾ البقره: ٢٢٢.

﴿ قل سيروا فى الارض فانظروا كيف بدأ الخلق ﴾ العنكبوت: ٢٠.

﴿ وسخر لكم ما فى السماوات وما فى الارض جميعا منه .. ﴾ الجاثية:١٣.

﴿ ومن رحمته جعل لكم الليل والنهار لتسكنوا فيه ولتبتغوا من فضله...﴾ القصص: ٧٣.

**له بارەی نیـــازو مەبەستی چاکــەوە: فەرمویــەتی:-**

﴿ وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا علــى الاثم والعــدوان..﴾ المــائدة:٢.

﴿ وقل اعملوا فسيرى الله عملكم ورســوله والمؤمنــون ﴾ التوبــه: ١٠٥.

﴿ فاستجاب لهم ربهم أني لا أضيع عمل عامل منكم مــن ذكــر أو أنثــى بعضكــم من بعض... ﴾ آل عمــران: ١٩٥.

﴿ إنّا لا نضيع اجر المصلحــين ﴾ الاعــراف: ١٧٠.

﴿ ومن يعمل سوءا او يظلم نفسه ثم يستغفر الله يجد الله غفــورا رحيمــا ﴾ النســاء: ١١٠.

﴿ واستغفروا ربكم ثم توبوا اليه إن ربي رحيـــم ودود ﴾ هــود: ٩٠.

**ب ـ سوننەت پراکتیك و پشتگیرییە بۆ قورئان:**

ئـەوەی لەپێشــەوە هــاتووە هــەندێ لــە چاوگــەکانی مەبەســتە گشــتگیرەکانی قورئــانی پــیرۆزبو، کــە لەفــەرمودەکانی پێغەمبــەر(ﷺ) کــرداروبەڕێوەبــەرێتی کۆمــەڵگای یەکــەم ســتاف دا ڕەنگــی دابــۆوەو جێبــەجێدەکرا. لێرەشــدا هــەندێك لەفــەرمودەکانی پێغەمبــەر بەشــاهیدو بەڵگــە لەســەر ئــەو ئایەتانــە دێنینــەوە تــا خوێنــەر بزانــێ چــۆن ئیســلام لــە کیتــابو ســوننەتدا چڕتــرو گشــت گــیرتر لەهــەر بیروبــاوەڕو ئــایینو فەلســەفەیەکی مێــژووی مرۆڤایــەتی هــەموو پێداویســتیو ئاواتــەکانی لــە خۆگرتــووە.

**له بارەی نییەتو ویــژدانو بــەهاو لێ پرســراوێتی مرۆیــی یــەوە:**

پێغەمبەری خــوا (ﷺ) دەفــەرموێ:

((انما الاعمال بالنيات وانما لكل امــرىء مــانوى))[٤].

((ان الله لا ينظــر الى اجســادكم ولا الى صوركــم ولكــن ينظــر الى قلوبكــم واعمــالكم))[٥]

((لا فضل لعربي على اعجمــي الا بــالتقوى))[٦].

((من أبطأ به عمله لم يسرع به نســـبه))[٧].

---

(٤) رواه البخاري ومسلم واصحاب السنن الاربع.

(٥) رواه مسلم واحمد وابن ماج.

(٦) رواه احمد.

(٧) رواه احمد و ابن ماجة .

((كرم المرء دينه، ومروءته عقله، وحسـب خلقـه))[٨].

((قل الحق ولو كان مـرّا))[٩].

((البر حسن الخلق والاثم ما حاك فى صدرك وكرهت ان يطلـع عليـه النـاس))[١٠].

((استفت قلبك وان افتاك المفتـون))[١١].

((الامارة امانه وهى يوم القيامة خزى وندامة الا من امر بحـق وأدّى بـالحق عليـه فيـها))[١٢].

((كلكم راع وكلكم مسؤول عـن رعيتـه))[١٣].

((افضل الجهاد كلمة حق عند سـلطان جـائر))[١٤].

((ما نقض العهد قوم الا كان القتل بينهم ولا ظهرت الفاحشـة فى قـوم قـط الا سلط الله عليهم المـوت))[١٥].

((لا تجتمع امتى على ضلالة فاذا رايتم اختلافا فعليكـم بالسـواد الاعظـم))[١٦].

((من راى منكم منكرا فليغيره بيده فـان لم يسـتطع فبلسـانه فـان لم يسـتطع فبقلبه وذلك اضعف الايمـان))[١٧].

**سەبارەت بە دڵنـەرمیو بـەزەییو هاوكـاریو ڕەوشـت جوانـی : دەفـەرموێت :**

((فان الامام أن يخطىء فى العفو خير من ان يخطـىء فى العقوبـة))[١٨].

((اتق الله حيث ماكنت وأتبـع السـيئة الحسـنة تمحـها وخـالق النـاس بخلـق حسـن))[١٩].

---

(٨) رواه البيهقى والحاكم.

(٩) رواه ابو نعيم فى الحلية

(١٠) رواه البخارى فى الادب المفرد ورواه مسلم والترمذى.

(١١) رواه البخارى فى التاريخ وهو حديث حسن.

(١٢) رواه الحاكم وصححة.

(١٣) رواه البخارى ومسلم.

(١٤) رواه احمد واصحاب السنن الاربع وكذا الطبرانى فى الكبير والبيهقى فى شعب الايمان.

(١٥) رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم.

(١٦) بهذا اللفظ رواه ابن ماجه، وروى احمد والترمذى والحاكم مثله بالفاظ متقاربه.

(١٧) رواه احمد ومسلم واصحاب السنن الاربع.

(١٨) رواه الحاكم والبيهقى.

(١٩) رواه الحاكم واحمد والبيهقى والترمذى

((ماكان الرفق فى قوم الا نفعهم وما كان الخـــرق فى قـوم الا ضرهـــم))[٢٠].

((ان الله يحب الرفق فى الامر كلـــــه))[٢١].

((من يحرم الرفق يحرم الخـــير))[٢٢].

((يسروا ولا تعسروا وبشـــروا ولا تنفـــروا))[٢٣].

((ارحم من فى الارض يرحمك مـــن فى الســـماء))[٢٤].

((فى كل ذات كبد حرَّى أجـــر))[٢٥].

((من لا يَرحم لا يُرحـــم))[٢٦].

((الخلق كلهم عيال الله فأحبهم الى الله انفعـــهم لعيالـــه))[٢٧].

((ليس منا من لم يجل كبيرنا ويرحم صغيرنا ويعـــرف لعالِمنـــا حقـــه))[٢٨].

((أَحِبَّ للنّاس ما تُحبّ لنفســـك))[٢٩].

((المؤمنون كرجل واحد ان اشـــتكى راســـه اشـــتكى كلـــه وان اشـــتكت عينـــه اشتكى كلـــه))[٣٠].

((المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولا يوبقه ومن كـــان فى حاجـــة اخيـــه كـــان الله فى حاجته ومن فرج عن مسلم كربة فرج الله بها كربة عنه مـــن كـــرب يـــوم القيامـــة ومن ستر مسلما ستره الله يوم القيامـــــة))[٣١].

((والله لا يؤمن.. الذى لا يأمن جـــاره بوائقـــه))[٣٢].

---

(٢٠) رواه البخارى ومسلم.

(٢١) رواه البخارى ومسلم.

(٢٢) رواه مسلم وابن ماجة واحمد.

(٢٣) رواه البخارى بنحوه.

(٢٤) رواه الحاكم والطبرانى فى الكبير.

(٢٥) رواه ابن ماجة واحمد.

(٢٦) رواه البخارى بنحوه.

(٢٧) رواه ابو يعلى والبزار والطبرانى فى الكبير.

(٢٨) رواه احمد والحاكم باللفظ المذكور وله طرق والفاظ اخرى.

(٢٩) رواه البخارى فى التاريخ والطبرانى فى الكبير وابو يعلى والحاكم والبيهقى.

(٣٠) رواه البخارى فى التاريخ والطبرانى فى الكبير وابو يعلى والحاكم والبيهقى

(٣١) رواه البخارى ومسلم.

((بحسب امرىء من الشر ان يحقر اخـــاه المســـلم))[33] .

((الظلم ظلمات يوم القيامـــة))[34] .

((مطل الغنّي ظلـــم))[35] .

((كبرت خيانة ان تحدث اخاك حديثا هو لك به مصدق وانت لـــه بـــه كـــاذب))[36] .

((فان دماءكم واموالكم عليكم حرام كحرمة يومكـــم هـــذا))[37] .

((كفى بالمرء اثما ان يضيع من يقـــوت))[38] .

((المعروف كله صدقـــة))[39] .

((ما نقصت صدقة من مـــال))[40] .

((لان ياخذ أحدكم حبله فيحتطب خير له من ان يسأل النـــاس أعطَـــوه أم منعـــوه))(41) .

((اليد العليا خير من اليد الســـفلى))[42] .

((ليس الغنى عن كثرة العرض ولكن الغنى غـــنى النفـــس))[43] .

((اطيب ما أكل الرجل من كســـب يـــده))[44] .

((لكـــل داء دواء))[45] .

---

(٣٢) رواه البخارى.

(٣٣) رواه مسلم وابو داود والترمذى.

(٣٤) رواه البخارى ومسلم.

(٣٥) رواه البخارى ومسلم واصحاب السنن الاربع ومالك واحمد.

(٣٦) رواه احمد وابو داود.

(٣٧) رواه البخارى ومسلم والترمذى وابن ماجة وأحمد والدارمى.

(٣٨) رواه البخارى ومسلم بنحوه.

(٣٩) رواه مسلم والترمذى بمعناه.

(٤٠) رواه الامام احمد ومسلم والترمذى.

(٤١) رواه البخارى والنسائى وابن ماجة ومالك وأحمد.

(٤٢) رواه البخارى ومسلم وابو داود والترمذى والنسائى ومالك واحمد.

(٤٣) رواه البخارى ومسلم والترمذى وابن ماجة واحمد.

(٤٤) رواه الترمذى وابو داود والنسائى واحمد والدارمى.

(٤٥) رواه البخارى ومسلم وابو داود والترمذى وابن ماجة واحمد.

((لا يورد ممرض على مصـــح))[٤٦].

((فضل العالم على العابد كفضلي علـــى ادنـــاكم))[٤٧].

((لا يلدغ المؤمن من جحر مرتـــين))[٤٨].

((من غشّ فليس منـــا))[٤٩].

((اعظم النساء بركة ايسرهن مؤونـــة))[٥٠].

((اذا أتاكم من ترضون خلقه ودينـــه فزوجـــوه))[٥١].

((النساء شقائق الرجـــال))[٥٢].

((خيركم خيركم لاهلـــه))[٥٣].

((أبغض الحلال الى الله الطـــلاق))[٥٤].

((اذا قامت القيامة وفى يد احدكم فســـيلة فليغرســـها))[٥٥].

**ج ــ جياكردنەوەی نێوان هزری و هۆكارەكان لەگەڵ دۆزی بەهاو مەبەستەكان:**

وەك لەوەو پێش باسمان كردو بۆمان ڕوون بووەوە كە بێ گومان هیچ كەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی ئەم بەهاو بنەماو دەرچەو عەقیدانە بكات لە بەر پاكو تەواویان هەر كەسێكیش بەر هەڵستی لەوانە بكات كەس گوێی لێ ناگرێت. بەلام فێڵ بازەكان ئەوانەی كە دەیانەوێ فێڵو تەڵەكە لە موسوڵمان بكەن مەبەستیان ڕەخنە گرتنو بەر هەڵستی نییە لەو شتانەی كە باسمان كرد بگرە هەر لەو بارەیەشەوە نادوێن زۆرێك لەو مەبەستو واتایانە (دۆستان) بانگەشەیان بۆ كردو دوژمنان ئینكاریو سوكایەتیان پێ كرد، وە نەتەوە بێ بەش بوو لەوەی كە خۆی

---

(٤٦) رواه ابن ماجه.

(٤٧) رواه الترمذی.

(٤٨) رواه البخاری ومسلم وابو داود وابن ماجة واحمد.

(٤٩) رواه الترمذی وصححه.

(٥٠) رواه البیهقیوالحاكم.

(٥١) رواه الترمذی وابن ماجة والحاكم والبیهقی.

(٥٢) رواه ابو داود والترمذی واحمد والدارمی

(٥٣) رواه الترمذی وابن ماجة والطبرانی فی الكبیر.

(٥٤) رواه ابو داود وابن ماجه والحاكم.

(٥٥) رواه احمد.

بەو مەبەستو واتە بەرزانە بڕازێنێتەوە بەهۆی نەفامیو بێ ئاگابوونی لە هۆکارو شێوازەکانی پەروەردەو مەشق لە بواری فێرکردنو مەشقی تازە پێ گەیشتووانو مومارەسەکردنی ڕۆڵەکانی نەتەوەو لەسەر ئەو مەبەستو مانا بەرزانە. عەقیدەی ئیسلام بەلای دوژمنانی ئیسلامو ئەوانەی کە لێی ناحاڵین بریتییە لە باسو خواس سەبارەت بە مومارەسەی خۆ ڕاهێنان لەسەر پاڵ لێ دانەوەو پشت بەستنو سەرکەشی، هەروەها تاوانەکانی ستەم کاریتی سیاسیو کردەوە نالەبارەکانی کەم تەرخەمی هزریو دەرونی، وەدەست درێژییەکانی بازرگانە کۆیلە فرۆشەکانو باوو نەریتەکانی سوکایەتی کردن بە ئافرەتو کەم کردنەوەی ڕێزو شکۆیان. عەقیدەی ئیسلام بەلای ئەو جۆرە کەسانەوە ئەو باسو خواسانە دەگرێتەوە کە پەیوەندی بە ڕێ لادانی موسوڵمانانەوە هەیە وە بریتییە لە مێژووی هەڵەو کەم تەرخەمییەکانی موسوڵمانان، هەروەها باسکردنی باوو نەریتەکانو ئاسەوارە بەجێ ماوەکانی سەردەمی نەفامیو دەمار گیرییان، باس لە خاوبوونەوەی هزرو کەمو کوڕی پرۆگرامیان دواتر باس کردنە لە پەککەوتنو لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانەی موسوڵمان لە توێژینەوەو چارەسەر دانانو بە جێ هێنانەکەیدا بەم جۆرە باس لە عەقیدەی ئیسلام دەکەن.

بە باشی دەزانین کە لێرەدا بە خێرایی چاو بخشێنین بەو گەلانەی کە هاتنە ناو ئیسلامەوە ئەگەر چی لە سەردەمەکانی شکست هێنانیشدا بوو، وە ئەوەی ئەم گەلانە هێنایانە دیو دەستیان کەوت دەگەڕێتەوە بۆ گەورەیی ئیسلامو بنەماو دەرچەکانی، وە ئەو بارو دۆخەی کە بەسەر ئەم گەلە موسوڵمانانەدا هات لەلادانو تێك شکان سەرەڕای بەهاو بنەما ئیسلامیەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ چڵكو پاشماوەی ڕابردوویانو ئەو هۆکارە بیانیانەی کە هاتنە ناویانەوە لە کاتێکدا ئیسلامیش بەلایەوە پەسەند نەبوو پێچەوانەی ئاراستەو ئامانجەکانیشی بوو، خۆ ئەگەر ئەو ماناو مەبەستە ئیسلامییە پیرۆزانە لە قوڵای دەرونی خەڵکەکەدا نەمایەتەوە ئەوا بێگومان پشکی گەلانی موسوڵمان تاریکترو خراپترو نەفام تر دەبوو.

هەروەها گرنگە دەرك بەم ڕاستییەش بکەین کە لایەنی کەم تەرخەمی لە ژیانی موسوڵماناندا ناگەڕێتەوە بۆ بەها ڕەوشتییەکانو ئامانجەکانی خودی ئیسلام خۆی، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هزرو عەقڵی موسوڵمانان، باس کردنیش سەبارەت بە کەم تەرخەمیو چاك سازی لە ڕاستیدا باس کردنە لە عەقڵو هزری

موسوڵمان وه باس كردنه له چۆنێتی بەكارهێنانی ئەو عەقڵو هزرەی موسوڵمان له دابەزاندنو پەیرەو كردنی بەهاو بنەماكاندا لەنێو كۆمەڵگەو رێكخستنو واقیعو رووداوەكاندا، جیاوازییەكی زۆر هەیەلە نێوان بنەمای گرتنە خۆو هاوكاری لەگەڵ رێكخستنو بەجێ هێنانەكانیان یان كەم تەرخەمی كردن لەو رێكخستنو بەجێ هێنانەدا، هەروەها جیاوازیش هەیە لە نێوان مەبەستەكانی شەریعەتو سیاسەتەكانیدا هەروەها بنەما شەرعییەكانو بەهاكانیان لەگەڵ بەجێ هێنانیانو رێكخستنیان، بەهاو بنەماو مەبەستەكان بەشێكن لە گشتی بوونو بە فیگرەتی پاكدا درێژ بوونەتەوە بەرێكو پێكی بە پانتایی كاتو شوێن دا، واتە بۆ هەتا هەتا بنو رەهەندەكانی كاتو شوێن بەریان ناگرێت، بەلام بەجێ هێنانو رێكخستنەكانو سیاسەتو جێ بەجێ كردنەكان لە كاتو شوێنەوە دەردەچن بەرەو بەهاو بنەماو مەبەستەكانی ئەسڵی فیگرەتو هەموانەیی

هەموو ئەمانە ئەوەمان بۆ روون دەكەنەوە كە جیاوازی نێوان عەقیدەو بەهاو بنەماكان لەلایەكەوەو نێوان هزرو چەمكو جێ بەجێ كردنو گونجاندنیان یان لادانو كەم تەرخەمی كردن تیایاندا جیاوازییەكی بنچینەیی حەددیە، هیچ بوارێك نییە بۆ تەلخ كردنی مەبەستو واتاكانیان یان لێل كردنی تێروانینیان گەر بمانەوێ ئاراستەی خۆمان راست بكەینەوەو كارو بارەكانمان چاك بكەینو بەرەو ئامانجەكانمان بكەوینە رێو سنورێك بۆ زەحمەتو ماندووبوونەكانمان دابنێین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە قەیرانی نەتەوەكەمان قەیرانی هزرە نەك قەیرانی عەقیدە وە قەیرانی پرۆگرامە نەك قەیرانی ناوەرۆكی پرۆگرام، هەروەها دژی هۆكارەكانە نەك دژی ئامانجو مەبەست.

لێرەوە پێویستە لە سەرمان كە توێژینەوەیەكی راستو دروستو تەقەلایەكی دڵسۆزانە بدەین، وە بەوەش سنورێك بۆ ئەو بارنە بەتاڵانە دابنێین كە تەنها وامان لێ دەكەن كوێرانە دوای خەڵكو ئەو بانگەشە پوچەڵو تراویلكە خەڵە تێنانە بكەوینو وازیش لە لاسای كردنەوەی بێ هودە بهێنین.

## ٢ـ دابڕانی هزری زەمینەی دۆگمایەتیو لاسایی كردنەوەو دوا كەوتنە

بۆمان دەركەوت كە قەیرانی هزری موسوڵمانو عەقڵو پرۆگرامی موسوڵمان لە ئارادایە ئەوەش بە ئاشكرا دیارە بەتێ پەڕ بوونی كاتو بە دوا یەكاهاتنی نەوەكانو گۆشكردنیانو گۆڕینی مل ملانێكان روون بویەوە تائیتر وورده وورده تەمو مژی نێوان خەیاڵو واقیع

ڕەوی‌یەوە بە ڕادەیەك كە چاو هەڵەی تیا نەكات‌و بە باشـی ببینێت، مەبەستەكانی بوونـە ئاوات‌و خۆزگـە، دەست كـەوت‌و تواناكـان بـوون بـە مێـژوو یـادەوەری، مایـە پـوچ بوونـی كۆمەڵگەو سەركردە سیاسەیەكانی بو بە شتێكی ڕون‌و ئاشكرا كاتێ نەتەوە شكستی هێناو كەوتە دەست دوژمنانی، هەروەها مایـە پـوچ بوونـی سـەركردە هزری‌یەكانیشی دەركـەوت تەنانەت نەیان توانی جارێكی تر جڵەوی پێش بڕكێ‌و تازە كردنـەوەی ووزەی شارستانێتی نەتـەوە بگرنـەوە دەسـت بـۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەی ئـەو هێرشـە ڕۆشـنبیری‌و ژیاری‌یانـەی دەكرێتە سەر موسوڵمانان، ئیتر پێویست بوو ئەو ڕەوتـە مێژوویی‌یـە بناسـێت‌و بزانێت كـە نەتەوەو سەركردەكانی گەیاندە ئەو هەڵوێستانەی كە تیایدا وەستاوە.ڕون‌و ئاشـكرایە كـە ئاسۆی ئەو شارستانێتی‌یەی لـە دوێنـێ‌دا نەتەوەكـەمان پـێ‌ی گەیشـتبوو بـەرەنجامی ئـەو تەكانە گەورەیەیـە كـە لـە سـەرەتای سـەر هـەڵدانی ئیسلامەوە كـاری بـۆ كـرا پاشمـاوەی ئاسەوارەكانیەتی كە لە چەمك‌و سیاسەت‌و ڕێكخستنەكانیدا، بێ گومان پشكۆكان خـامۆش دەبنـەوەو، جـم‌و جۆڵـەكانیش بـەرەو سـارد بوونـەوە دەچـن بـەگۆڕانی بارودۆخـەكان، و سـەرهەڵدانی هۆكارەكـانی بـەرگری‌و، هـەروەها كـاتێ (معـالم) و ئاراسـتەی ڕوو بەڕووبوونەوەكان دەگۆڕێن. لەم بارەشـدا ڕێنوێنـی كـاركردن وە ناسنامەی كـاركردن‌و وون بوو ووزەی تازە گەری‌و پـاڵ پێوەنان كـەم بویـەوەو نـەما ئەمانـەش بـەهۆی لێك ترازانـی سەركردایەتی سیاسی لە سەركردایەتی هـزری‌و نـاڕێكی نێـوان سـوڵتان‌و زاناكـان‌و دروست بوونی كە لەبەر لە نێوانیـاندا، كـە بـووە هـۆی سـەر هـەڵدانی لاسـایی كردنـەوەی كوێرانـەو بەجێ هێنانی هـەرچی بـێ نـاوەڕۆك‌و قـوڵ بوونـەوە لـە ڕوو كـار گـەرایی شـتەكان‌و شوێن كەوتنی حەز‌و ئارەزووەكان‌و گەڕانەوە بـۆ نەریتـە نەفامی‌یەكان، بـێ گومـان لـەو بارەشدا بەدور نازانرێت كە كاروانەكە خاوبێتەوەو بەلایشیەوە گران بێ كـە ڕوو بـەڕووی ئـەو هـەموو كۆسپ‌و مل ملانێ یان ببێتەوە، تا لە ئاكامدا وردە وردە نەتەوە پەكی كـەوت‌و نـەیتوانی درێژە بەكارەكەی بدات لە ڕووی گەشەپێ‌دانی زانسـت‌و زانیاری‌یەكانی پـەرە پێدانـی دام‌و دەزگاكـانی‌و بەرهـەم هێنـانی نەخشـەو هۆكـارو سیاسـەت گـەلێك تابگاتـە ئاسـۆی شارسـتانی‌یەتێكی گەشەسـەندووی ئـەوتۆ كـە وەڵامـی بـارودۆخ‌و پێداویسـتی‌و توانـا پێشكەوتووە گۆڕاوەكان بداتەوە.

هەر لەو كاتەوە كە هەردوو سەركردایەتی سیاسـی‌و هـزری لێـك تـرازان‌و سەركردایەتی هزریش تووشی دابڕان بوو، نەتـەوەش بـەخۆی‌و جـم‌و جۆڵـە كۆمەڵایـەتی‌و ژیارییەكانیـەوە

وەك مشە خۆرێك لەسەر پاشماوەی بونیادو پەیکەری خانوی سیاسەت و کۆمەڵایەتی چاخی سەرەتای ئیسلام ژیاوە تا بەردەوام بێ لە دژوارێتی‌دا لەگەڵ هۆیەکانی لادانی سیاسی و هێزی و شارستانی و کە بەلاشەی نەتەوەو سەرکردە سیاسی و کۆمەڵایەتی‌یەکانی‌دا دێت و دەچێ، لەپاڵ ئەمەشدا گۆڕانکاری بارو دۆخەکان و کۆمەڵگەو مل ملانێکان تا بونیادی ئیسلامی هیچی بۆ نەمایەوە مەگەر تەنها چەند شتێکی عاتفی یان ئەو شتانەی کە هەندێ لە خەڵکی لە بۆنەو ئاکارو یادە ئاینی‌یەکاندا دەیکەن.

بەڵام سەرکردایەتی هێزی بەهۆی داڕانی وە بەهۆی ئەو گەمارۆیەی بەسەریدا سەپێنراو دوور لە بەر پرسیارێتی سیاسی و کۆمەڵایەتی نەتەوە، ناچار وردە وردە بەرەو دەقە ئاینی‌یەکان ڕێگەی گرت، تاکەوتە توێژینەوەیان و دەستی دایە زانستی دەقەکان و زانستی زمانەوانی عەرەبی پێویست بۆ پارێزگاری کردن ئەو دەقانەو چاودێری کردنیان تاگوم نەبن و دوژمنان دەستیان پێ نەگات، لەبەر ئەوە زانیاری‌یەکانی دەقە قورئانی‌یەکان و دەقەکانی فەرمودەو دەقی زمانەوانیاندان، پاشان زانستی فیقە سەری هەڵدا لە شێوەیەك تەنها اە مومارەسەی تاکە کەسی لە بواری پەرستشەکاندا یان لە بواری مامەڵەی ڕۆژانەدا پیادە دەکرا، بەم پێیەش ئەم زانستانە زیاتر وەك ڕاڤەکردن و وەصفی مومارەسە کردنێکی دوور لەو تێڕوانین و وردە کارییەی لە سەردەمی پێغەمبەرو یاوەرانی‌دا لە سەری بوون، چونکە ئەوان بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ ئیسلامدا نەدەکرد، پاشان زانستی فقەو جێ بەجێ کردنی لە کاروباری ڕۆژانەشدا جیاکرایەوە لە زانستی عەقیدەو تێ ڕوانینی گشتی گەردوونی و شارستانێتی، ئیتر دەورێکی ئەوتۆ بۆ عەقیدەو زانستی عەقیدە نەمایەوە کە شایەنی باس بێ و کاریگەری هەبوبێت لە بەرەو پێش بردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕێ نومایی و بەڵگەیەکیش بێ بۆ دەست پێشخەری کردن و جم و جوڵی ئەو بوارانە، بەڵکو لە جەوهەردا گۆڕا بۆ زانستی لێك چونەکان و ناڕوون و ئاڵۆزەکان ئەو دیالێکتیکانەی کە عەقڵی موسوڵمان دەخەنە بەر هەڵمەتی شەپۆلە چڕو پڕەکانی ئەو غەیبیاتەی کە نەلەو ئاستەدایەو نەلە توانا شدایە دەرکی پێ بکرێ وە لە زۆربەی بارودۆخەکانی ژیانیشدا دەبێتە هۆی ئیفلیجی و لادانی عەقڵی موسڵمان لە پێکانی مەبەستەکانی لە ڕووی کاروباری ڕۆژانەیەوە وەك خەلیفەی سەر زەوی.

تەنانەت بنەچە گەورەکانی ئیسلام و عەقڵی موسوڵمان و بناغەکانی هێزو ئاڕاستەی جم و جوڵ و کردارەکانیشی بوو بە دوو بەشەوە لە کاتێکدا ئەوانە ڕابەری کاریگەرو زیندوی

عەقڵو هزری موسوڵمان بوون لە سپێدەی ئیسلام دا، بەشی یەکەمیان ئەوانەن کە پەیوەندییان بە دەقەکانەوە هەیە وە پێیان دەوترێت ئوصولە بنچینەییەکان، دووەمیشیان پێی دەوترێ ئوصولە پلە دووەکان ئەویش ئەوانە دەگرێتەوە کە پەیوەندی بە دەرچەو یاسا پێویستییەکانی تێڕوانین لە واقعی ژیانی کۆمەڵایەتیو مامەڵەکردن لەگەڵ سروشتی شتەکانو ئەو بارو دۆخانەی بە سەریان دێت هەیە.

بەم شێوەیە ئوصولو ئەو پرۆگرامانەی تایبەت بون بە دەقەکانەوە پەرەیان سەند تابون بە زانستو مەعریفەیەکی تەواو، بەڵام ئەو ئوصولو پرۆگرامانەی تایبت بون بە بارو دۆخو واقعی سروشتی شتەکان فەرامۆش کرا،لە گەڵیدا ئەو زانستو مەعریفەیەی کە پەیوەندی بەوانیشەوە هەبو هەر فەرامۆش کرا لەبەر ئەوە زانستییەکانی کۆمەڵگا وەك پێویست بەمانا ڕاستەقینەکەی خۆی تەریب بە زانستەکانی تر گەشەی نەکرد بەو شێوەیەی کە ئیسلام دەیەوێت. بەم پێیە زانستی سیاسەتی ئیسلامیش گەشەی نەکرد، زانستی پەروەردەیی ئیسلامیانەو زانستی ئابوریو ڕاگەیاندنو کارگێڕیشی بەهەمان شێوە. زانستی مەنهەجی ڕێكو پێکیش تەنها بریتی نییە لە ئەندێشەو تێ ڕوانینو بیرو بۆ چونی پەرشو بڵاوی بێ پرۆگرام.

پێ گەیاندنو ئامادەکردنی کادری کۆمەڵگەی موسوڵمانیش، بنیات نانی سستەمەکانیو، نەخشەی کاروباری سیاسیشی بوو بەشتێکی زۆر کاریانەو بەرەو پێش چونی نەتەوەشی لەگەڵ خۆیدا تێك ڕماند، بەوەش دامو دەزگاکانی ڕوخاندو لەگەڵ خۆیدا جۆری کادرەکانیشی داڕوخاند.

جیاوازی لە نێوان ئەندێشەو تێ ڕامانی سەر کێڵانەی کۆمەڵایەتی لەگەڵ توێژینەوەی زانستیانەی کۆمەڵایەتیدا ئەوەیە کە توێژینەوەی زانستیانەی کۆمەڵایەتی توێژینەوەیەکی ڕێكو پێکە لە واقعو سروشتی شتەکانو فکرەی گەردوونییەوە سەرچاوە دەگرێت بەرەو ئامانجو مەبەستو بەها بەرزەکان، وە ئەم توێژینەوانە بەپێی واقعو هێنانەدی داخوازییە ویستراوەکان ڕێك دەخرێن، وە خۆ حەشارنادەن لە پشت کۆمەڵێ واژەو بانگەشەو ئاواتو یادەوەریدا وەك ئەمڕۆ وای بەسەر هاتووە.

قەیرانی عەقڵی موسڵمان قەیرانی هێنانەدی مەبەستو ئامانجە پیرۆزە ئیسلامییە کانو، بەرجەستەکردنی بنەماو بەهاکانە، ئەمەش لە ناوەرۆکدا قەیرانێکی هزرییە، ئەو

پرۆگرامگەراییە زانستی‌یەیە کە نەتەوە لە بواری توێژینەوەی کۆمەڵایەتی‌دا فەرامۆشی کردووە.

قەیرانی هزری موسڵمان وەك ئەمڕۆ لە بەرچاوە قەیرانی نەبوونی پرۆگرامێکی زانستی کۆمەڵایەتی‌و بنیات نانی ئەو زانستە کۆمەڵایەتی‌یانەیە - کە هاوشان لەگەڵ ناسینی واتاو مەبەستی دەقەکان - فریای نەتەوە دەکەوێت‌و فێری مەعریفەی دەکات سەبارەت بە سروشتی شتەکان‌و فکرەت‌و واقعی بارو دۆخی نەتەوە لە هەموو کات‌و شوێنێکدا تانەتەوە بتوانێ هزری خۆی بنیات بنێتەوە ئەو سستەم‌و دامەزراوەو سیاسەتانەش بنیات بنێتەوە کە ئیسلام وەك مەبەست‌و ئامانج هەروەها وەك بنەماو بەها بەرزەکان دەیەوێ.

لە کاتێکدا ئێمە باسی زانستە کۆمەڵایەتی‌یەکان دەکەین، ئەوا لێرەدا مەبەستمان لەو بوارانەیە کە توێژینەوەی مەنهەجی ڕووی تێدەکات‌و دەیگرێتەوە، نەك بەو ڕشتە(١) خۆرهەڵات‌و خۆرئاواییەی کە لەم بوارەدا خراوەتە گەڕ، بێگومان عەقلی موسڵمان لە کاروانی بەرەو پێش چونی‌دا ئەو ڕێگەیەو ڕشتەیە دەگرێتەبەر کە لەگەڵ خۆیدا دەگونجێت‌و بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و تێروتەسەل ئامانج‌و مەبەستەکانی دێنێتەدی هەڵبەتە ئەوەش لەو دەرچەیەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئیسلام مەعریفەیەکی تێروتەسەل‌و گشتگیرانەی هەیە.

باسکردنی دوور و درێژ سەبارەت بە کێشەو دۆزەکانی زانست‌و زانیاری‌یە کۆمەڵایەتی‌یە ئیسلامی‌یەکان یان ئەو شتانەی کە ئەمانە دەگرێتەوە کارێکی پێش وەختەو ڕنگە هێشتا بۆ ئەوە زووبێ، پێ دەچێت ڕۆژگاری ئایندە وردە وردە پەردە لەسەر ئەوانە لابدات‌و (معالم)و قوڵ بوونەوەکانیان دەربخات، جا ئەمڕۆ بە هەر ڕشتەیەك دەست پێ بکەین مەبەستمان دەست پێکردنە لە خاڵێکی زانراوی سود گەیاندن لەو شتانەی کە مرۆڤایەتی بەدەستی هێناوە. وە ئەوەی کە لێەدا گرنگە پێویستە خاڵی دەست پێکردنمان بە ڕەسەنایەتی‌و کامڵ کرانەوە بناسرێتەوە تاکو کاروانی بەرەو پێش چونمان دووربێت لەو لاسایی کردنەوەیەی کە قاچمانی ئاڵاندە پەت‌و داوەکانی ئاواتە خوازین کە پێمان لێ یان بترازێ‌و دەربازبین.

---

(١) ڕشتە: صيغة

## پرۆگرامی کلاسیکی بۆ هزری ئیسلامی: ڕەخنەو هەڵسەنگاندن

لەوەو پێش بۆمان روون بووەوە کە چۆن چارەسەرە کلاسیکیە مێژوویی و بیانی یەکان بە درێژایی مێژوو شکست هێنانی خۆی سەلماند، وەچۆن نەیتوانی ببێتە نمونەی دەرچەیەکی ڕاستو دروست بۆ چاکسازی هەرچەندە زەمەن درێژە بکێشی و ئەزمونەکان دوبارە ببنەوە، هەروەها بۆمان رون بووەوە کە قەیران تەنها قەیرانی تواناکانو داهاتەکان نین بەڵکو قەیرانەکە لەلایەنی مەعنەویی نەتەوەدایە.

هەروەها بۆمان رون بووەوە کە قەیرانی مەعنەویی نەتەوەکەمان قەیرانی عەقیدەو بەهاو بنەماکان نیە، بەڵکو قەیرانی هزرو پرۆگرامە، و ئەم قەیرانە زۆر دەمێکە دەستی پێکردووەو ڕەگەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکاری بنکەی سیاسی و ئەو دابڕانەی سەرکردایەتی هزری کە لەلێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی وازی هێنا، ئەمەش بوە هۆی چەق بەستنی گەشەی بزافی هزری و زانستیی پەیڕەو گەرایی و کۆمەڵایەتی، بەمەش نەتەوە لەکەژاوەی گۆڕنکاری و پەرەسەندنو بەرەنگاری شارستانی یە گەورەکان دواکەوت.

بەمە بۆمان دەردەکەوێ کە قەیرانەکە (قەیرانی توانای گەیشتنەوە بە کەژاوەی گۆڕانکاریەکانو تەحەددای شارستانیەت) تەنها بەڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی عەقڵی موسڵمانو ڕاستکردنەوەی دەرچەکانی هزری موسڵمانو بنیاتنانی پرۆگرامگەرایی زانستیی و کۆمەڵایەتیی نەبێ چارەسەر ناکرێ بۆئەوەی موسڵمان شیاوبێت بۆ مامەڵەی تەواو لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی و هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن پێیەوە لەبەرکەوتو ڕووداو بەرەنگاری و پەیوەندی و فیطرەتەکان....، چونکە هەرکاتێ پرۆگرام ڕاست کرایەوە واتە هزریش ڕاست کراوەتەوە، دەتوانێت نەتەوە تەیاریکات بە ووزەی پێویست بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکانی دابینکردنی پێداویستییەکانی بەڕادەیەك کە بتوانێت سودی لێ وەربگرێت لەهەوڵەکانی بنیاتنانو چاکسازی و ئاوەدانکردنەوەو بەرەنگاربوونەوەی تەحەددیات دا.

لەبەر ئەوە پێویستە لەو دەرچەیەوە بڕوانین کە کاروبارەکانی پرۆگرامگەرایی عەقڵو هزری موسڵمان تیایدا گەلاڵە دەبێ تالێیان بگەینو لە نزیکەوە کەمو کورتی‌یەکانیان ببینین تابتوانین وێنەی چەند هێڵێکی بنەمایی گشتی بکێشێن بۆ چاکسازیو دارشتنی بنکەو ڕێسا بۆیان.

## ١- بنەماکان: پێناسەو ڕوون کردنەوە:

لێرە مەبەستمان لەپرۆگرامی مێژوویی بۆ هزری ئیسلامی ئەوەیە کە ناسراوە بەزانستی (ئوصولی ــ فیقه)، ئەوەش بەگرنگترین بەشی پرۆگرامگەرایی بنچینەی دادەنرێ لەبارنەی توێژینەوە ئیسلامی‌یەکاندا، ئەشتوانین ناوی بنێین پرۆگرامی کلاسیکی گەر تێبینی بێ هەڵوێستی توێژەرانی ئەم زانستەو ئەوانەی کە پەیوەستن پێوەی بکەین لەسەردەمەکانی پاش چەرخی یەکەمو چەرخی ئیجتیهاددا، هەڵوێستیان هەڵوێستی شوێن پێ هەڵگرتنو لاسایی‌کردنەوە بووە وەصف.

وە بناغەو بنچینە گشتی‌یەکانی پرۆگرام، بە شێوەیەکی گشتیو لە بنەڕەتدا هەڵوێستێکی ڕەسەنی سروشتیی هزری ئیسلامی تیایاندا ڕەنگ دەداتەوە لەگەڵ ئەو پەیوەندی‌یەی کە هەیەتی بە ئاینو پەیامی ئیسلام، ئەم گیانەش بەباشترین بەرجەستە بووە لەهزری سەردەمی جێنشینە ڕاشدی‌یەکانو پابەندییانو بونیانو ڕێکخستنیانو ئەو ئیجتهادانەیاندا کە سروش بوەتە سەرچاوەی ئاراستەکردنو ڕێنمایی کردنیان، عەقڵو ئیجتیهادیش ئامێرێکن بۆ تێگەیشتنی سروشو باش وەرگرتنی وە بۆ توێژینەوەی سروشتو ڕووداوەکان بۆ بەرهەمهێنانی ڕێگەچارەو سستمو ئەحکامو سیاسەتەکان.

وە لەسەردەمی ئیجتیهادی دواتر سەرەتای لێک ترازانی نێوان سەرانی سیاسیو هزری‌دا پیاوانی هزری ئیسلامی ئەو کاتەش هێشتا نزیک بون بە سەردەمی پەیامو خەلافەو مومارەسەکردنی‌یەوە، بۆیە دەبینی کە متمانەو دانراوەکانیان لەسەر بنەمای ئەم پرزگرامە بووە، بەلام بەهۆی ئەو دابڕانە سیاسی‌یەی کە دەستی گرت بەسەر دەزگاکانی‌دا هێدی هێدی بەرەو کارکردن لەبواری نوسینو لێکۆڵینەوەو وانەو ئەژادکردنی لایەنە تایبەتی‌یەکانی توێژینەوەکانی دەقە قورئانی‌یەکانو سوننەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر کەوتنە ڕێ، لەوەی کە پەیوەندی بە کاروباری تاکەکانەوە هەیە لەپەرستشو مامەڵەکردن،

## پرۆگرامی کلاسیکی بۆ هزری ئیسلامی: ڕەخنەو هەڵسەنگاندن

لەوەو پێش بۆمان ڕوون بووەوە کە چۆن چارەسەرە کلاسیکیيە مێژوويیو بيانیيەکان بە درێژایی مێژوو شکست هێنانی خۆی سەلماند، وەچۆن نەیتوانی ببێتە نمونەی دەرچەیەکی ڕاستو دروست بۆ چاکسازی هەرچەندە زەمەن درێژە بکێشیو ئەزمونەکان دوبارە ببنەوە، هەروەها بۆمان ڕون بووەوە کە قەیران تەنها قەیرانی تواناکانو داهاتەکان نین بەڵکو قەیرانەکە لەلایەنی مەعنەویی نەتەوەدایە.

هەروەها بۆمان ڕون بووەوە کە قەیرانی مەعنەویی نەتەوەکەمان قەیرانی عەقیدەو بەهاو بنەماکان نیە، بەڵکو قەیرانی هزرو پرۆگرامە،و ئەم قەیرانە زۆر دەمێکە دەستی پێکردووەو ڕەگەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکاری بنکەی سیاسیو ئەو دابڕانەی سەرکردایەتی هزری کە لەلێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی وازی هێنا، ئەمەش بوە هۆی چەق بەستنی گەشەی بزافی هزریو زانستیی پەیڕەو گەرایيو کۆمەڵایەتی، بەمەش نەتەوە لەکەژاوەی گۆڕنکاریو پەرەسەندنو بەرەنگاری شارستانیيە گەورەکان دواکەوت.

بەمە بۆمان دەردەکەوێ کە قەیرانەکە (قەیرانی توانای گەیشتنەوە بە کەژاوەی گۆڕانکاریەکانو تەحەددای شارستانیەت) تەنها بەڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی عەقڵی موسڵمانو ڕاستکردنەوەی دەرچەکانی هزری موسڵمانو بنیاتنانی پرۆگرامگەرایی زانستییو کۆمەڵایەتیی نەبێ چارەسەر ناکرێ بۆئەوەی موسڵمان شیاوبێت بۆ مامەڵەی تەواو لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتیو هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن پێیەوە لەبەرکەوتو ڕووداو بەرەنگاریو پەیوەندیو فیطرەتەکان.....، چونکە هەرکاتێ پرۆگرام ڕاست کرایەوە واتە هزریش ڕاست کراوەتەوە، دەتوانێت نەتەوە تەیاریکات بە ووزەی پێویست بۆ ئەنجامدانی چالاکیيەکانی دابینکردنی پێداویستییەکانی بەڕادەیەك کە بتوانێت سودی لێ وەربگرێت لەهەوڵەکانی بنیاتنانو چاکسازیو ئاوەدانکردنەوەو بەرەنگاربوونەوەی تەحەددیات دا.

لەبەر ئەوە پێویستە لەو دەرچەیەوە بڕوانین کە کاروبارەکانی پرۆگرامگەرایی عەقڵو هزری موسڵمان تیایدا گەڵاڵە دەبێ تالێیان بگەینو لە نزیکەوە کەمو کورتی‌یەکانیان ببینین تابتوانین وێنەی چەند هێڵێکی بنەمایی گشتی بکێشین بۆ چاکسازی‌و دارشتنی بنکەو ڕێسا بۆیان.

## ١- بنەماکان: پێناسەو ڕوون کردنەوە:

لێرە مەبەستمان لەپرۆگرامی مێژوویی بۆ هزری ئیسلامی ئەوەیە کە ناسراوە بەزانستی (ئوصوڵی ــ فیقه)، ئەوەش بەگرنگترین بەشی پرۆگرامگەرایی بنچینەی دادەنرێ لەبازنەی توێژینەوە ئیسلامی‌یەکاندا، ئەشتوانین ناوی بنێین پرۆگرامی کلاسیکی گەر تێبینی بێ هەڵوێستی توێژەرانی ئەم زانستەو ئەوانەی کە پەیوەستن پێوەی بکەین لەسەردەمەکانی پاش چەرخی یەکەمو چەرخی ئیجتیهاددا، هەڵوێستیان هەڵوێستی شوێن پێ هەلگرتنو لاسایی‌کردنەوە بووە وەصف.

وە بناغەو بنچینە گشتی‌یەکانی پرۆگرام، بە شێوەیەکی گشتی‌و لە بنەرەتدا هەڵوێستێکی ڕەسەنی سروشتیی هزری ئیسلامی تیایاندا ڕەنگ دەداتەوە لەگەڵ ئەو پەیوەندی‌یەی کە هەیەتی بە ئاینو پەیامی ئیسلام، ئەم گیانەش بەباشترین بەرجەستە بووە لەهزری سەردەمی جێنشینە ڕاشدی‌یەکانو پابەندییانو بونیانو ڕێکخستنیانو ئەو ئیجتهادانەیاندا کە سروش بوەتە سەرچاوەی ئاراستەکردنو ڕێنمایی کردنیان، عەقڵو ئیجتیهادیش ئامێرێکن بۆ تێگەیشتنی سروشو باش وەرگرتنی وە بۆ توێژینەوەی سروشتو ڕووداوەکان بۆ بەرهەمهێنانی ڕێگەچارەو سستمو ئەحکامو سیاسەتەکان.

وە لەسەردەمی ئیجتیهادی دواتر سەرەتای لێك ترازانی نێوان سەرانی سیاسی‌و هزری‌دا پیاوانی هزری ئیسلامی ئەو کاتەش هێشتا نزیك بون بە سەردەمی پەیامو خەلافەو مومارەسەکردنی‌یەوە، بۆیە دەبینی کە متمانەو دانراوەکانیان لەسەر بنەمای ئەم پرۆگرامە بووە، بەلام بەهۆی ئەو دابڕانە سیاسی‌یەی کە دەستی گرت بەسەر دەزگاکانی‌دا هێدی هێدی بەرەو کارکردن لەبواری نوسینو لێکۆڵینەوەو وانەو نەژادکردنی لایەنە تایبەتی‌یەکانی توێژینەوەکانی دەقە قورئانی‌یەکانو سوننەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر کەوتنە ڕێ، لەوەی کە پەیوەندی بە کاروباری تاکەکانەوە هەیە لەپەرستشو مامەڵەکردن،

بەم شێوەیە لەو کاتەوە تێبینی ئەوەمان کردووە کە سروشتی جیاکەرەوەی زانستە شەرعییەکان ئەوەیە کە بەندە لەسەر توێژینەوەی هەڵگواستنی فقهی لەقورئانو سوننەت، وە لەسەر بنەمای ئەم دەرچەیەشەوە شتێك گەشەی کردووە کە ئەمڕۆ بەکۆمەڵەی زانستە شەرعییەکان دەناسرێتو ئەم بەشانە دەگرێتەوە: زانستی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پیرۆز، زانستی فیقه ، زانستی عەقیدە، زانستی زمانی عەرەبی.

وە هۆی لکاندنی زانستی زمانی عەرەبی بە توێژینەوەو زانستە شەرعییەکانو بایەخی زاناکانو پێی ڕوونە، چونکە توێژینەوەی زمانیی عەرەبی ڕەگەزێکی سەرەکی توێژینەوەیە لەدەقی قورئانو سوننەتو ئەو شتانە کە لێیان هەڵ دەگوازرێت.

وە ئەم دابەشکردنو دابڕ کردنەی پەیکەری پرۆگرام گەرایی هزری ئیسلامییەیە کە ڕاڤەی دانانی زانستی عەقیدە یان زانستی (کەلام) لەپاشکۆی لیستی توێژینەوە شەرعییەکان دەکات. چونکە زانستی کەلام ئەگەر چی دۆزەکەی بریتییە لەتوێژینەوەی عەقیدەی ئیسلامی بەڵام چونی بۆ نێو بازنەی توێژینەوە بەراوردکارەکانی (ملك ـــ نحل) وە سەر کێش کردنی لۆژیكو تێڕوانینی فەلسەفەی یۆنانیش بۆ نێو بازنەی ئەو زانستە هەروەها دوریشی لە بازنەی تێڕوانینی (هەڵگواستنی ) دەقەکان، کە ئەم تێڕوانینەیە زانایانی شەریعەت پشتیان پێ بەستبوو، وە پێوەی خەریك بوون بە تایبەتی لەقۆناغی دابڕینی زانستییانەی دور لەمومارەسەو بەر پرسیارێتی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا، بوو بەهۆی ئەوەی ئەم زانستە ببێتە پاشکۆی زانستە گرنگەکانو توێژینەوە شەرعییەکان.

بەم شێوەیەش زانستی عەقیدە بوو بەسەرچاوەیەکی تا ڕادەیەك لاواز بۆ لەهزری ئەم نەتەوەیە، نەتەوەش بێ بەش بوو لە دانانی ئەو زانستە لەجێی ڕێبەردا بۆ پرنسیپی جوڵاندنو گوڕ پێدانی دامو دەزگاو بنیاتنانی کۆمەڵایەتیو شارستانییەتێکی گەشە کردووی پڕ لەگۆڕانکاری، ئیتر بەمەش بازنەی زانستی فیقهی ژیان وەك کەرتە بەشێك لەبازنەی زانستی عەقیدەی هەمە بەشی پڕ لەئاڕاستەکاری دابڕا، و پێکهاتەی بوونیادی بینیەی ئیسلامیدا بە تەواوکاری نەگەیشت، ئەمەش بوە هۆی بەر پابوونی کەمو کورتی لەهەریەکە لەو دوو بازنەی پێشوودا، کە مەبەستمان لەبازنەی گشتی عەقیدەیی تیۆریو بازنەی

جێبەجێکردنی زانستی ڕێکخستنە، بەم پێیە لەکەژاوەی گۆڕانکاریو پێشڕەویکردن دواکەوتن.

وە لەبواری پێناسەو ڕەخنەدا، سوود لەوەدایە بڕوانینە یەك بەیەکی کاروبارەکانو بنەما بنچینەییەکانی بەهێزکردنیان لەچوارچێوەی هزری کلاسیکیدا، تا دەرك بەڕووکارەکانی کەم کورتی لەهزرو هۆکارەکانیدا بکەین، وەپاشان هەنگاونان بەرەو چارەسەرکردنی دۆزەکەی.

وەیەکەم بنەچەی سەرەکی بریتین لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) گرنگترین شت لەچەمکی ئەم دوو بنەچە بناغەییەدا تێبینی بکەین ئەوەیە کە توانا بۆ توێژینەوەو تێڕوانینیان لەچوارچێوەی پرۆگرامی کلاسیکیدا بریتییە لەتواناى زمانەوانی تیۆری مێژوویی، کەوا لە توێژینەوەی زانستی ئیسلامی دەکات توێژینەوەیەکی تیۆری بێ، ئەو بۆچونەش کە لەگەڵیاندا تێکەڵاوبووە کە واقع زانیو تواناو پێویستییەکانو ململانێ کانیەتی بونەتە دۆزێکی لاوەکی مەگەر بە ڕێکەوت توێژەر بە شێوازی مومارەسەی خۆی ڕێگایان بەرێتە سەر.دەرك بەو ڕاستییە دەکەین کە بۆچی لایەنی زمانەوانییەکی وشك زاڵە بەسەر توێژینەوە ئیسلامییەکانداو لەم سەردەمانەی دوایدا ئیجتیهاد وەستاوە، هەر چەندە ئەوەشمان لەپێش چاوە کە کۆمەڵێك لەزانا گەورەکان لەمێژووی ئیسلامیدا ئیجتیهادیان کردووە گەرچی بە ماوەیەك پێش ئەوانیش ئیجتیهاد وەستابوو، چونکە شێوازی توێژینەوەو مومارەسەکردنیان لە ژیانیکۆمەڵایەتیو سیاسیدا ڕەخساندنی بۆ زانینی زانستی سەردەمو مەعریفەی واقعی ژیانی نەتەوە، هەروەها بۆ تێڕوانینی بابەتیانەی پتەو نەك تەنها تێڕوانینی زمانەوانی پەتی، هەروەك بەو شێوەیەی ژیانی یاوەرانی پێغەمبەرو(ﷺ) گەورە زانا بەراییەکانی یەکەمین سەردەمی ئیجتیهاد وابوون، وە زانای گەورەو موجتەهید (ئیمام ئەحمەد تەیمیە) بەرزترین نمونەیە لەم بارەیەوە.

تێکەڵ بوونی ئەم دوو بازنەیە تێبینی دەکرێ لەو توێژینەوانەی کە لەسەر قورئانو سوننەت دەکرێن لەچوارچێوە کلاسیکیەکەیداو، دیالێکتیکی هەریەکەیان بەجیا دەردەکەوێ، پەیوەندی نێوانیشیان بەڕادەیەکە کە بەئاسانی پەی پێ نابرێ بە لایەنێکی بابەتیانەی ڕوونو ئاشکرای دەوری بەرچاوی هەریەکەیان بەجیا، چونکە ئەم دوو بازنەیە لەبەر نزیکییان بەیەکداچوون، بەمەش چەمکی کلاسیکی مێژوویی و بیرۆکەی نەسخ بوونەوە بەسەر توێژینەوە هاوچەرخەکەیاندا

بڕاوەو حیکمەتی سیاسەتی شەرعیو مەبەستەکانی شەریعەتو بزافیی فقهو هزری ئیسلامی لەدەست چوو. لەبەشێکی زۆری ئەم هزرەشدا هەردوو ڕەهەندی کاتو شوێن لە ناو چووە لەگەڵ بەشە پێگەی دەق لەئەسڵی کۆی سروشو فیطرەی مرۆییو گەردونی.ئەمەش بە ئاشکرا پێچەوانەی واقعی ئەو پرۆگرامەیە کە لەسوننەتی پاکی پێغەمبەردا بەدی دەکریو جێنشینە ڕاشیدیو هاوەڵەکانیان پەیڕەویان کردووە، ووردە ووردە توێژینەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئاڕاستەیەکی ئاڵۆزو چڕو پڕی وایان وەرگرت کە تەنها لەڕووکاری دەرەوەی فەرمودەو سەنەدەکاندا بایەخی پێدرا سەرەڕای تێپەڕبوونی سەدەها ساڵ بەسەر ئەو سوننەتانەو کۆکردنەوەیاندا، لەهەمان کاتدا بەڵگەو مانـاو مەبەستو ئامانجەکانی لەدەرەوەی چوارچێوەی زمانەوانیدا پشکی گونجاویتی خۆیان لەپرۆگرامو باسو لێکۆڵینەوە بە ووردیو چاودێرییەوە پێ نەبڕا.

گەر لەبەڵگەی ئیجماع ووردبینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لێرە مەبەستمان لەئیجماع بنەچەی ئیجماعی ڕای زۆرینە یان ڕای جمهوری زانایان نییە، بەلام مەبەستمان پێی ئەو ئیجماعە ڕەهایەیە کە بوار بەهیچ کەسێ نەدا نارەزاییو جیاوازی جێ بهێڵێ، بۆیە لێکۆڵەرەوەکان بۆیان دەرکەوتووە کە جۆری ئەم ئیجماعە ـــ لەهەر بەشێکی نەتەوەدا بێ - ناکرێ لە هیچ کاروبارێکی ئاینو شەریعەتدا سەربەخۆ بێتەدی جگە لەو کاروبارە بنەچەییانەی کە دەقیان لە بارەوە هاتووە ئا لەم بارەدا ـــ واتە لە بەردەم بەڵگەی دەقدا ـــ بەڵگەو ئیجماع پێویست نییە، چەمکی کلاسیکی ئەم (الاجماع الاصولی)یە بەتەنها دەستەیەك زانای پسپۆڕو ئەکادیمی لەبواری توێژینەوەی قورئانو سوننەتدا پشتی پێ دەبەستن، کەوای لێدەکات (ئەگەر بەدیهات) دوزەکە لەبواری تیۆریدا بمێنێتەوە هەر لەو بارەشدا چەق ببەستێ وەلامی پێداویستییەکانی خەڵکی پێنەدرێتەوە عەقڵو هۆشیان نەدوێنێو نەیان بزوێنێت بگرە لەواقعی ڕۆژانەشیاندا ڕەنگ نەداتەوە، هەروەها قەناعەتیشیان پێی نەبێو پشتگیری نەکەن، لێرەدا مەسەلەکە جگە (لەڕەهەندە تیۆرییە ئەکادیمییەکەی) ڕەهەندی واقعیو کۆمەلایەتیو سیاسیشیهەیە، بەو شێوەیە درێژە دەکێشێ تا خەڵکی لە گەڵیدا ڕادێنو جیابوونەوەی نێوان سەرکردایەتی زانستی هزری نێوان سەرکردایەتی سیاسی کۆمەلایەتی دەبێتە شتێکی ئاسایی لای خەڵکی. هەروەها کۆمەکی بەرجەستەبوونی واقعی جیابوونەوەی نێوان سەرکردایەتی هزری سەرکردایەتی

سیاسی نەتەوەش دەکات، ئیتر کۆمەڵگە دادەڕمێت و لەڕووی کرداریشەوە چەمکی ئوممەو کەلەسەر هاوکاری هەردوو گروپ و شیاوییان بنیاتنراون واتایەکیان نامێنێ.

(الاجماع الاصولی) چەمکێکی تیۆری پەتی یە لەڕاستی دا بە سەرچاوەیەکی عەمەلی و شێوازێکی ڕاستەقینە دانانرێ بۆ بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و بزافی ئیسلامی، وە لەهیچ شتێکدا پەیوەست نی یە بە لایەنی سیاسی و فەرمانڕەوایی و یاسادانانەوە لەکۆمەڵگەی ئیسلامی هاوچەرخدا. ئەو ئیجماعەی کە ئەمانەوێ بیدۆزینەوە ئیجماعێکە لە جۆرێکی تر، ئیجماعێکە لەسەر بناغەی تێگەیشتنی ئیجتیهادو ڕاوێژکاری وەستاوە، بە شێوەیەکی فراوان ئیجماعێکە چەمکی (اهل الحل والعقد)و ئەو سەرانەی کۆمەڵگە دەگرێتەوە کە پابەندبن بە ئیسلامەوە ئەگەر چی پلەو پایەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی یان جیاواز بێ، وە ئیجماعێکە پابەندە بە چەمکی ڕای جەماوەرەکانیان، واتە پابەندی بە چەمکی ڕای زۆرینە، زۆرینەی نەتەوەکە لەو سەرکردە ڕاستەقینە پابەندانەدا خۆی دەبینێ لەحاڵێکدا ئەگەر هەموویان نەیان توانی لەسەر یەك ڕایان لەسەر یەك چەمك کۆببنەوە،بەم شێوەیە جیاوازی دەکەین لەنێوان توێژینەوەی تیۆری ئەکادیمی، یان ڕای تایبەت یان قەناعەتی تاکە کەسی، بە تایبەتی لەو شتانەی پەیوەندی یان بە مامەڵەو دەزگاکان و سیاسەتی گشتی یەوە هەیە، وە لە نێوان ئیلزامی سیاسی و یاسایی تەشریعی یەوە لە ژیانی گشتی دا،وە لەو شتانەش کە لەو ئیلزامەوە سەرچاوە دەگرن وەك ئاسەوارە زانستی و مەعنەوی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و سیاسی یەکان.

(قیاس)یش چوارەم بنەچەی بناغەیی یە، مەبەستمان پێی تیڕوانینە لەو ڕووداوانەی کە دەقی قورئان و سونەت لەبارەیانەوە نەهاتووە، ئەمەش بۆ گەڕان بە دوای خاڵی لێك چوی هاوبەش لە نێوان ئەم بنچینانەو هاوشێوەکانیان هاوشێوانەیان کە لەسەردەمی پەیامبەرێتی ڕوویان داوەو هەردووکیشیان هەمان حوکم دەیان گرێتەوە. پیادەکردنی ئەم بنەچەیە بە شێوەیەکی باش پتەوی و جێگیریی شێوەی گشت گیرانەی کۆمەڵگە دەخوازێت، وە هەموو گۆڕانکاری یەك گۆڕانکاری یەکی گەورەی و ڕوداوێکی دیاریکراو پێویستی بە بڕیاری سەربەخۆ مامەڵەی تایبەت نیە چونکە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوەو دەبێ بگەڕێین بۆ ڕوداوێکی ڕابردووی لەو جۆرە لەمێژووداو هەمان حوکمیان بەسەردا بدەین.

لەو کاتەوەتاکو قەڵەم ڕەوی ئیسلام فراوان بووەو گەلانی زیادی کرد بە تایبەتی لە سەردەمی (عومەری کوڕی خەطابدا)و(خوا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ تێپەڕبوونی سەدەها ساڵو گۆڕانی کاروبارەکانو تواناکانو ململانێکان، گۆڕان لەزۆربەی بوارەکاندا گۆڕانێکی کەرتی نییە، بەڵکو گۆڕانەکە ـ لەهەندێ لایەنیدا ـ فراوانو گشت گیرە. وە گرنگە بیزانین کە (القیاس الجزئی) بۆ لێکۆڵینەوەو سەیرکردن لەهەموو ڕووداوو گۆڕانکاری‌یەکاندا جێی خۆی نییە. هەر لەبەر ئەم هۆیەو لەسەردەمێکی‌کۆنەوە پێشکەوتنێکی ئوصوڵی نوێ بەدی دەکەین ئەویش بریتی‌یە لە(اصل استحسان) واتە: بەچاك زانین کە لەخاکی عێراقو دواتر لەولاتانی فارسدا شەکایەوە، ئەتوانین بڵێین کە هۆکارەکانی سەر هەڵدانی لەم ولاتانەدا ـ لەژێر ڕۆشنایی ئەو باسەی کە پەیوەندی بە (قیاس)ەوە هەیەو پێشتر باسمان کرد ـ دەرەنجامی پەرەسەندن بوو لەبنیاتنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە سەر دەمی جێ نشینەکانی ڕاشدینو فەتحی ئیسلامیو هاتنی بەرەو خاکی عێراقو فارس کە گەلێ شارستانیو دەوڵەتی بەخۆوە دیبوو، پاشان بوونە گەورەترین بنکەی دەوڵەتی ئیسلامی ئەویش دەوڵەتی عەباسی بوو، ئەمەش ڕێی خۆشکرد بۆ گەورەبونو گەشەسەندنی خەڵکیو بوارەکانی کۆمەلایەتیو سیاسیو شارستانی گەورەی وا کە پێشتر لەسەردەمی سەرەتای ئیسلامو دەوڵەتی ئیسلامی لەدورگەی عەرەبیدا نەبینراوەو نە ناسراوە ئەو دورگە عەرەبیەی کە ڕۆڵی سیاسی خۆی لە دەستدا پاش نەمانی کورسی جێ‌نشینە ڕاشدینەکان لەخاکی حیجازدا.

وە(استحسان)یش یەکێکە لەو بنەچە فقهی‌یانەی کە لەدوو لیستی (الاصول الفرعیە)دایە، گەشەکردنی ئەم ئەصڵەش ئەوە ڕون دەکاتەوە کە زانایانی (فیقە) هەستیان پێکردووە لەو پەرەسەندنانەی پێشبینی سەبارەت بە گرفتە کۆمەلایەتیو تەشریعی‌یەکان دەکات بە تایبەتیش لە دەوڵەتە گەورەکاندا، هەروەها کاریگەری ئەو هەستە لەسەر پرۆگرامگەرایی هزری تەنها بە چەمکی (القیاس الجزئی)یەوە نە نیشتنەوە کەزۆر بەقووڵی بیریان کردۆتەوە نەك هەر بە پێی ڕوداو لەسەر ڕوداو بڕۆن، کە توێژەر دەکەوێتە گومانەوە سەبارەت لەبەر ئەوە بڕیاری چەند حوکمێك دەدات کە لەناوەڕۆکدا ڕاستی‌یەکی تەواو و وێنەیەکی گشت گیرانەی واقع نییە، چەمکی( استحسان) وەك پێویستی‌یەك هاتە کایەوە بۆ ئەوەی فقهاء ئەگەر لەڕێگەی (قیاس وتقلیل)ەوە بە هەڵەدا چوون بالە ڕێگای تێڕوانینی کەرتی‌یەوە بگوازێتەوە بۆ تێڕوانینی گشتی‌وە بە شێوەیەك حوکم بدات

کە گیانی شەریعەتو مەبەستو بنەما ڕاستی‌یەکانی بگرێتەوە، بەمەش حوکم دان لەسەر ڕووداوەکە وەك ئەوەی شایستەیە بە ئیسلامو گیانو مەبەستو بنەماکانی‌یەوە دەبێت.

وە بۆ ئەوەی لەدۆزی ڕێکخراوە ئیسلامی‌یەکانو گۆڕانکاری کۆمەلایەتی‌و شارستانی بگەین، سەیر ئەکەین زۆربەی ئەو فەقیهانەی کەپابەندبون بە دەقەکانەوەو قووڵبونەتەوە لەقبولکردنیانو پابەندبوون بە دەلالەتە حەرفی‌یەکانیان بەپێی توانا، لەبەردەم گۆڕانکاری‌و پەرەسەندندا تەنهاڕێبازی تەسلیم بون بەکاریگەری ئەم گۆڕانە گشتی‌یە جۆراوجۆرانەی کۆمەلگەو هۆکارو تواناو پێداویستی‌یەکانیان گرتۆتەبەر، بۆیە پێویست بووە بەناچاری لە سنوری پرۆگرامیان بۆ پابەندبوون بە حەرفییەتی دەقو سەیرکردنی بەشیی دەرچن‌و بڕۆن بۆڕۆحی شەریعەتو مەبەستەکانی‌و پێشبینییەکانی‌و هەموانەکانی. وە نمونە لە سەر ئەمەش هەڵوێستی (فقهاء)ەکانە لەسەر دۆزی دیاریکردنی‌نرخ‌و ئەو دەقانەی پەیوەندی‌یان پێوە هەیە، کە دەبینین ڕازی بوون بەفەتوادان سەبارەت بەنرخ دانان ( سەرەڕای بونی دەقی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەیەوەو سەرە ڕای پابەندییان بە حەرفییەتی دەقەکانو قیاسی جوزئی لە سوننەتدا) هۆکەشی ئەوە بوو گەر لەو سەردەمەدا سەبارەت بەنرخ دانان فەتوایەك نەدرایە ستەم بەرپا دەبوو، لەبەرئەوە یەکسەر فەتوایان لەسەر نرخ دانان ئەدا، کاتێك نەیان توانیایە چارەسەرێکی گشتی ئەوکارەبکەن بەشێوەیەك کە هاوسەنگی گشتی سستمی کۆمەلایەتی‌و ئابووری ڕاگیر بکات،و هاوسەنگی بۆ بازاڕ بگێڕێتەوە بەبێ ئەوەی کە نرخ دیاری بکرێ یان سوڵتەی دەسەلاتدار دەست وەردانە ناو کاروباری بازاڕو نرخی کالاکان، بەم شێوەیەش کۆمەلگە لە کەوتنە ناو ستەمی ئابوری‌و چەوساندنەوەی خاوەن کالاکان دەپارێزرێت.

## ٢ـ زیندە بە چالکردنی زانستی کۆمەلایەتی:

ئەم تێبینی‌یە سەرەکی‌یانەی هێلی گشتی هەیکەلی پرۆگرامگەرایی‌و نوصول لەهزری ئیسلامی‌و گەشەو پەرەسەندن لەبەرای‌یەکانیان ئەوەمان بۆ ڕون دەکەنەوە کە بنەما فەرعی‌یەکان بنەماو دەرچەکانی عەقل کاری ئیسلامی دەنوێنێ لەو واقعو ژیانەدا کە لەلایەن شەریعەتو ڕێنماییەکانی‌یەوە ئاڕاستە دەکرێن بە خۆیانو ڕووداوو ڕێکخستن‌و پەیوەندییەکانەوە، هەروەها ئەوەی ژیان

دەیگرێتەوە لەکاروبارە فیطرییەکانی نێو سروشتی دەروونەکان و بوونەوەریەکان، وە چۆن ئەم بنەچانەی کە لایەنی ئیجتیهادو تێڕامانی عەقلیی بۆ ژیان و واقیع و سروشتەکان دەنوێنن شاواش لایەنی دووەمی بنچینەیی دەنوێنن لە پرۆگرامگەرایی هزری ئیسلامی و چاوگی مەعریفەو ئاراستەکردن و بنیاتنان تیایدا لە پاڵ وەحی و سروشدا ــ کە ئەمەش فیطرەی واتە عەقڵ و سروشتەکان و سوننەتی خوایییە لەدەروونەکان و بونەوەریاندا ــ .لە گەڵ ئەوەشدا ئەم لایەنەی ئوصوڵ بنکەی دەرچەو کردەی ئیجتیهادی و جێبەجێکردنە، بەڵام پۆلێن کردنی وەك لایەنی (فرعی) یان (پلە دوو) تا ڕادەیەکی زۆر کۆسپ و لێك ترازان لەدەزگای مەعریفەو پرۆگرامگەرایی ئیسلامی دا ڕەنگ پێدەداتەوە، کە کۆنترۆڵکردنی بۆ گۆڕەپانی هزرو ژیانی ئیسلامی و ملکەچ بوون بۆی، دووریانێك دەنوێنێ لەمێژووی ئیسلامی دا بەرەو لەکەداری و پاشەکشێ لەڕێکخستن و باری کۆمەڵایەتی و ژیاری دا، دور لە جۆری ئەو ڕێنمایی و دەستەبەرییەی کە لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکاندا پێمان گەیشتووە لەئاستی بەجێهێنانیاندا.

ئەنجامەکە روونە، بەهۆی دابڕان و دوورەپەرێزی سەرانی هزری ئیسلامی و سنورداری بایەخ پێدان و مومارەسە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیانەوە ئەم ڕێسا ئوصولیە لقیانە نەیانتوانیوە ببنە دەرچەی تێڕامانی زانستی بە پرۆگرامی ڕێك و پێك لەرووی بارودۆخی دەرونەکانی خەڵك و بونەوەریان و ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکاندا، وە ئەم توێژینەوانە پەرەی نەسەندووە بەو شێوەیەی کە توێژینەوەی دەقەکان پەرەیان سەندووە تاببنە بنکەیەك بۆ ئیجتیهادی ئیسلامی، و بنیاتنانی زانستی فطریی مرۆیی کۆمەڵایەتی لەسەر ئەم بنکە ئیجتیهادیە بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ ناسراوە بەزانستی کۆمەڵایەتی و مرۆیی و بوارەکانی توێژینەوەی.

پەرەسەندنی ڕووداوەکان و ململانێی سیاسی لەوڵاتانی ئیسلامیدا کە هەریەکە لەفتنە گەورەکەوەو بە کوشتنی عثمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێ) و دروستکردنی دەوڵەتی ئەمەوی دەستی پێکرد بووە هۆی دابڕانی نێوان سەرانی سیاسەت (سەرۆکەکان) و سەرانی هزری ئیسلامی (زاناکان). کاتێك سەرکردایەتی پابەند بە ئیسلامەوە لەبوارەکانی حوکم و بەر پرسیدا بڕوا توانای سیاسی و ئەزمونیی کۆمەڵایەتیی ئەم سەرکردایەتیە لاوازو بێ هێزبوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئیتر هزری ئوصولی ئیسلامی لانەکاتەوە بەلای پەرەپێدانی

بنکەو بنەچە فەرعی‌یەکان‌و فراوانکردنیان‌و ڕێکخستنیان لەڕیزی زانستی پرۆگرامگەرایی‌دا. وەك ئەوەی لە بواری توێژینەوەو ڕوانین بۆ دەقە ئیسلامیەکان ئەنجام درابوو، کە بەر پابوونی کۆمەڵێك زانستی شەرعی لێ کەوتەوە کە شێوەیەکی پرۆگرامگەرایی‌و بنەماو ئامرازی لێکۆڵینەوەو بەرهەمی زانستە دیاری‌کراوەکان دەنوێنی.

وە لەبەر ڕۆشنایی ئەم پێشکەوتنانەی پرۆگرامی هزری ئیسلامی‌و گەشەی زانستەکانی‌دا ئەتوانین هۆکارەکانی هەرەس هێنانی تێڕوانینی عەقڵی ئیسلامی بزانین، هەروەهاش هەرەس هێنانی ئیجتیهادو دەست پێش خەری‌و داهێنان‌و کلۆم دانی دەزگاکانی لەقۆناغی بەرایی مێژووی نەتەوەدا، تێ‌دەگەین چۆن تێڕوانینی عەقڵی‌و واقعی ماوەتەوە، واتە توێژینەوەی فیطرەی زانستیی عەقڵی، لە گەڵ سەرچاوەکانی بەخشندەیی لەهزری ئیسلامی‌دا وەك دۆزێکی فەرامۆش کراوی هەرەمەکی لە کلتوری بیریارو فەقیهی ئیسلامی‌و بەخششەکانی‌دا، وە بەرنامە زانستی‌یە پرۆگرامگەراکەی پشت بەو زانیاریانە دەبەستێ کە لەتێڕوانین‌و کارامەیی‌و پسپۆری‌و مومارەسەی تاکە کەسیی فەقیهەوە دێتەدی، گومانی تیانی‌یە کە هەوڵی تاکە کەسیی زاناکان‌و بەرێکەوت بە سەرا کەوتنی ئەزمونییان لەژیاندا ڕۆڵی خۆی هەبووە لەدەوڵەمەندکردنی هزری ئیسلامی بە گفت‌و گۆو تیۆری عەقڵی لەڕووداوو سروشتە کە فقهاو زاناکان خستویانەتەڕوو، بەڵام هەوڵەکانیان لەکاتی خۆیدا پلانێکی زانستیانەو پرۆگرامیانەی ڕێکخراوی بۆ تێڕوانین‌و توێژینەوەو بۆ گەڕانی عەقڵی زانستی نەبووە لە کاروباری فکرەتدا لەژێر سێبەری ئاراستەکردنی دەق‌و مەبەستە ئیسلامی‌یەکاندا. بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێ کە هزری ئیسلامی — بەتایبەتی فیقهی ئیسلامی — تێ ڕامانی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی تیایە بەڵام لەبەر بەرتەنگی ئاسۆکەی ناتوانرێت پێی بوترێت زانستێکی کۆمەڵایەتی‌یە بەهۆی لێك ترازان‌و گۆشەگیری کە نەیان هێشتووە بەرەو پێشەوە بڕوات، هەروەها نەیتوانیوە جڵەوی دەست پێشخەری کردنی هزری بگرێتەوە دەست بۆ ئاراستەکردنی کاروانی ژیانی نەتەوەو داموو دەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکانی‌و بەهاناوەهاتنیان بە چارەسەرو بە دیلی شارستانیانەی پێویستەوە، تا بەپێی تواناو پێداویستی ئەو ململانێیانەی بەرەو ڕووی دەبێتەوە هەنگاو بنێ. وە لەبەر ڕۆشنایی تێ گەیشتنی ئەمڕۆماندا و بەرەو پێش چوونی کاروانی هزری ئیسلامی‌و پرۆگرامگەرایەتیەکەی ئەتوانین تێ‌بگەین لە هۆکاری

ئامادە نەبوونی توێژینەوە هزری و فقهی یە ئیسلامیەکان کە چارەسەریی کاریگەر بۆ سیستمی گشتی و دەزگا گشتی یەکان و دۆزەکانی حوکم و خەلافەت و سیاسەت دەستەبەر دەکات لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامی و بابەتە زۆرەکاندا، وە پشتگوێ خستنی ئەو بەشە گرنگەش تێدەگەین کە چەمکی نەتەوەو ناوەڕۆك و بوونی نیشان دەدات، و جێی دیلێ بۆ کەمێ لەکتێبەکان و دانراوە تایبەتمەندەکان کە بەوە دەناسرێن شێوازێکی وەصفیی ڕوکەشانەیان هەیەو وای لێ کردوون کەم نەغمەو کاریگەری بن.

ئەو چوارچێوە هزری یەی کە دەرەنجامی لێك ترازانی سەرانی سیاسی و سەرانی هزری ئیسلامی یە خۆی لەبەردەم پرۆگرامی هزرو زانستە ئیسلامیەکان و بایەخ پێدانەکانیاندا بینیوەتەوە، بووەتە هۆی نوقم بوون و زۆر قووڵبوونەوە لەتوێژینەوەی وەصفیانەو گێڕانەوە بەرەو نوقوم بون لە توێژینەوەی وەصفی و عەقلی و پابەندبون بە پرۆگرامی سەرزاری و هەموو ئەوانەی تر کە پەیوەستن بەزانستی زمان و ئەدەبەوە، واتە ئەو زانستانەی پێویستن بۆ پتەوکردنی دەق و پۆلێن کردن و ڕاڤەکردنی بێژەکانی دەقەکان، (ئەم لێك ترازان و ئەم پرۆگرامە) فکری یە ئەبێتە هۆی دابەش بوونی ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوە بۆ دووبەش و دوو (ولاء)، یەکێکیان لایەنی تاکی و شەخصی دووەمیان لایەنی گشتی، بیریارو زانا موسڵمانەکان بایەخ یان بە بەشی تاکە کەسی داوە لەگەڵ ئەو شتانەی کە پەیوەندی هەیە بە پەرستش و مامەڵە کردنەوە، ئەم بەشە لە کەسایەتی ئیسلامی دا پەیوەندییەکی تایبەتە لەنێوان زاناکان و لەنێوان ئەندامانی نەتەوە، وەلائیان و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیشیان تیایدا دەخەنە ژێر ڕای زاناکان و فەتوای فەقیهەکان، بەڵام بەشی گشتیی پەیوەندی دار بە دەسەڵات داران و دەزگا گشتی یەکان و کاروباری سیاسی و فەرمان ڕەوایی و ڕۆڵ و بواری جم و جۆڵ و جێ بەجێ کردنی ئەو سیاسەتانەی حاکمەکان بەکاریان هێناوە وەك ستەم بۆ مەبەستی خۆیان، هەروەها سەرکردەو ئەهلی (الحل والعقد) بەهەمان شێوە، بەم شێوەیە کارەکانیان ئەکەوێتە ژێردەستی دەسەڵاتداران و بە هێزەکان و دەمارگیرو خاوەن بەرژەوەندەکان، کە بووە هۆی ئەوەی زاناکان و بیریارە موسڵمانەکان فەرامۆشی بکەن و گوێی پێ نەدەن و، تێڕوانینیان کە(هاوشانە لە گەڵ عەقلیەتی نەتەوەو دەرونیان) بۆ کاربەدەستان و ئەو دەستە سیاسیانەی کە جڵەویان گرتۆتە دەست بە گومان و نەمانی متمانەو لەدەست دانی شیاوییەوە بێت.

ئەم بارە هزری و دەروونی یە ـــ باری دورە پەرێزی و لێك ترازان ـــ کە زاناکان و پیاوانی سەرانی هزری ئیسلامی تیایدا گەمارۆ درابوون بووە هۆی لاوازی

بینیەی هێزیو زانستی لەبوارەکانی سیاسیو کۆمەڵایەتی گشتیداو شکستی دەزگاو سیاسەتە گشتییەکانو نەمانی توانای ڕاگیرکردنی ئەم داموو دەزگایانەو پارێزگاری کردنیانو پەرەپێدانیان بەو شێوەیەی کە دەبێتە هۆی پارێزگاری ئامانجەکانیانو ئاستی بە جێهێنانیو پاراستنیان لەگەندەڵیو ویران کردنو لاوازیدا، بەمەش لەویژدانی نەتەوەدا چەمکی نەتەوەو کۆمەڵو دەوڵەتو کۆمەڵگەو پێویستییان بەو دەزگایانەو متمانەکردن بە شیاوییان لاواز بوو، بەم شێوەیەهێزی خۆڕاگری لەبەرانبەر شکستو لادان لەنەفسییەتی نەتەوەدا هەڵهاتو ڕووخا.

وە لەئاکامی ئەم لێك ترازانو دابەش بوونو لاوازی پابەند بوونە ئیسلامییە لەلایەن سەرکردایەتی سیاسیو نەبوونی بەرنامەی زانستیو پەروەردەییو فەرهەنگیو لاوازی دەزگا گشتییەکانو هەستی کۆمەڵایەتی گشتی ئەمانە بونە هۆی لاوازبونی نەتەوەو قەوارەکەشی،و ڕۆڵی دەسەڵاتو یاسای گشتیو دەزگا گشتییەکان لاواز بوو، نەتەوەش بوو بەچەند تاقمو گروپێك ی پارچە پارچەوەو دروست بونی چەندتیرو هۆزو دەوڵەتۆکەو ووردە گروپو تاکی جیاوازو کە دژی یەکتری دەوەستان بێگوێدانە ئاینو ویژدانو بەرژەوەندی، کاتێك وورەیان نەئەماو وشەیان کۆ نەئەبووە، زیان لێکەوتن دەرسیدا نەئەدان کارەساتەکان بەئاگای نەئەهێنان ، ئیتر تازە نەتەوە نەگەڕایەوە سەر ئەو هەستو نەستو قەوارە دەستە جەمییەی کە چەمکی کۆمەڵو نەتەوەو کاریگەری لەقەوارەی گەلانی موسڵمانو ویژدانو جێبەجێ کردنیاندا بنوێنێ، لەبەر ئەوە لە ڕاستیدا وەك نەتەوەو قەوارە هیچ دەزگاو سەرکردایەتییەکی وای نەما کە دەستی بگرێتو متمانەی پێ بکاتو وەلائی ئەمی پێ بدات تاریزەکانی ڕێك بخاتو کاروانی کۆمەڵایەتیو شارستانیەتییەکەی ئاراستە بکات. وە لەژێر کاریگەری ئەم واقعەو لادانەکانی نەتەوەو شێوانی ڕیزەکانیو هەرەس هێنانی داموو دەزگاکانیدا جەوهەری فیکری ئیسلامیو پەروەردەکەی کە بۆ پێگەیاندنی تاکەکانی نەتەوەیە گۆڕیا بۆ فیکری تۆقاندنو ترساندنو مل پێ کەچ کردنێك، کە کۆمەڵەی سەرانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو فیکری نەتەوە مومارەسەیان دەکردو بانگەشەیان بۆ دەکرد. لەزۆرینەی جۆراو جۆردا، جا بەمەبەست بووبێ یان بێ مەبەست.

## تێکگیرانی عەقڵ و نەقڵ و شوێنەوارە ناهەموارەکانی:

لەگرنگترین ئاسەوارەکانی لێک ترازان و ململانێ و ڕووبەڕووبونەوەی نێوان سەرکردایەتیە سیاسیەکان و سەرکردایەتیە فیکریەکانە کە ئاوڕدانەوەی دەوێ بەرپابونی جەنگێکی نێوان سروش و عەقڵ بوو کە لێکترازانێکی ترسناکی تری لێکەوتەوە لەنێوان زانستە شەرعیەکان و زانستی کەلام کە ناسراوە بە(زانستی عەقیدەو یەکتاپەرستی)، ئەم لێک ترازانەی نێوان زانستی عەقیدەو زانستی فقهی تەنها لێک جیابونەوەیەکی ڕوکەشی و بواری پسپۆڕی و ئەکادیمی نیە، بەڵکو لێک ترازانێکی هزری ترسناکە جێگەی خۆی لەپەیوەندی نێوان چەمکەکانی ئاین و مەبەستەکانی و لەنێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و دەزگاکانیدا جێهێشتووە. بەم شێوەیە (زانستی عەقیدە) ئایدۆلۆژیەت تایبەتمەندبوو بە ڕۆچون لەبواری فەلسەفی و عەقلی و دیالێکتیکی تیۆریدا لەکاروباری جیهانی نادیار کە لەسروشتی عەقلی ئیسلامی و دۆزەکانیشی نیە، بەمەش هزری ئیسلامی بە کاروباری بێ سەروبەری فیکریەوە ماندوو بوو کە وزەو عەقلی موسڵمانی داچۆڕاند، ناهەمواری لە پێکهێنانی دەرونی ئیسلامیدا بەجێ هێشت سەبارەت بەوەی پەیوەندی بەجیهانی نادیارو دیارەوە هەیەو پەیوەستە بەو دوو جیهانەوە لەدۆزەکانی سروش و عەقڵ باوەڕو تەوەککول و هۆیایەتی (السببیە)، و هەرچیەک پەیوەندی بەمانەوە هەبێت لە وانەی بە دۆزەکانی قەزاو قەدەر وە (اسماء وصفات) دەناسرێ، ئەوانەشی کە وەک پاشکۆیەک لەگەڵیدایە لەلیستێکی دوورودرێژی نەزۆکی گومان و دیالێکتێک و سەر تێکدەرانە کە لەزۆربەی بارەکاندا نەبونەتە خێر بۆ نەتەوەی ئیسلامی و هزرو پێکهاتەی دەرونی و بونیادی عەقیدەییشی، وە ئەنجامەکەی بە دابڕانی فیقهو هزری ئیسلامی لەبنکە عەقیدەیی و تێفکرینەکانی بوو کە بناغەی عەقیدەو مەبەستەکانین ئەوانەی کە عەقڵ و هزری موسڵمان و بونیادی کۆمەڵایەتی موسڵمان ناتوانن بێ ئەوان بەردەوام بن لەکاروانە پڕ پێشکەوتنە ئیجتیهادیە ڕێکخراوەییەکەیدا، بەم شێوەیە عەقلی موسڵمان و هزری موسڵمان بوە بەندی پرۆگرام و بەشە زانستێکی وەصف کە لەزۆربەی بوارەکانیدا ناتوانێ گەشە بکات و لەگەڵ واقیع و گۆڕانکاریەکانی بارودۆخ و بونەوەرو ژینگە جۆر بەجۆرەکان و کارتێکردن و پێویستییەکان و تواناکان و داوا کارییەکانی شوێن و کاتدا هەڵ بکات.

وە لەدۆزە پرۆگرام گەرایی‌یە کلاسیکیەکانی هێزی ئیسلامی کە ڕەنگدانەوەی ڕابردووی بارو دۆخی هێزی ئیسلامی‌و ئاسەواری لێك ترازانی سەرانی هزریی‌یە لەسەرانی سیاسی‌و دورە پەرێزیانە لەواقعی لێپرسراوێتی‌و ململانێ‌و گۆڕانکارییەکاندا کە (تاکو ئێستاش لەڕووی پرۆگرامی‌یەوە یەك لایی نەکراوەتەوە بەڵکو تا ئێستاش لەبەرچاوی هەندێ کەس ڕۆشن نی‌یە. ئەویش کێشەی (نەسخ)ە واتە سڕینەوە لەدەقی قورئانی پیرۆزو سوننەتی بێ گەردی پێغەمبەر(ﷺ) وە ڕای بەر بڵاوی باو لەسەر ووشەو واتای سڕینەوە(نسخ) لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئەوە دەچەسپێنێ کە حوکم‌و ئاراستەکردن تەنها دەگەڕێتەوە بۆ دەقە بەدوادا هاتووە کەو چەمك‌و حوکمە پێشووەکان هەڵ دەوەشێننەوەو کاریان پێ ناکرێت، ئەم هەڵوەشانەوەیەش ڕەچاوی ئەو بارو دۆخە بە ضەرورەت وەرناگرێ کە حوکمەکە پەیوەندی پێوە هەیە هەروەها حیکمەتی حوکمە پێشووەکانیش هەر زۆر ڕەچاو ناکات‌و بایەخی پێویست‌و شیاو بەو کارە نادات، بەم شێوەیە چەمکی (نسخ) بونەوە لەشەریعەتی ئیسلامی‌دا وەك چەمکی (نسخ) بونەوە لەو ئەحکامە دانراوانەی لێدێت مرۆڤ دایڕشتوەو تیایدا حوکمی ئایندە حوکمی پێشووتر دەسڕێتەوە لەگەڵ بونی جیاوازی لە هەردوو بارو دۆخەکەدا کە ئەمە کارێکی هەڵەو نەشیاوە.

ئەم چەمکە بە شێوەیەکی گشتی وێنای ئەحکامی شەرع‌و سیستەمی کۆمەڵایەتی‌و مومارەساتی ئیسلامی گشتی دەگرێتەوە لەسەر شێوەی کۆمەڵگەی مەدینەی پیرۆزو دەوڵەتەکەی لەقۆناغی دواییدا لەکاتی نزیك بوونەوەی کۆتایی هاتنی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) پاش ڕزگار کردنی مەککە، کە وردە وردە پایەکانی ئەو دەوڵەت‌و کۆمەڵگەیە پتەو بوو، سیستەم‌و بنەماکانی سەقامگیربوون لەدەوڵەتێکی بەهێزدا کە زاڵ بوو بەسەر هەموو هۆزە عەرەبیەکانی خاکی دورگەدا، من لەم کتێبەدا بە(سەردەمی مەدەنی دووەم) ناوم بردووە کە لە(سەردەمی مەدەنی یەکەم ) جیا دەکرێتەوە بەوەی سەردەمی یەکەم سەردەمی ترس‌و لاوازی‌و کەمی بوو،و بنیاتنانی بناغەی کۆمەڵگەو دەوڵەت بوو، وە مل ملانێ بوو دژی دوژمنانی زۆرو بەهێز ئەمەش وام لێ دەکات کە ماوەی سەردەمی پێغەمبەرایەتی‌و کۆمەڵگەی پەیام بکەمە سێ بەش یان سێ قۆناغ: یەکەم (سەردەمی مەککی) یان (قۆناغی مەککی)، کە سەردەمی بنیاتنان‌و پێکەوەنانە؛ ئەویش بە بەکارهێنانی شێوازی گەیاندن‌و بانگەشەو

پرۆژەکاری تاکە کەسییانە لەچوارچێوەی سیستمێکی کۆمەڵایەتی‌دا کە دەیویست چاکسازی‌و گۆڕانکاری تیا بکات، لەڕێی ڕەخنەگرتن‌و هۆشیارکردنەوەو خستنە ڕووی بۆ چوون‌و دەرچە گشتگیرە بنەچەییە بەدیلەکان دژی ئەوانەی لەو سەردەمەدا باوبون لە دەرچەو سستم‌و مومارەسەی عەقیدەیی‌و کۆمەڵایەتییەکی گەندەڵ کە پێویست بوو کۆتایی پێ بهێنرێ‌و بگۆڕێ، ئەوە سەردەمێك بوو نمونەی قۆناغی خستنەڕوی بنەمای عەقیدەیی و بۆچوون‌و دەرچەی هەموایەتی بوو بەرەو ئەو چاکسازی‌و گۆڕانکارییانەی کە چارەسەرو بەدیلەکان لەسەر ئەو بنیات دەنرێ.

تێڕوانینی هەموایەتی ئەتوانێ کە لەکاروانی دابەزینی پەیامدا گەلێك چارەسەرو سیاسەت بەدی بکات کە لەبەهاو بنەگەلێکەوە دەرکەوێ‌و هەڵقوڵێ کە یەك سەرچاوەی هەبێ.

سەردەمی مەککی قۆناغی کارو دەعوەو چاکسازییە بۆ ئامانج‌و کەڵکی نوێی عەقیدەیی‌و شارستانی. وە ئەم قۆناغە دەناسرێتەوە بە پابەندبون بە بانگخوازی‌و گفت‌وگۆو بایەخ دان بە گرنگترین‌و گشتگیرترین‌و گشتی ترین. ئەمەش کارێکی سیاسییەو تایبەتە بە کۆمەڵ‌و گێڕانەوەی ڕێکخستن‌و ئاڕاستەکردنی قەوارەکەی، بەرەو یەك بنەماو دۆزێکی سەرەکی نەبێ مل نانێ‌و مامەڵەی لەگەڵ ناکرێ تەنها بە شێوازێکی سیاسی نەبێ، بۆیە بۆمان دەرئەکەوێ کە پێغەمبەر سورەو هیچ دوو دڵی‌یەکی نی‌یە لەسەر بەکارنەهێنانی توندو تیژی‌و وەڵامدانەوەی ئاگر بە ئاگر، هەرچەندە شوێن کەوتووانیشی بەدەست ئازارو چەوساندنەوە بناڵێنن، تا دۆزە سەرەکی‌یەکەی پشتگوێ نەخرێ کە دۆزی گۆڕانکاری‌و چاکسازی‌یە وەئەوەیش لە بناغەوە دۆزێکی سیاسی گشتی‌یە، چونکە کەسی سیاسی بە ئامرازی سیاسی نەبێت گۆڕانکاری ناکات، پێویست بە هێزو توندوتیژی ناکات لەچارەسەرکردندا، وەلام نەدانەوەی توندو تیژی بە توندو تیژیی دەست درێژکار لەبەردەم ویژدانی نەتەوەو کۆمەڵی موسڵماناندا دادەماڵێت‌و دای دەڕنێت‌و دۆزە بنچینەییە کەش وەك خۆی دەمێنێتەوەو جێی بایەخ‌و سۆز دەبێت دوور لەهەموو درێژە پێدان‌و کاریگەری‌و ئاڵۆزکردنێك.

مەبەستیش لەسەردەمی مەدەنی یەکەم ماوەی پێش ڕێکەوتننامەی حودەیبییەیە کاتێ موسڵمانان دەوڵەتیان پێك هێناو کۆمەڵانی هۆزە عەرەبی‌و جووەکان ڕووبەڕوویان بوونەوە بە شاڵاوو هاوپەیمانێتی‌و فێڵ‌و فرتیان، لێرەوە

بۆمان دەردەکەوێ کە سیمای ئەم سەردەمە ئەوەبوو کە جەماعەتی موسڵمانان بە باشترین شێوە خۆیان ڕێك خستو ئامادەی قوربانیدان بوون وە ئامادەبوون هەموو ئازارێك بچێژن لەپێناو بەر پەرچ دانەوەی بێ بڕواکانو بیان ترسێنن تا جورئەتی دەست درێژی بۆ سەر موسڵمانان نەکەن.

بەڵام سەردەمی مەدەنی دووەم ماوەی پاش ڕێکەوتنی حودەیبیەیە کە دەوڵەتی ئیسلامی سەقام گیر بونو سەرکەوتنی وەدەست هێناو بوونە لایەنی بەهێز بەرانبەر دوژمنان، ئەم ماوەیە بەوە دەناسرێ کە ڕێکخستنەوەکانو تەرتیبی کۆمەڵایەتی بەرەو تەواوکاری برانو باشکرانو جەخت لەسەر ڕێكو پێکی ڕەوتی کۆمەڵو پاراستنی کەسایەتیەکەیو قەوارەیو بەردەوام بونی کرا لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە دەوڵەتو کۆمەڵی موسڵمانان دەبینین لەپەیوەندییەکانیان لەگەڵ دوژمنانیانو دەوروبەریان بە ئارام بوونو کۆنترۆڵی خۆیان دەکردو مامەڵەی نەرمو نیانیان لەگەڵ دەکردن، ئەمەش بۆ دەوڵەتی ئیسلامی ئاسانو ئاساییەو لە هۆکر بوونی دڵەکانو دابینکردنی بارودۆخی سەقامگیر بۆ کارکردنو هاوکاریدا نەخشێکی هەموارەیی هەیە.

لێرەدا شێوازی کارو جۆری تشریع دەبینین کە هەرچەندە بنیەو ئامانجەکانی لەیەك سروشتدا بەرچاو بکەون ڕەنگدانەوەی ئەو چارەسەرو سیاسەتانە بووە کە پەیوەست بون بەواقعو بارودۆخەی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد، هەروەها مەبەستیان بوو کە کار لەو بارو دۆخە بکەنو ئاڕاستەی بکەن وە ئەو بەرووبومو دەست کەوتانەی کە دەیانەوێت تیایاندا بێتە دی.

هەر چەمکێکی کارو تشریع لەم قۆناغە جیاوازانەدا دەرکی پێکهاتە سروشتیو ڕوکاری جیاوازیو هاوبەشیو دەرچەکان نەکات ئەوە تاوانێکە بەرانبەر فیکری نەتەوەو ڕێگرییە لەکاروانو گۆڕینی ڕێنمایی ئیسلامیە بەرەو کۆتی تیۆری کە دەرك بەواقعو هۆکارە کاریگەرەکانی سەربەخۆییو سیاسەتو ستراتیژی ئەو بزوتنەوەیە ناکات کە بۆ هەموو قۆناغەکان گونجاوبێت.

وە نەسخ بوونەوە بەو مانایەی هەڵوەشاندنەوەی دەقی پێشووبێت لە لایەن دەقی ئایندەو لەسەر شێوازێکی یاسایی ئەکادیمیەتی بە تەنها ئەوا ئەم سەردەمە دەست نادات مەگەر لەبواری ئەو یاسایانەی لەدامو دەزگا پەرلەمانیەکانەوە دەردەچێت بۆ ڕێکخستنی بڕیارەکانو ئاسان جێ بەجێ کردنیان لەو کۆمەڵگایانەی لەژێر دەسەڵاتی ئەو یاسایانەدان، کە ئەوەی لە

ئـايندەدا دەردەچێـت سـەبارەت بـەكارێك ئـەو حوكمانـەى پێشـووتر سـەبارەت بـەو كـارە هـەڵ دەوەشـێنێتەوە، ئـەوەش كارێكـە جيـاوازە لەمەسـەلەى ئاڕسـتەكردنى سـروش و پـەيام و گەڕانـەوە بۆيـان وەك سـەرچاوەيەك بـۆ ڕاگـيركردنى كـاروانى مرۆڤايـەتى لـەپانتايى زەمين و زەمانـەو نـەوەكاندا.

نەسـخ كردنـەوە لەچەمكـە كلاسـيكىيە باوەكـەيدا ڕەنگدانـەوەى چـەمكيكى نـە بزووتـە لەپرۆگرامى هزرى ئيسلامىدا كە بێ ئاگـا لـە تێبينىكردنـى جيـاوازى نێـوان سروشـتى گشـتيى قورئـانى پـيرۆز كاردەكـات كـە هەموانەيىيـەو سروشـتى سـوننەتى پيغەمبـەر(ﷺ) كـە لايـەنى ڕونكردنـەوەو جـێ بـەجێ كـردن و مومارەسـەيە، هـەروەها واتـاى كلاسـيكى نەسـخ ڕەنگدانـەوەى لاوازيـى هوشـياريىيە ئەگـەر ئـەوە لەبـەر چاوبگرين كـە ڕەهـەندى (زەمـان و مكـان) لـەجێ بـەجێ كـردن و مومارەسـەدا لـەكاتى تـێڕوانين لـە دەقـەكان و پـەيوەندى خۆ بەخۆيان هـەروەها پـەيوەندييان بـە سروشـتى نێـو دەرووونـەكان و بوونەوەريانـەوە دەبێتـە بنچينـەو بنەمايـەك كـاتێك دەمانـەوێت لـە دەقـەكان و حەقيقـەتى مەبەسـتيان و جـۆرى ئاڕاسـتە تيايـاندا بگـەين پێويسـتە بـۆى بگێڕينـەوە. ئـەوەش ئـەم ڕاسـتييە دەسـەلمێنێ كـەمى بايـەخ دان بـووە بـە(ئەسـبابى نـزول)ى ئايەتـەكانى قورئـانى پـيرۆز و كـەمى نوسـين و دانـراو لـەو بارەيـەوە هـەروەها كـەمى ئـەو دەقانـەى كـە بـارودۆخى هاتنـە خـوارەوەى ئايـەت و هۆكارەكـانى تيايـاندا ڕوون كرابێتـەوە، سـەبارەت بـە سـوننەت و بـارودۆخى ئـەو فەرمودانـەى پێغەمبـەر(ﷺ) كـە ڕيوايـەت كـراون و ديسـان هۆكـار و موناسـەبەى فـەرموودەو ڕێكخسـتنيان بەپێى زەمانيان ئـەوا زانسـت و بايـەخى پێويسـت بـەو بـوارەو نووسـين لەسـەرى كـەم تـرەو بـەڵكو دەگمەنـە.

وە چـەمكى پرۆگرامـى كلاسـيكى بـاو بـۆ نەسـخ لـەچوارچێوەى توێژينـەوەى ئوصولـى پرۆگرامـىدا بـەواتاى تێكگـيران و هەڵوەشـاندنەوە لەسـەر ئاسـتى تشـريعاتى دەسـتكرددا چەمكێكـە بـەڕووى هەسـتى بيريـار و ياسـادانەر و سـەركردەدا هـەڵ دەتەقێتـەوە كـاتێ لـەجێى كـات و شـوێنى خۆيـەوە ئـاوڕ بـەرەو سـەردەمى پـەيام دەداتـەوە بـە مەبەسـتى زانينـى ئـەو ئاكامانـەو هۆيـەكانى پـەيڕەوكردنى ئـەو مەعريفـەو ئەحكامـەو بەديـهێنانى ئـەو سياسـەت و وێنـاو چارەسـەرانە كـە دەوريـان داوە لـەو بـارودۆخ مـل ملانـێ و پێداويسـتيانەى كـە لەزۆربـەى بارەكـاندا لـەڕووى پێكـهێنان و ڕێكخسـتن و بەرايىيـەكانى جيـاوازن لـەبارودۆخ و پێداويسـتىيەكانى سـەردەمى پێغەمبـەر(ﷺ). ئـەم بـارودۆخ و پێداويسـتيانە بـا لەهـەندێ ڕووكاريشـەوە

لەکۆی سەردەمی پەیام بچن بەڵام لەزۆر ڕووەوە لەبارێك یان ڕوداوێکی تایبەتدا جیاواز دەبن لەسەردەمی پەیامو قۆناغو بارودۆخەکەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ڕوویداوە.

ئەمڕۆ خوێنەری موسڵمان تێبینی ئەوە دەکات کە واتای نەسخ بەو شێوە کلاسیکییەی زۆر لەبنەما سەرەکییەکانی سروشتو پەیام هەڕەشەی لێدەکاتو هەڵی دەوەشێنێتەوە،و بوارەکانی پەیامو ڕەهەندەکانی کورت دەکاتەوە تەنها لەسەر دوا دەقەکانی دابەزیو لە قورئانو ئەوەی بۆ سەردەمی دووەمی قۆناغی مەدەنی لە مومارەساتی پێغەمبەر پێداویستی موسڵمانان پێویست بوو.

لەنموکانی کە ئاسەواری خراپی واتا کلاسیکییەکەی نەسخ(سڕینەوە) دۆزی پەیوەندیی نێوان موسڵمانانو نا موسڵمانە،و ئەوانەشی لەسەر ئەمە بینا دەکرێت لەچەمکی بانگەشەو پەیوەندییە دەوڵەتییە شارستانیەکان، هەروەها دۆزی پەیوەندی قۆناغی مەدەنی بە قۆناغی مەککییەوە، ئەوەش دەکرێت لەنێوانیاندا پەیدا دەبێت لە پەیوەندی(تناسخ)و کاریگەری ئەمەش لەسەر بانگەشەو یاسادانانی ئیسلامیو ستراتیژی کاری سیاسی ئیسلامیلەم سەردەمەدا.

وە لەبواری پەیوەندی نێوان موسڵمانانو ناموسڵمانان بۆمان دەردەکەوێ کە ئایەتی (شمشێر) هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت:ـ(فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم) التوبە:٥٠ نموونەیەکی ڕوونو ئاشکرایە لەسەر ئاسەواری ناهەمواری باوی پرۆگرامی نەسخی کلاسیکی. ئایەتی(شمشێر) لەکۆتایی سەردەمی مەدەنی دووەمدا دابەزی لەو کاتانەدا موسڵمانان بەهێزو سەرکەوتوبوون،ئەم دابەزینەش لەبارەی بەرەنگاری ئەو موشریکە عەرەبیانەوەبوو کەزیادەڕەوییان کرد لە دوژمنایەتی موسڵمانانو دەست درێژی کردنەسەریان وە پەیمان شکێنیان سەرەڕای تێپەڕبونی زیاتر لە ٢٠ ساڵ بەسەر دەعوەو ئاشتی خوازیو چاکە کاریو ئارام گرتنی موسڵمانانو دەوڵەتەکەیاندا، ئیتر قورئانی پیرۆز فەرمانی پێکردن بە کوشتاری ئەو موشریکە دڵ ڕەقو دڕندانە کە هێشتا لە ژیانێکی دواکەوتویی کۆمەڵایەتیو شارستانیدا دەژیان لەبەر ئەوە پێویستە زۆر توندوتیژی لەگەڵیان بەکاربێت تا ملکەچ بکەن بۆ ئیسلامو بچنە ناو کۆمەڵگەیەکی شارستانی ڕێكو پێك تا حاڵیان باش ببێو دەرونیان پاك بکرێتەوەو واز لەو دوژمنایەتی بهێنن، ئیتر ئازاری کەس نەدەنو واز لەدڵ ڕەقیو گیانی دوژمنایەتیان بێنن کە دەرەنجامی پێکهاتە کۆمەڵایەتیە سەرەتاییەکەیانەو

دژ بەخۆیان و ئیسلام و موسڵمانان.لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە واتای (نەسخ) لەپرۆگرام گەرایی کلاسیکیدا ئەو دەلالەتە ڕابەرە خوازراوەی کە پێوەی بەندەو بۆ ئەنجامدانی هاتۆتە کایەوە بەدەست ناخات کە ئەویش مەبەستی چاکسازیو پاڵفتەکردن و بەرپەرچ دانەوەی ستەمکارو دەست درێژی کارە بەهۆی هێزەوە، بەڵکو ئەم چەمکە واتە(نەسخ) بوارەکانی بانگەشە هەمووی دەگرێتەوە لەگەڵ پەیوەندی مامەڵەکردن و ووتووێژ لەگەڵ غەیرە موسڵمانانیش لەگشت باری دۆخێکدا، تا دەگاتە هەڵوەشاندنەوەی چەمکەکانی لەبارەی (معاملە المثل) واتە مامەڵەی هاووێنە، هەروەها مامەڵە باشی لەگەڵ چاککارداو دڵڕاگرتنی، بەمەش چاوپۆشی لەیەك کردن دەبێتە کارێکی تایبەتو بەرتەسك، و تەنگەبەر کردنەوەی چەمکی ئازادی بیروباوەڕیش ئەبێتە ڕێساو پەیڕەو لەگەڵ ئەوانەی کە دەقی ئاشکرا سەبارەتیان نەهاتوە لەبواری چاوپۆشی کاریی باوەڕدا، بەمەش ڕەفتارو ئاکاری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەهلی کیتابو مەجوسەکاندا ئەو دەلالەتە لای ئەوان ناگەیەنێ کە ئەمە چەمك و واتایەکی گشتگیرەو هەموو پەیڕەوەکانی ئاین و بیروباوەڕە ئایینیە ڕوناکخوازە شارستانیەکان دەگرێتەوەبەڵکو ئەو دەلالەتەی ئەوان ئەوە دەگرێتەوە کە ئەوانە چەند دەقێکی بەرتەنگی سنوردارن تایبەت بەسێ گروپی ئایینیو بەس (جولەکەو گاورو ئاگرپەرستان).

ئەم دۆزەو دوا ئاکامی ئەو ئەنجامە زۆرانەی لێی کەوتۆتەوە زۆربەی لایەنەکانیم.

بە برێکی ئاڕادەیەك دوورودرێژ لەکتێبەکەمدا (نظریة الاسلام فی العلاقات الدولیة: توجهات جدیدە فی الفکر والمنهجیە الاسلامی)(١) باس کردووە وە ئەوەشم تیا ڕوون کردۆتەوە کە تەنها نەگونجان و نەیاری ئەحکام و دەقە ڕوکەشەکان مانای ئەوە نییە کە یەکتری هەڵدەوەشێننەوە لەزۆربەی کاتدا بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کە ژیانی مرۆڤایەتی بە پێی بارودۆخە جیاوازەکانی پێویستی بە هەڵوێست و ئەحکامی جیاواز هەیە،و هەرکاتێ پەیوەندیو مەرجەکان و بارودۆخی بابەتیانەی هەر حوکمێك یان ئاراستەیەك هاتەدی ئەوا دەبێتە هەمان حوکم و ئاراستەی مولزم بۆ موسڵمانان، بەم شێوەیەش گەر ناموسڵمانێك باش ڕەفتاری لەگەڵ موسڵمانانی دەوروبەری کرد، ئەوا لەسەر موسڵمانان پێویست دەبێ باش

---

(١) The Islamic Theory of Internationd R elations: new Directions for Islamik Methodology and Though, Dr. Abusulayman, 1987, pp. 73-74.

لەگەڵیا بجوڵێنەوە، بەڵام گەر ناموسڵمانێ دوژمنایەتی ئیسلام بکات و دەست درێژی بکاتە سەر موسڵمانان تەنها شەڕو بەرەنگاریی بەگەم زانین بەرامبەر بەو دەکرێ. وەنابێ ئەم دووحاڵەتە تێکەڵ بکرێ و چەمکی نەسخ بوونەوە بخرێتە نێو دوو کاروباری جیاواز، کەواتە هەرکاتێ بنەماو پێکهاتەکانی حاڵێك دابین کرا ئەوا پێویستە خەڵکیش بە پێی ئاراستەی ئیسلامی مامەڵەو بەر خوردی لەگەڵ بکەن لەو بارەدا، گەر بارەکەش گۆڕا بۆ بارێکی تر هیچ مانایەك نامێنێتەوە بۆ سووربون لەسەر باری پێشوتر، وە پێویستە حوکم و ئاراستەیەك پەیڕەو بکرێ کە پەیوەندی بەم بارە تازەیەوە هەیە. ئەوەش ئەو گومانەمان بۆ ڕون دەکاتەوە کە سەبارەت بە چەمکی نەسخ کردنەوەی ئایەتی شمشێرە بۆ ئایەتەکانی تری پەیوەندیدار بە لێبوردن و باش مامەڵەکردن و فەرمان بەچاکەکردنەوە و پەیوەندی موسڵمانان بەو ناموسڵمانانەی زیانیان نییەو دەست درێژی ناکەنە سەر موسڵمانان. لە ڕاستیدا واتای لابردن و سڕینەوە بەو مانایە کە داواکاری پێغەمبەر(ﷺ) دوائایەتی قورئان ئەبنە ناسخ و سڕینەوە بۆ تەشریعاتی پێشوو قورئان و ئەحکام بریتییە لەهەڵوەشاندنەوەی پەیامی پێغەمبەرایەتی و ئاراستە هەتا هەتاییەکانی و پاڵپێوەنانی بەرەو تەنگە بەرترین ڕێگە..

پێغەمبەر(ﷺ) کۆچیدوایی کرد، لەکاتێکدا دوایین بارودۆخی کۆمەڵگەکەی ئەو پەڕی هێز و دەسەڵات بوو، وشەیان بەرز و بەڕێز بوو لە دوورگەی عەرەبیدا، زۆربەی ئەوەی کە گونجاوی دەوڵەتەکەی پێغەمبەر بوو لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامی دوای خۆیشی گونجاو بوو لەسەردەمی ئیجتیهادو دانانی ئەحکام و فقهی ئیسلامی لە سەردەمی دەوڵەتەکانی (بنی امیە) و (بنی عباس) و سەرەتای دەوڵەتی(بنی عثمان)یشدا، بەڵام ئەمڕۆ حاڵی موسڵمانان حاڵەتێکی لاوازەو زۆر لەحاڵەتی کۆمەڵی موسڵمانان دەچێ لە(مەککە) یان حاڵی کۆمەڵەکەی (حەبەشە) یان حاڵی دەوڵەتەکەیان لەسەردەمی مەدەنی یەکەم تا پێش صولحی حودەیبییەو ڕزگارکردنی مەککەش، کە ئەوان لەژێر گەمارۆو بەرچاوی دوژمنەکانیاندابون و هەڕەشەی لەناوبردنیان لێ دەکرا، گەر لەشەریعەتی ئیسلام و پێشینەکان و ڕێکخستنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سیاسەت و ستراتیژی هەڵوێستی دوای صولحی حودەیبییەو ڕزگارکردنی مەککە وردببینەوە زۆر شت وەك گەلانێکی چەوساوەی لاوازی ڕێپێنەدراوی کەم دەست و توانا فێردەبین لە شێوازی بەرەنگاری ئەو ململانێیەی کە دوژمنە بەهێزەکان سەپاندوویانە بەسەرماندا، هەروەها لەو

رێکخستن‌و سیاسەت‌و شێوازانەی کە پێویستە دوای کەوین لەبواری سیاسەت‌و ئابوری‌و سەربازییەوە بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو بارودۆخ‌و ململانێیانە سەرەڕای لاوازی‌و کەم‌و کوڕی لە کەرەستەی خۆمان‌و نەتەوەکەمان لەبەردەم دوژمنە بەهێزە دەسەڵاتدارەکاندا.

وە نمونەی دووەم کە چەمکی کلاسیکی (نەسخ) لەبارودۆخی ئەمڕۆدا ڕون دەکاتەوە ئەوەیە کە لەهزری ئیسلامی هاوچەرخدا پێگەییوە سەبارەت بە ستراتیژی‌یەتی کاروباری بانگخوازی‌و تەشریعی ئیسلامی وە پەیوەندی‌یەکەشی بەدۆزی هەردوو قۆناغی مەککی‌و مەدەنی، لەم بارەیەوە هزری ئیسلامی سەردەم بۆتە دوو کۆمەڵ، کۆمەڵێك وادەبینێ کە قۆناغی مەککی بەسەر ئەمڕۆدا دەچەسپێ‌و جێ بەجێ‌دەکرێ‌و وا ڕادەگەیەنێ کە موسڵمانان لەقۆناغی مەککی‌دان لەبارەی کاروباری شەریعەت‌و ئەحکام دا، بانگەشەش بۆ خەریك بون تەنها بە کاروباری عەقیدەوە ئەکەن بێ گوێدانە پەرستش‌و مامەڵەکردن‌و ئەو ڕێکخستنانەی کە چەقی کاری قۆناغی مەدینە بون، کۆمەڵی دووەم سەردەمی ئەمڕۆ وەك سەردەمی مەدەنی دووەم سەیر ئەکات، موسڵمانان خۆیان دەوڵەت‌و کۆمەڵگەی بەهێزن لەدورگەی عەرەبی‌دا، تێ‌ڕوانین سەبارەت بەبونی جیاوازی بارودۆخی ئەوسای موسڵمانان‌و هەڵوێستیان لەگەڵ بارودۆخ‌و هەڵوێستی ئێستایان ڕەت دەکەنەوە ئەوەش لەدەرچەی چەمکی ئەو(نسخ)ەوە بون کە پەیوەست بون پێوەی. ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە تەشریعات‌و حوکمەکانی سەردەمی مەدەنی پێویستە شوێنیان بکەوین‌و پابەندبین پێیانەوەو ئەمانەش ناسخ کەرەوەی هەرشتێکن کەپێشوتر هاتووە لەوانەی نەیارن لەگەڵ حوکم‌و تەشریعاتی سەردەمی مەدەنی، وەبەلایانەوە وایە کەتەنها دەبێ پابەندی ئەو فەرمانانە بن کە دوافەرمان‌و ڕاسپاردەی پێغەمبەرن(ﷺ)، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی لە تەشریعات‌و واقعی قۆناغی مەدەنی دووەمدا خۆی دەبینێتەوە، وەهیچ شتێك بۆ ئەو دەقانە نەماونەتەوە کە تایبەتن بە قۆناغی یەکەمی مەدەنی مەگەر تەنها پاداشت وەگرتن لەسەر خوێندنەوەیان وەك بەشێك لەقورئان چونکە چەمکی بەهەڵە تێگەیشتن لە(نسخ) ئەو دەقانەی لەناو بردووە.

گومان لەوە ناکەین کە بە چەند دەقێك دەقی تر سڕاوەتەوە، هەر وەکو چۆن گومانمان لەوە نی‌یە کە ئاین‌و پەیام لاشەیەکی تەواوکەرن بۆ یەکتر بە خەڵکی ڕاگەیەندراوەو پێویستە دوای کەون لەبەر ئەو بەرژەوەندیانەی کە

تیایاندایە بۆ هەردوو ژیان، بۆیە بواری ئەوە نییە بڵێین کە تاکێك یان کۆمەڵێك لەقۆناغێکدان وەك قۆناغی مەککیو ئیتر پێویست ناکات پابەندبن بەوەرگرتنی ئەو تەشریعانەی هاتون لە قۆناغی ئایندەدا کە قۆناغی مەدەنییە.

بەڵام پێویستە روون بێت کە ئیسلامو پەیامو پلە بەندی تەشریعەکەیان بە درێژایی کاتو شوێن، بەچەند قۆناغێکی جیاوازدا تێ پەریوەو رێگەی پێوانی ئەم پلەبەندیو قۆناغو دابەزینانە بەشێوەیەکی نەگۆرِیو جووڵە بەرانبەر ژینگەو سەردەمی داهاتووەوە نییە، هەروەها هیچ رێگەیەکیش نییە کەدروست بێ بیگرینە بەر لەتوندرەوی کردن لەچەمکی هاوجووت کردنی تەواوەتی کە ببێتە هۆی هاتنەدی چەمکی شوێن کەوتنییەتی تەنها بۆ تەشریعاتێ لەو سەردەمەدا جا (مەککی)بێ یان (مەدەنی)بێ دانراوە، بێگومان ئەو کەسەی کەپاش هاتنی ئیسلامو دابەزینی پەیامەکەیو جێبەجێبونی بێتە ئاراوە، هەرگیز حاڵی بەراورد ناکرێ لەگەڵ کەسێکدا کەخۆی لەقۆناغی دابەزینی ئەو پەیامەدا ژیابێتو رووداوەکانی بەچاوی خۆی ببینێ ئیتر نەئەرکێکی لەو سنورە بەدەری دەخرێتە سەرشانو نەشتێکی زیاتریش، تەنها لەوە دەزانێ لەرووی چۆنیەتی رووداوەکانو تەشریعەکانی کە لەو قۆناغەی خۆی تیایدا بووە دابەزیوە.

وە دۆزی راستەقینە لێرەدا دۆزی بەشێتیو گشتگیرییە، لەگەڵ پرۆگرامگەرایی هزری ئیسلامیو لاوازی هۆشیاری سەبارەت هەردوو رەهەندی شوێنو کات لەقەوارەی کۆمەڵگەکاندا، وە پەیوەندی سروش (وحی) وەك چاوگێك بۆ مەعریفەی بەعەقڵو فیطرەوە، وەك چاوگی دووەمی مەعریفە یەکانگیرنو یەکتری تەواو دەکەن بۆ دابینکردنی تواناو رێ نیشاندانی مرۆڤ تا رۆڵی خۆی لەبنیاتنانی خێری سەر زەویدا ببینێ، بێ گومان بارودۆخو تواناو پێویستی تاکەکانو کۆمەڵگاکانو جیاوازن لەگەڵ ئەو تەحەددیاتانەی بەدرێژایی کاتو شوێن رووبەرووی دەبنەوە، لەکۆمەڵگە کۆنو هاوچەرخەکاندا پێویستو تواناکان چون یەك نین، هەروەها سیاسەتو سستمەکانیشیان هەر پێکەوە هاوشێوە نابن بەتەواوەتی تەنانەت کۆمەڵگەکانی یەك سەردەمیش، لەزۆربەی بارەکاندا لەیەکتری جیاوازن هەر وەکوو ئەمڕۆ لەهەر پێنج کیشوەرەکەدا دەبینین، بۆیە جیاکردنەوەی بارودۆخی کۆمەڵگەکانو سیاسەتەکانیان وە بارودۆخی تاك لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی ترو لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، پێویستی بە چارەسەرێکی تایبەتمەندی جیاواز هەیە کە بەواقعی خۆیەوە گرێ درابێت،

وەبەو کۆمەڵگەو سستەمەی کە بۆی مل کەچە، هەر چەندە گەر ئەندام بێ لەزۆرینەیان لەکەمینەی جەماوەردا، موسڵمان بێت یان ناموسڵمان. وە لەئاکامی تێڕوانینێکی گشتگیردا بوار بۆ باسی قۆناغی مەککیو مەدەنی نامێنێتەوە، بەڵام پێویستە تێڕوانینەکان زیندوو گشتگیربن لەبەر ڕۆشنایی سوننەتەکانی فیطرەتو مەبەستەکانی شەریعەتو هەموایەتیەکەیو ئاراستەکردنی کۆمەڵگەکانو تاکەکانی بە فقهێکی بزافیو هزرێکی زیندووی وا کە پڕاوپڕی پێویستیەکان بێ بێ چەق بەستن یان بە پێوانەیەکی نائاسانی دەستکرد (هەروەك جمهوری (اهل الحل والعقد)ی کە پابەند بەئیسلامەوە دەڵێن) هەموو تاكو کۆمەڵگەیەك قۆناغێکی تایبەت بەخۆی هەیە، لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتو فیطرەتو ئامانجو مەبەستەکانیدا، موسڵمانان لەژیانی خۆیاندا ڕێنومایی لەو قۆناغە وەردەگرن کەپێشتر بانگخوازانی دەوڵەتەکەیانی پیا تێپەڕیوە، بەم شێوەیە تاكو کۆ بۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکانی پەیامو جێنشینیو بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی موسڵمان دەگەنە گەورەترین وزەی ئیسلامیو دەستگیریان دەبێ.

وە لەنمونەکانی ئەو دۆزە هزریەی کە نەتەوە بەدەستیەوە نالاندویەتی بەهۆی کەموکوڕی پرۆگرامگەرایی ئیسلامی بەواتا کلاسیکیەکەی یان شێوازی بەکارهێنانیو مامەڵەی ڕۆشنبیرانو توێژەرەوە موسوڵمانەکان لەگەڵ سەردەمەکانی دواییدا، لەو دۆزانە دۆزی سووخواردنو چەمكو بوارو ئاراستە قورئانیەکان سەبارەت بەو سوو خواردنەو مانای مومارەسەی سوننەتی پێغەمبەر لەو بارەیەوە، وە ئەم کەمو کوڕیو دەستەوستانیە گەر لێی وورد بینەوە دەگەڕێتەوە بۆ تەسك تێ ڕوانینی زۆربەی سەرکردە هزریە ئیسلامیەکانی ئەمڕۆمانو تەسکیی بواری زانستیو شارەزاییان سەبارەت بەژیانی کۆمەڵایەتیو ئابووری، ئەمەیشە کە هزری ئیسلامی خستۆتە نێوخۆی ڕاستە قیاساتی بەتاڵی ئەوتۆ کە مەبەستەکانی شەریعەت لەبواری ئابووریو ئەو یاسایەی کە پەیوەندن پێوەی لێی دابڕاوە، هزری ئیسلامی گەیاندۆتە ئەوەی کەتەنها بەڕوخسارو ناوو ناونیشانەوە سەرگەرم بن، بە فرە بۆچونیو فرە ڕاییو دژواری ئەو بۆچوونانە سەبارەت بەکاروباری چەمکی سوو لەگەڵ ڕەهەندو ئامانجەکانی تائەم بۆ چونانە زیاتر لەبیست مەزهەبی لێ کەوتەوە. ئەوەی لەم بوارەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کەهەندێ لەم مەزهەبانە فەرمودەیەکی گرنگی صەحیحیان پشت گوێ خستووە کەئەگەر لێی وورد ببینەوە سەبارەت بە

بۆچونێکی گشتگیری ئابووری یارمەتی دەداین کە هەندێ لەسیاسەتە ئابوورییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) تێبگەین لەگەڵ ئەو قۆناغەش کەئەو سیاسەتانەیان پێدا تێپەڕ بووە، ئەوەش ئەو فەرمودەیەیە کە بوخاری‌وموسلم لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەیگێڕنەوە پێغەمبەر فەرموویەتی: (لاربا الا فی النسیئە)، واتە: سوو (ربا) تەنها بەوە دەڵێن لەسەر (نەسیئە)[٢] وەردەگیرێ، دوای ئەوەی پێغەمبەر هەموو فەزڵەتە وەرگرتنێکی سەبارەت بە ئاڵوگۆڕکردنی کاڵا باوە سەرەکیەکان قەدەغە کرد کە شەش جۆر کاڵای دەگرتەوە. جا بەهۆی ئەو کەرتە تێڕوانینەو لەسەر هەمان شێواز هەندێ لەو مەزهەبانە ڕێگەی فێڵو بەدواداگەڕانی شکڵیات‌و ڕووکەشی دەقەکانیان گرتە بەر بۆ پاساوهێنانەوەی کەرتە واتاو لێکدانەوەکەیان وەك لەحەدیسی (رافع بن خدیج)دا کە سەبارەت بە ئاڵوگۆڕی کشتکاری پێغەمبەر فەرموو بووی، بەم پێیەش خۆیان بڕیاری نیوەی بەرهەمیان بۆ خاوەن زەوی‌دا بەمەرجێك تووەکە پێوەبکات.(٣) هەندێکی دیکە ڕێگە چارەیەکی تریان گرتۆتە بەر، ئەویش بریتی‌یە لەجاڕی لێ‌کەوتوویی‌و فەوتاندنی مەبەستەکانی تەشریعی ئیسلامی لەڕووی ئابووری‌وپەندەکانیەوە. ئەوەش لەبڕیاردان لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەوەی دەربارەی سوو هاتووە شتێکی هەڵپەسێرراوی پەرستشیانەیە لەچوارچێوەی حەرفیەتی دەقەکاندایەو ئەو شەش پۆلە ناگرێتەوە کە دەقی فەرموودەیان لەسەرە کە ئەویش فەرموودەی (ربا الفضل)ە(٤).

بەهۆی ئەم کەم‌و کوڕیەی لەپرۆگرام‌و دواکەوتنی هزری ئیسلامی لەبواری سیاسەتی ئابوری‌و مومارەسەو جێگرەوە خوازراوەکاندا گۆڕانکارییەکی

---

(٢) النسیئە (لێرەدا) دوا خستنی سالانەی ماڵ‌و دارایی گێڕانەوە.

(٣) ئەو فەرمودەیەی کە(دەربارەی رافع کوڕی خدیج)ە بەچەند بێژەو شێوازێکی جیاواز گێڕاوەتەوە بەناوبانگترینیان ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە لە(مخابرە و محاقلە)، وە لەهەندێ گێڕانەوەدا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی(هەر کەسێ پارچە زەوی‌یەکی هەیە بابیکات بەکشت‌وکاڵ نەیداتەکرێ لەسێ‌یەك یان بەچواریەك یان بە بەرامبە خۆراکێکی دیاریکراو)

(٤) بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتر سەبارەت بەچەمکی سوو لە ئیسلامداو فەلسەفەی ئامانج‌و حیکمەتە سیاسی‌یەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەیەوە، بگەڕێرەوە بۆ پێشەکی توێژینەوەی نوسەری ئەم کتێبە سەبارەت بە تیۆرە ئابورییە ئیسلامی‌یەکان لەم کتێبەدا: Contem porary aspects of Economic and socia Thinking in Jslam. American Trust publications. Plain Field. Jndian. 1976. وە ئەفەرموێ بە(ربا الفضل)ناسراوە فەرموودەیەکی ڕاست‌و دروستە (ابو سعیدی خودری‌و عبادەی کوڕی صامت)(خوا لێیان ڕازی بێت)گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی(ئاڵتون بە ئاڵتون، زیو بە زیو، مس بە مس، وە جۆ بە جۆ، خورما بە خورما خوێ بە خوێ هێند بە هێند، بۆ نمونە: دەستێك بە دەستێك. جا هەرکەسێ لەوە زیاتر وەربگرێ یان زیاتر بدات ئەوا سووی خواردووە، بەخشەرو وەرگر تیایدا یەکسانن)ئەم فەرموودەیە موسلیم لە صەحیحەکەی‌دا هێناویەتی وە ئەحمەدیش لە سەنەدەکەیدا.

پرۆگرامیی گرنگ ڕویدا کاتێك کەسانی پسپۆڕی پابەند بەئایینی ئابووریناس جێی خۆیان گرت بەدیدێکی هونەریی گشتگیرییەوە لەگۆڕەپانی لێکۆڵینەوەی ئابووری ئیسلامیدا کە مایەی مژدە بەخشینە بە ڕزگارکاریەکی پرۆگرامیی هزری ئەوتۆ ئومێدی دەست بەکاربونی لێ بکرێت سەبارەت بەچاکسازی لەلایەنەکانی هزرو پرۆگرامگەرایی ئیسلامی هاوچەرخ لەم بوارەدا، بەشێوەیەك کە جارێکی تر بە پشتیوانی خوای گەورە هزری ئیسلامی زیندەیی‌و گشت گیرییەکەی خۆی بۆ بگەڕێتەوە.

وە هەروەها لە نمونەکانی کەم‌و کوڕی پیاوانی مومارەسەی پرۆگرامگەرایی ئەوەیە کە قودسیەت‌و پیرۆزییەك دراوە بە وتەی پێشینەکان (خوا لێیان ڕازی بێت) سەبارەت بەچەمك‌و لێکدانەوەو ئیجتیهادەکانیان‌و تەماشاکردنیان هەروەك بەشێك لەسوننەت‌و سروش، سەرەڕای ئەوەی کە کەم‌وکوڕی مرۆیی‌و سنورداریی شوێن‌و کاتیمان زانی‌و بۆمان دەرکەوت، وە سەرەڕای ئەوەی کە بەشێوەیەکی تیوری جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە پیرۆزی تەنها بۆ سروش نەبێ، بۆ هیچی تر نییە، بەڵام لە توێژینەوەکانماندا، ئێمە توێژینەوە لەسەر وتەی پێشینەکان ناکەین تا بەدیدێکی ڕیشەیی ڕەسەن بڕوانینە مومارەسەی واقع‌و وەڵامی پێداویستیەکانمان بدەینەوە، بەڵکو ئێمە ئەیان خوێنین تالاساییان بکەینەوەو شوێن پێی ئەوان هەڵگرین، خۆمان ماندو دەکەین تا بەقیاس لەسەر ئەوان بەسەر باروددۆخی خۆشماندا جێ بەجێیان بکەین وەك وەڵامێك بۆئەو شتانەی لەدەروناندا چەمکێکی هەڵەیان دروست کردووە بۆ واتای ئەو قودسیەت پێدانەو گەورە کردنانەی خراوەتە پاڵ پێشینەکان‌و بەرهەمەکانیان، تا ئەو چەمك‌و واتایە ــ بێ هۆشانە ــــ گۆڕرا بۆ ترس‌و بیمێك بێ دەسەڵاتی ئێمەی بەرانبەر بەو چەمکانە دەرخست‌و ئەو گەورەکردنە بوو بەچەمکێکی بە پیرۆز زانین ڕاگرتن کە نێوانی ئێمەو گەشەسەندن‌و چاکسازی لەیەك دابڕێت بۆیە دەبینین هەر هزرێك یان فامێکی هاوچەرخانەی گشت گیری لەواقعێکی هاوچەرخەوە دەربچێ بەئاراستەی بەهاو حوکمە ئیسلامییەکان، لای زۆرێك لە خاوەن هزرە کلاسیکییەکان دەبێتە هزرێکی گومان لێکراوی بەرپەرچدراو، چونکە ناگونجێ لەگەڵ وتەی زانایانی سەلەف‌و دیدو بۆچونی ئەوان دەرناخات، لەبەرئەوە ئەگەر ئەوبینیەو چەمکە هزریانە بەسافی‌و بێگەردی نەبێ بۆ دەلالەتەکانی کەلەپوری زانایانی پێشین‌و قودسیەتیان لەسەر لانەبات‌و لەچوارچێوەیەکی پرۆگرامیی

ڕاستەقینەی دەقەکانی قورئان‌و سوننەتدا نەبێ، ئەوا ناتوانرێ سودیان لێ وەربگیرێت‌و ئەو هێزەش وەك کەلتورێکی پرۆگرامگەرایی هەموارو بەجێ ئامانجی خۆی ناپێکێ لەبواری کارامەیی‌و زانستێکی بەرفراواندا بۆ چارەسەرکردنی دۆزەکانی سەردەم، وە بۆ گەڕانەوەی ئیسلام بۆ واقعی ژیان‌و مومارەسەی کۆمەڵگاکان‌و کاروانی شارستانی‌یەکان.

بەکورتی بۆمان ڕوون بۆوە کە پرۆگرامگەرایی کلاسیکی ئیسلامی بەگشتی وەڵامی پێویستی سەردەمی پێکهاتەکەی‌و بارودۆخی سیاسی‌و شارستانێتی‌یەکەی داوەتەوە، وەزۆربەی لایەنە کەم‌و کوڕەکان دەرەنجامی پەککەوتنە لەقەڵاچۆکردنی هۆکارەکانی لێ ڕزگاربوون‌و بەربەرەکانی‌کردنیان، پاشان وەستاندن لەبەدواچونی ئەو گەشەیەی کە لەگەڵ پێشکەوتنی ژیان‌و بەرەوپێش چونی زەمەندا یەکانگیرە، هەروەها کاتێك کە لێکۆڵینەوە ئوصولی‌یەکان وەڵامێك دەبن بۆ پێداویستی‌یەکانی توێژینەوەیەك سەبارەت بەدەقەکان‌و پاراستنیان، واتە ئەو یاسایانە تۆوی پرۆگرامگەرایی پێویستی لەخۆگرتووە بۆ توێژینەوەو ڕوانینە ڕوکارە جیاوازەکانی مەعریفەی کۆمەڵایەتی، لەهەمان کاتدا بنەماکانی بنچینەیەکیان لەخۆگرتووە کەدەبوو توێژەکانی بە دوادا هاتوو بەدوایاندا بچن‌و بنیاتیان لەسەر بنێن هەروەها گرنگە کەم‌و کوڕی پرۆگرامگەرایی کلاسیکی بزانین هەروەك ئەمڕۆ بەکردەیی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ، ئەویش تەنها ناگەڕێتەوە بۆ خودی پرۆگرامەکە بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ چەند ڕوکارێکی تری کەم‌و کوڕی لەبواری مومارەسەی کردەییانە لەچوارچێوەی توێژینەوە ئیسلامی‌یە هاوچەرخەکاندا کە تەنها چەند لایەنێکی ئەم پرۆگراگەرایی‌یەیان گرتوتەوە نەك هەموویان، ئەویش بەهۆی کەم‌و کوڕی لەتێگەیشتنی ئەم پرۆگرام گەرایی‌یەو مەدلولەکانی، وەبەهۆی تێکەڵاوکردنی چەمکی هەندێ لەڕەگەزەکانی پرۆگرامگەرایی‌و دۆزو کەرەسەکانی توانا‌و گەشەیوو جێ بەجێکردنەکردەیی‌و ژیاریەکەی لەم سەردەمەدا.

گرنگە لێرەدا ئاماژە بۆ دۆزێکی پرۆگرامگەرایی بکەین کە پەیوەستە بەدەقی سوننەتی پێغەمبەر وەك بنەچەو سەرچاوەی هێزی ئیسلامی هەروەها پەیوەستیشە بەکاری کەلتوری‌و بڵاوکردنەوەو پۆلین کردنی‌یەوە، بەڵام ئەوەی سەیرە سەرەڕای تێپەڕبونی چەند سەدەیەك بەسەر پێغەمبەرایەتی‌دا تائێستاش دەقەکانی سوننەت نەزانراون لای زۆربەی خاوەن زانست‌و ڕۆشنبیرانی موسڵمان،

هـەروەها تائـەمڕۆش سـەبارەت بـەم دەقانـە ڕاوبۆچونـی زۆرو زاراوەی زۆر لـەکتێبو دەسـت نوسـەکاندا هەیـە کـە بوونەتـە هـۆی ڕێگـری لەمامەڵـەی ئاسـانو کاریگـەر لەگـەڵیانو سودیان لیٚ وەرنـەگیروە بـەهۆی زۆریو بـڵاوی زاراوەکـانو بـاش نەخسـتنە ڕوویـان، تەنانـەت گـەر کەسێك بیـەویٚ یـەکیٚ لـەو دەقانـە وەك بەڵگـە بهێنێتـەوە ئـەوا دەنـگو هەرایـەکی زۆر بەرامبـەری بـەرز دەکرێتـەوەو ڕەخنـەی لیٚ دەگـیریٚ تەنانـەت دەگاتـە ئـەو ئاسـتەی کـە دۆزی بابەتەکـە لـەنێو ئـەو هـەموو دەنگانـەدا ببێـت بەدۆزێکی پـڕ لـەمقۆمقۆ سـەبارەت بەدەقەکـەو گێڕانـەوەی زاراوەکـانی نـەك لـەبارەی دەلالـەتو لایـەنو ڕووی سـوود لیٚ بینین، لەبەرئـەوە هیـچ بوارێـك نیـیە بـۆ چاکسـازی هزریـی پرۆگرامیـی کاریگـەر مەگـەر ئـەو کاتـەی کـە دەقـە ڕاسـتەکانی سـوننەت بەشـێوازێکی ئاسـان گەڵاڵـەو ڕێـك بخرێـت بـەو شـێوەیەی بەئاسـانی بتوانـریٚ نـاوەڕۆکی ئـەو فەرمودانـە لەسـەر دەسـتی زاناکـان بەگشـتیو ڕۆشـنبیرو پسـپۆڕانەوە بنوسـرێت بۆئـەوەی سـودیان لیٚ وەربگرێـت لەشـێوەیەکی ئاسـانو بـەو متمانـەوە لەهـەموو بوارەکـانی زانسـتدا.

پاشـان ڕێکخسـتنەوەی کاروبارەکـانی سـوننەتو دەقـەکانی بـەچاکی بگرێتەبـەرو بەشێوەیەکی ڕێكو پێكو ئاسان پۆلێن بکـریٚ لەخڵتـەو ئیسـرائیلیاتو ئـەو شـتانەش بێگـەرد بکرێتـەوە کـە بـەنیازێکی پاکـەوە یـان خراپـەوە هاتونەتـە نـاوی،و پۆلـین کردنـی لـەم چـوار گروپـەدا کە ئاشکراو ڕوونـن لـەڕووی پـەیڕەو پرۆگرامـەوە:

١. ئەوانـەی کـە دەکرێـت بەڵگـەیان پـیٚ بهێنرێتـەوە بـەهۆی دروسـتی سـەنەدو واتـاوە(مـتن).

٢. ئەوانـەی کـە دەکرێـت هـاودەمیو ئولفـەتیان لەگـەڵ بگـیرێت لەبـەر ڕاسـتیو دروسـتی واتاکانیـان هـەر چـەندە بەڵگـەی یـەکلایی کـەرەوە سـەبارەت بەڕاسـتی سەنەدەکانیان لەبـەر دەسـتدا نیـیە.

٣. ئەوانـەی کـە پێویسـتە هەڵوێسـتەیەکیان لەئاسـتدا بکرێـتو بـەوردی تیـان بڕوانرێـت بەتایبـەتی لـەو شـتانەی کـە ڕوکاری ئاشـکرای مەتنـەکانیانو لـەڕووی واتـاوە لەگـەڵ ڕۆحـی شـەریعەتو مەبەسـتەکانیدا یـەکانگیر نابێتـەوە هەرچـەندەڕەنگ وابێـت سـەنەدو ڕیوایەتـەکان ڕاسـتن.

٤. ئەوانـەیان کـە شایستەی کـار پـیٚ نـەکردنو لابردنـن لەبـەر تێـك چوونـی مـەتنو سـەنەدیان.

ترسناكيى ئـەم دۆزە پرۆگرامىيـە تەنـها لەكـەم تەرخـەمى كـردن سـەبارەت بـە سوننەتى پـيرۆز ناوەستێتەوە، بـەڵكو زۆر جار بـەواتاى مل پــێ كـەچ كردنـى عـەقڵى موسـڵمانە لەسـەر ئەساسـى دەرچـەى تـرس و وەرعـى ئەندێشـەيى لەئاسـتى ئـەو شتانەى كە ڕاست نين، كـە تێك شـكانى دەرچـەو پرۆگـرام گەراييـەكانيى بەدواوەيـە، لەبەر ئـەوەى كـاتێك شتە ناڕاستەكان بەڕاست و دروست لـە قەڵـەم دەدات بـێ گومـان هەست و نەستى و بينايىيـە زانستىيەكەى هـەڵ دەوەشـێتەوە تـاواى لىٚ دێـت كـە شوێن نادياريـيەكى تێك چـووى ئەندێشـەيى بكـەوێ يـان پەسـەندى بكـات كـە هيـچ زانسـت و عـەقڵێكى ڕاست لەگـەڵىدا نىيـەو پەسـەندى ناكـات، ئـەو كاتـە هـزرى موسـڵمان و پرۆگـرام و عەقڵيشـى هيـچ تواناىـەك و بەهايـەكى بـۆ نامێنێتـەوە پـاش ئـەوەى لەسـەر شتى ناڕاست و كردارى ئـەو تـۆ پـەراوەى پـێ دەگرێـت، كـە لەگـەڵ ئـەو دەرچـەو بنـەما ڕاستىيە ئيسـلامىيانەدا يـەكانگير نابێتـەوە - كـە بەمەبەسـتى جـێ بـەجێكردنى - سـروش و شـەريعەت بـەقورئان و سـوننەت و ڕێنمـايى خواىيـيەوە هێناويانـە.

وريـايى لەپاراسـتنى ڕاگيركاريـەكانى هـزرو دەرچـەكانى، وەتـێ گەيشـتنێك بـەووريايى و هۆشـياريـيەوە، سـەبارەت بـە هەموايـەتى شـەريعەت و بنـەماو بـەهاو مەبەستەكانى پێـوەرو ڕێكخـەرى سـەرەكين بـۆ پاراسـتنى سـروش و پـەيام و شـەريعەت لـەفروفێڵ و چەواشـەو وێرانكـارى، هـەروەها بەهـەمان شـێوەو بەهـەمان بريـش لەبايـەخ پـێدان ئەمانـە پێـوەرو ڕێـك خـەرن بـۆ پارێزگـارى كردنـى عـەقڵ و پرۆگرامـى موسـڵمان لـەتێك شـكان و وێـران بـون لەدەرچـەى چـەق بەسـتنى زانسـتى و تۆقـاندنى دەروونىيـەوە.

پاراسـتنى عـەقڵ و پرۆگرامـى موسـڵمان و چـاك بـەجێ هێنـانى واتـە پاراسـتنى ئـاين و شـەريعەت و مرۆڤـى موسـڵمان و عـەقڵ و كۆمـەڵگاى موسـڵمانان، لەيـەك جيانابنـەوەو لەيـەكترى دانـابڕێن، بـەڵكو لەهـەموبارەكاندا پـەيام مەبەسـتەكەيەو، عـەقڵ و دەرك پـێ كردنيش هۆكـارن، خـۆ گـەر هەرەسـى هێنـا يـان تووشـى خراپـى هـات ئامـانج تيـا دەچـێ و مەبەستيش وون دەبێـت.

ئـەوەى كەلەسـەر سـوننەت دەچەسـپێ لەسـەر كارەكـانى كـەلتوريش دەچەسـپێ لـەڕووى پێويسـتيى ئاسـان كارىيـەوە، هـەروەها لـەڕووى پێويسـتى ديدێكـى ڕەخنەگرانـەو نمايشـى ئـەوەى بە سوودو دروستە دوور لەكاريگـەرى هـزرى بـە پـيرۆز گرتـن تـا كـەلتور لـەهزرو ممارەسـەو تـێڕامانـەكانىدا ببێتـە نمونـەو پارمـەتى دەرێـك

بۆ هێزی ئیسلامی‌یانەی زیندوی ڕەسەن‌و هاوچەرخ، نەك هۆكارێك بێت بۆ سەر هەڵ دانەوەو تازەكردنەوەی جەنگە مێژوی‌یەكان‌و بابەتە بێ ئەنجام‌و بەتاڵەكان كە وزەكانمان تیایاندا بە هەدەربچێت‌و پێیانەوە سەرقاڵ بین‌و ئاگامان لەپێویستی‌یەكانی خۆمان نەمێنێ یان ئاگامان لەو شتانە نەبێ كە لەچوار چێوەی مل ملانێكاندا ڕوو بەڕوومان دەبێتەوە.

وە لەو دۆزە گرنگانەی كە پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بكەین - كە پاشان دێینە سەر باس كردنیان - ئەو تێكەڵ كردنەی ڕۆڵی دەق(سروش)و عەقڵە لەپرۆگرام گەرایی ئیسلامی‌دا، كە لەئەنجامی لێل بینی‌و كەمی شارەزایی‌و بەیەكداهاتنی ڕوداوەكان‌و كاریگەری مەبەستە سیاسی‌یەكان لەسەری پێ گەییوە، ئەمەش كاتێك فەیلەسوف‌و فێرخوازانی ژیارەكان‌و ئاین‌و ئەو فەلسەفە نامۆیانە عەقڵی موسڵمانیان - پاش سەردەمی فتح -و بەرێگەیەكی لاڕێی چەوتدا برد، كە ئەویش قوڵ بونەوەیە لەو بابەتانەی پەیوەندی بە(الا لهیات)ەوە هەیە، لەگەڵیشیاندا هەندێك لەسەرانی هێزی ئیسلامی بەرەو هەڵدێر چوون وەك(موعتەزیلەكان)، بۆیە عەقڵی موسڵمان بەرەو بواری هەموایەتی‌و نەزانراوەكان ڕێگەی گرتەبەرو وای لەسەرانی هێزی ئیسلامی كرد — لە كاتێكدا كەوتە تەڵەی ئەو گەمارۆیەی بەسەریدا سەپێنرابو — كە هەست بە مەترسی‌یەكی گەورە بكەن لەسەر بنەچەو بنەماكانی عەقیدەی ئیسلامی، كاكڵەی كاردانەوەشیان وەلانانی عەقڵ‌و نكوڵی كردن لەڕۆڵی‌و كەم كردنەوەی پایەی بوو، وە چەسپاندنی پەككەوتەیی هێزی ئیسلامی بوو بەوەی كە هەمیشە دەقەكان ببەستنەوە بە پرۆگرامێكی وەسفیی زمانەوانی كە شوێنەوارە شوومەكەی بریتی بوو لە زیاتر بێ پیت كردنی هێزی ئیسلامی لەچاخەكانی دواییداو ڕێ خۆشكردن بۆ دژایەتی عەقڵ‌و گومان لەسەر دروست كردنی سەبارەت بە پەیوەندی‌یەكانی بەئیسلامەوە.

### ۳. كەلتورمان: سامانی دوێنێ‌یەو تێشووی كاروان‌و پەندی ئایندەیە:

لە كۆتایی ئەم پێناسە ئامێزە ڕەخنە پەلەیەدا بۆ هەندێك لەگرنگترین دۆزەكانی پرۆگرامگەرایی كلاسیكی ئیسلامی‌و هەندێك مومارەساتی هێزی ئیسلامی هاوچەرخ پێویستمان بە هەڵوێستەیەكی كورت هەیە بۆ وەڵام دانەوەی برێك لەو پرسیارانەی كە دەرەنجامی حاڵەتی فیكری‌و ژیاریی هاوچەرخی

موسـڵمانان‌و ئـەو ئـازارە ڕوو لـەزیادبووە نـوێ بـووە وانەیـە کـە بـەهۆی لاوازی هەڵوێستو نەمانی کاریگـەرییان لەسـەر نەخشـەی جیهانی ئـەمڕۆ هـەروەها بـەهۆی ئـەو ستەم‌و بەسـووك تەماشـاکردنەی ڕوو بـەڕووی موسـڵمانان بوەتـەوە، لەمێشـکدا گەڵاڵـەبووە.

ئـەو پرسـیارە گرنگـەش ئەوەیـە کـە سەرزەنشـتی کـێ بکـەین لەسـەر ئـەو حاڵەتـە ناپەسـەندەی کـە ئـەمڕۆ ئێمـەی تیـاین؟وە وەڵام دانـەوەی پرسـیارەکە، ئەوەیـە کـە لەڕاسـتیدا ئـەم جـۆرە پرسـیارانە لـەجێی خۆیـاندا نـین، چونکـە لەڕاستی‌دا ئـەوە گرنـگ نییـە کـە ئێمـە بـەدوای مرۆڤێـك یـان سـەردەمێك دابەتەنـها بگەڕێین‌و سەزەنشتیان بکـەین‌و ئـەو لێپرسـراوێتی‌یە بخەینـە ئەسـتۆی ئـەوان، بـەڵکو ئـەم جـۆرە بیرکردنەوانـە لەچـەمکی ڕاسـتیی گرفتەکـە دورمـان دەخاتـەوە،ئـافرەت لـەتێ ڕوانینـی هەمـە لایەنـە بـۆ کـاروانی نەتەوەکـەمان بـە درێژایـی چـەند نـەوەو چاخێك دوورمـان دەخاتـەوە، وە سـاردمان دەکاتـەوە لەهـەنگاو نانمـان بـۆ گۆڕینـی ڕێـڕەوی کاروانەکـەمان بـەرەو ڕاسـتە شـەقام کـە پێشـینەکانمان بـەهێندەی توانـای هەوڵەکانی خۆیـان، وە لـەتوێی پێداویسـتیەکانی بـارو دۆخـی خۆیـانداو، وەقـەوارەی ئـەو مـل ملانێیانـەی ڕوو بەڕوویان بۆتـەوە بۆیـان بـەجێ هێشـتوین، بـەڵکو پێویسـتە بپرسـین چـۆن لـەچوار چێوەیـەکی ڕاسـت دا لـە ڕەهـەندەکانی دۆزەکـەمان بگـەین؟ وەچۆن هێڵـەکانی ڕەوتەکـەمان دیـاری بکـەین‌و بـەرەو ڕەوتـی ڕاسـتەقینە ئاڕاسـتەی بکەینـەوە؟

وەڵام:

١.دەبـێ ئـاوڕێك لـەمێژوو بدەینـەوە تـاکو پـەندو ئامۆژگـاری لێ وەربگریـن‌و بیکەینەدەسـپێکی بـەهێزیمان نـەك لاوازی، ئـەویش بەجـەخت کـردن لەسـەر لایەنـە هـەموارەکان‌و وازهێنـان لەلایەنـە ناهـەموارەکان.

٢.بۆ ئـەوەی بتوانـین بـەرەو پێش بچین پێویستە دەرك بـەوە بکـەین کـە زۆربـەی ئـەو شـتانەی لـەڕابردودا ڕوویـانداوە لەکەمتەرخـەمی‌و هەڵـەکان ئەگەڕێتـەوە بـۆ کۆمەڵـە هۆکارێك. کە نیازپاکییان زۆر تێکەڵ بووە، لەگەڵ ئـەو کاریگـەری کـە ڕۆڵـی هـەبووە لەسـەر نـەوەکانی پێشـووی نەتـەوە هـەروەها ڕەچـاوکردنی ئـەو هۆکـارە ژینگەیی‌یانـەی کـە بەئاسـانی شـوێنەوارە کاریگـەرەکانی لـەژێر سـایەی ئـەو مـل ملانـێ‌و کـارە گرنگـە هەنووکەییانـەی کـە بـارودۆخ سـەپاندویەتی نـەزانراوە وە زۆربەی جار پاڵیان بە نەتـەوەو گەل‌و سـەرانی‌یەوە نـاوەو بـەرەو هـەندێ دووڕیـانی

بردوون کە لەناو قەوارەی نەتەوەدا ئاسەواری وایان بەجێ هێشتووە هیچ کەس ئارەزووی نەئەکرد، لەبەر ئەوە مەبەستی ڕاستو دروستی ئاوڕدانەوە لەمێژووی پێشینانمان بەوە دێتەدی کە بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو دیتنو هەڵێنجانی پەندوو دەرسەکان بێت، نەك نیازمان دووبارە کردنەوەی ئەو تاڵیو نارەحەتیو ڕقو قینانە بێت ڕویان دا لەسەر دەمانێکدا کەتێ پەڕینو وە لەو ڕووداوانەی کە ڕابوردونو ئەو گومانانەیان بۆ دروست کردوین کە گوایا گەر ئێمە لە شوێنو سەردەمی ئەوان بوینایە لەوان باشترمان دەکرد، بۆیە خێر لەوەدانییە لەو ڕووداوو مل ملانێیانە دوربکەوینەوە کە تا ئێستتا توشی هاتوین بکەوینە باسی هەڵەو کەمو کورتیو کۆسپەکانی ئەوان، توێژینەوەمان بۆ مێژوو پێویستە تەنها بە مەبەستی تێگەیشتنو پەندوەرگرتن بێت، بەوەش ئەو توێژینەوەو چەمکە دەبێتە سەرچاوەی هێزو بەردەوامی، نەك سەرچاوەی لاوازیو پەرتەوازەیی.

وانەکانی مێژووش ئەوەمان یاد دەخەنەوە کە گەلانی نەتەوەکەمانو گەلانی جیهانو ئەوانەی لەدەورو بەرمانن نەیان توانیوە ئەوە بهێننەدی کە هێناویانەتەدی ئەگەر ئیسلامو هزرو پرۆگرام گەرایی ئیسلامی نەبوایە.

پێویستە ئەوەی کە هزری ئیسلامیو پرۆگرامی ئیسلامی لەسپێدەی سەدەکانی یەکەمیدا بەدی هێناوە هەمیشە لەیادمان بێ لەو دەست کەوتە گەورانەی کە بونەتە کۆڵەکەیەك بۆ شارستانییەتی ئیسلامیی پێشین، هەر ئەمەش پاڵی بەمرۆڤایەتیەوەنا بە پاڵ پێوەنانێکی شارستانیانەی ئەو تۆ کە هیچ بوارێکی نەهێشتۆتەوە بۆ نکۆڵی کردن لەو ڕۆڵەی کە هەیەتی سەرەڕای ئەو بەدەست هاتانەی کە شارستانیەتی مرۆڤایەتی هاوچەرخ ئەمرۆ پێی گەیشتووە لەڕووی توانای ماددیو، چاکسازی زانستیو پرۆگرامی شارستانیدا، وە ئەوەیشی کە گەلەکانی هیناویانەتەدی لە چاکسازی ئاینیو کۆمەڵایەتیو هزریدا، جا هەرکەسی دەیەویت بەشوین ئەو دەست کەوتانەدا بگەریتو سنورو بایەخو مەترسییەکانی بزانی کەرەستەیەکی زۆرو زەبەنەی وای دەست دەکەوی کە قایلی دەکاتو سەرنجی رادەکیشیو لەسەرووی بۆ چوونو ئەندازە گیریشەوە دەبیت بەلام ئامانج لەو توێژینەوەیەی کە لەسەر دەستی خوینەراندایە، تی رامانە کاروباری ئایندە تانەتەوەی ئیسلامی بەردەوام بی لەسەر گەشەسەندنو گەیشتن بە ئاسۆیەکی نوییئەو تۆ کە سنوری بەخششە ژیارییەکانی هاوچەرخ ببەزینیو

بـــەگیانێکی نـــوێ وە ڕووبـــەڕووی ببێتـــەوە وەك ئـــەو ئاکاروڕەفتارانـــەی کـــە باوباپیرانمـــان کردوویانـــە کـــە بەوەنـــەش لایـــەنی کـــەمو کورپیـــەکانی چـــاك دەکـــات،و ئاشـــوبەکانی وەلا دەنێـتو مەترسـی لـــەڕێ لادانـــەکانی ئـــەو واقعـــە لەســـەر خـــۆیو مرۆڤایـــەتیش لادەبـــات، بەمـــەش وزەو توانـــاو ســـۆزلی چاکســـازیانە بـــە پشـــتیوانی خـــوای گـــەورە دەگێڕێتـــەوە دەست ئـاینو نەتەوەکـــەمان.

٣. هـــەروەها گرنگـــە لـــەقۆناغی خـــۆ هەڵپەســـان دەرچـــین، لـــەکاتێکدا نەتـــەوەو زانـــاو ڕۆشـــنبیرەکانی بـــۆ کاردانـــەوەی زاڵ بوونـــی ڕۆژئـــاواو شـــالاوە داگیرکەرانـــەو ژیارییەکەی لەسەر ئاستی بـــەرە جـــۆراو جۆرەکـــانی سیاســـیو ســـەربازیو ئـــابوریو ڕۆشـــنبیریدا، ڕوویـــان کـــردە لاســـایی کردنـــەوەی ڕۆژئـــاوا، ئـــەوەش لـــە ڕێی بەکارهێنانی پرۆگرامێکی بێژەیـــی نـــەقڵی، لەمیانـــەی خۆبەســـتنەوە بـــە دەقـــەکان، وە گـــەڕان بـــەدوای دەرچـــە بێژەییـــەکانیدا، واتـــە خـــۆ ســـەر قـــاڵ کـــردن بـــەکاری نابنچینەییـــەوە کە ڕێخۆشـــکەر بـــوو بـــۆ لاسایی کردنـــەوەو چـــاولێ کردنـــی خـــۆراوا،و بـــۆ ئاسان کاری هـــاوردنی ئـــامێرو دەست کەوتو دامو دەزگاکـــانی، لەگـــەڵ ئـــەو شـــتانەی کـــە پەیوەســـتن پێـــوەی لەچـــەمكو بـــەهاو مومارەســـاتی نـــامۆ بەعـــەقیدەی نەتـــەوەو بەهاو بنـــەماو نەفسیـــەتی.

وە ڕێکخســـتنی ئـــەو جـــمو جۆڵـــەش لـــەقۆناغی لاســـایی کردنـــەوەوە بـــۆ قۆنـــاغی ڕازاندنـــەوەی بـــۆ کـــاری ڕۆژئاواییـــەکان نـــەك قۆنـــاغی پێـــش دەســـتی کـــردنو ڕەسەنایەتیو تازەگـــەری خۆیـــی، ئاکـــامێکی سروشـــتییە لەدۆگمایـــەتیو چاولێکـــەریو هـــەرەس هێنـــانی هـــزری ئیســـلامی، تـــاوای لێهـــات بووبـــە پرۆگـــرام گەراییـــەکی بێژەیـــی تیـــۆریو ڕووت تەنـــها لـــەو بازنەیـــەدا مایـــەوە دور لەهـــەموو تێگەیشـــتنو بـــەدوادا چونێکـــی زانستیانەی پرۆگرامیانـــەی ڕێـــكو پێـــك ســـەبارەت بـــە ڕوداوو گۆڕانکاریـــەکان لـــەنێو کۆمەڵگـــە ئیســـلامیو مرۆییـــەکاندا بـــە درێژایـــی چـــەند ســـەدەیەك لەچەرخـــە دواییەکانی پـــاش سەردەمی ســـەرەتای ئیســـلام.

وە ڕەســـەنایەتی هـــزری نکۆڵـــی دەکـــات لـــە لاســـایی کردنـــەوەو هـــەڵبژاردنی پرۆگـــرام گـــەرایی خـــۆ هەڵپەســـاندنی ســـادەو ســـاکاری نـــەزۆكو دابـــڕاو لـــە واقـــعو مومارەســـەی زانســـتی کـــە لـــەچوار چێـــوەی دەقـــەکانو تیۆریـــی بێژەیـــی پـــەتیدا بمێنێتـــەوە.

ئـــەم ڕەســـەنایەتییە پێویســـتی بـــە دەرچەیـــەکی چاکســـازیی هـــزری هەیـــە کـــە لەچاوگـــە پرۆگـــرام گەراییەکانـــەوە هـــەڵ قولابـــێو چـــەمکی ئیســـلامیو ئامـــانجو

بەهاكان بنوێنێ لەسەر واقعی كاركردنیی ئیسلامیانە لەبواری ژیانی كۆمەڵایەتیو بونیادی شارستانێتیدا،وا لەواقعو كردە دەكات ئەنجامێكی سروشتی بێ بۆ ئەو بەجێ هێنانە ئیسلامیەیەو سەرچاوە عەقیدەییو هزرییەكەی ئەمەش لە كۆتاییدا واتە نیگایەكی زانستیی ئیسلامیانەی سەربەخۆ، كە زانستە كۆمەڵایەتییە ئیسلامییەكان گەڵاڵەیان كردووەو سەرچاوەیەكی مەعریفی تایبەتیشی هەیە،و هەروەها گریمانەو دەرچەو ئامانجو ڕوانگەی جیاوازی خۆشی هەیە، ئەمەش لە كۆتاییدا واتە بینیەیەكی زانستیی مەعریفیو ڕێكخراوەیی بەدیلی ڕەسەن، كەپێی گران نیە سوود لەدەست كەوتو زانیارییەكانی ڕێگەیەكی ترو كەسانی ترەوە وەربگرێت، بەڵكو هەوڵ بۆ ئەوە دەداتو پێشوازیشی لێدەكات، مادام بەپێوەری خۆی وەریان دەگرێتو لەڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە.

ئەو شكستیانەی تووشی كاروانی ئیسلامی بوو دوای سەردەمی پەیامو كەوتنی جێنشینە ڕاشدییەكانی بەدواوە بوو ناگەڕێتەوە بۆ هزری ئیسلامی،و هەڵەو زیادەڕەوی سەرانی ئیسلامی، بەڵكو بەپلەی یەكەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارەی كە تیایدا گەلو نەتەوەكان بە برێكی یەكجار زۆر لەسەرانسەری زەوییەوە چوونە ناو ئیسلامو كۆمەڵگەی ئیسلامییەوە، بە هەموو نەوشتانەی كە لەدەرونیدا گەڵاڵەبوبوو لەو كەلەپوورو نەفامیانەی بە تەرازوی ئیسلام جیا نەكرابونەوە، وە دەشگەڕێتەوە بۆ بە دوایەكدا هاتنی ئەم ڕوداوانەو ئەم قەرەباڵغییەی كە وایكرد نەتەوە نەتوانێت بە ئاسانی بیان گرێتە خۆیو هەڵوێستێكی وا وەربگرێ كە بەشێوەیەكی پەروەردەیی پێویست بۆ كامڵ بونی نەتەوەو گەلو هۆزەكان پێیان بگەیەنێت، وە جارێكیتر تازە پێگەیشتووەكانی پەروەردە بكاتەوە لەسەر هزری ئیسلامیو ئامانجو مەبەستو بەهاو پێوەرەكانو ڕزگاركردنیان لەهەموو ئەو نەفامیانەی تیایاندا ماوەتەوە، ئەمەش بۆ خۆی بووە هۆی خولقاندنی چەند بنكەیەكی سیاسی ئەو تۆ لەئاستی پابەندێتی بەرەی یەكەمی دەركەوتنی ئیسلام دا نەبوون كە بنكەی سیاسیو سەربازی ئەوان پێی گەیشتبوو، كامڵ ببوو، بەو شێوەیەش دەوڵەتی جێنشینە ڕاشیدینەكانی لەسەر دامەزرا ئەم كەمو كورتیەش بووە هۆی هەڵ كەوتنی بارو دۆخێك بۆ ئەو گەلو نەتەوەو تیرانەی هاتنە ناو ئیسلامەوەو بە تەواوەتی ئامانجو بەها ئیسلامییەكانیان هەرس نەكردبوو كە سەركردایەتیەكی سیاسیی ناپابەند پێك بهێننو بە پشت بەستن بەو بنكە تێكەڵاوانە كاری سیاسیی نەتەوەو ڕایی كردنی

ئەو کاروبارانە بگرنەدەستی خۆیان، وە جێی سەرسامی نییە پرۆگرامی هێزی ئیسلامی نەتوانێ بەم شێوەیە بەرهەم پێشکەش بکات لەسەر شێوازی سەرەتای ئیسلام بەڵکو تەنها لەئاستی لایەنەکانی ئاراستەو رێك خستن رۆڵ بگێڕێ، ئەمەش بەهۆی لاوازبوونی پابەندی جەماوەر بە ئیسلامو دورخستنەوەی سەرانی هێزی ئیسلامی لەگرتنە ئەستۆی کاروباری نەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لەسەردەمەکانی پێشودا هاتە دی لەسەر بنەمای هێزی ئیسلامیو کاریگەری رۆح، پرۆگرام گەرایی یە داهێنەرانەی کە دژی بەتاریکایی سەدەکان دا هەر چەندە ئافاتی فەلسەفەو نەفامی یەکان لە ئارادابوو، وە بوبەقەلایەك بۆ مەعریفەو زانستو دەستکەوتەکان کە بەبێ ئەوە مرۆڤایەتی پێیان نەدەگەیشت وە لەبەر رۆشنایی ئەم بارودۆخو مل ملانێ زۆرانەی کە دەوری پیاوانی سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامو تواناکانی یان دابوو لەگەڵ ئەو دەست کەوتانەش کە بەدەستیان هێنا، ئایا پێویستمان بەوە هەیە پەنا بۆ سەر زەنشت کردنو زیاد رەوی بکەین لەئاستیاندا کە لەچاو توانای خۆیان کەم تەرخەمی یان نەکردووە؟! هاوکات ئایا بۆمان هەیە کە سەرسام بین یان لۆمەیان بکەین کە لەئاستی ئەداو بەجێهێناندا پاشە کشێیان کردووە لەرووی هەڵمەتەکانی نەفامیو فەلسەفەو ئەو لەرێ لادانانەدا کە خۆیان کێشاوە بەقەوارەی نەتەوەداو لەو سەردەمەشدا زۆر بەزەحمەت توانراوە دامو دەزگاو وزەی پێویست بخرێتە گەڕو سەراپای نەتەوە بگرێتە خۆی بەم هەموو پۆلو چینو توێژو تیرەوگەلو هۆزەوە، کەتێی رژابون، وە واشیان لێبکات کە وەك پێشینەکان پەروەردەو پابەندیان تیا دروست بکات؟

بێ گومان لەو بارودۆخەشدا هیچ شتێك لەتوانای نەتەوەدا نەماوە تەنها بینیەیەکی لێل نەبێتو وردە وردە هێزە رەسەنایەتیو بەخششیەکانی قەوارەکەی پاش گەز بوەوەو بە تێپەربونی کات لاوازیش بوو تاکو کپ بو، لە کۆتایدا هێزی نەتەوە گۆڕا بۆ چەند شێوەو قالبو بێژەو کەلتورێك کە نەوەکان بە پیرۆزیان داناو هێشتیانەوە بێ ئەوەی دەرك بەراستی ناوەڕۆکی ئەم فکرەبکەن یان بتوانن لەرووی واقعی ژیانیانەوە سوود لەو توانا شاراوەیە وەربگرن کە لەناخیدا حەشار دراوە.

پێویستە شانازی بەوەوە بکەین بەوەی کە هێزی ئیسلامی بۆ نەتەوەو مرۆڤایەتی سەرەڕای هەموو ئەو کۆسپانەی هاتونەتە رێی هێناویەتەدی، هەمو

ئەوانەی لەمێژوو قەوارەماندا هاتوتە دی نە دەتوانین لێیان تێبگەینو نەڕافەشی بکەین تەنها بەهۆی پرۆگرامی هزرو ئاوەدانکاریو چاکسازی ئیسلامەوە نەبێ، تەنانەت ئەگەر بەرهەمو بەخششەکانی ئیسلامیو پرۆگرامەکەی تەواو نە بوویێتو هەموو ئەو بەروبومەی کە لەوزەیدایە نەیدابێ بەدەستەوە ئەوا هێشتا بەرهەمو بەخششی هەر زۆر بووە، وە سەرەڕای هەموو ئەو کۆسپانەی هاتونەتە ڕێی ئەندازەی بەرهەمە زۆرو گشت لایەنیەکەی بەڵگەیە لەسەر بوونی وزەو توانایەکی شاراوەی زۆر لە ناخیدا،ئەمەش کاتێ بۆمان روون دەبێتەوە گەر بەباشی لێی تێگەیشتینو مامەڵەمان لەگەڵداکرد، وە لەدەرونو کۆمەڵگەکاندا بواری جێ بەجێ کردنمان بۆ ڕەخساند.

پێویستە دەرك بەوە بکەین ئەوەی کە ئێمە پێی گەیشتوین ئەوە کاروانی نەتەوەو گەلو سەردەمو چاخ گەلێکە بە گشتی کە ئاسۆیەکی لە بەخشندەییو داهێنان بەدی هێناوە هەروەها بنکەیەکی گەورەیە بۆ گرنگترین ئەو تواناو لێهاتنانەی کە ئەمڕۆ شارستانیەتی مرۆڤایەتی پێی گەیشتووە، خۆ ئەگەر ئافاتەکانو شتەکانی نەفامی لەو چاخو سەردەمانەدا زیانیان هەبوبێتو کاریگەرییان هەبوبێ بۆ وەستاندنی ئەم کاروانەو ڕێگرتن لە داهێنانو تواناکانی ئەوا ئەو هەوڵەی کە ئەمڕۆ پێویستە ئەوەیە کە بگەینەوە بەبینیەیەکی گشتگیرانەی بێگەرد کە بەهۆیەوە پەند لە ڕابردوو وەربگرین تا جارێکی تر خۆری ئیسلام هەڵ دێتەوەو نەتەوە ڕاست دەبێتەوەو بەردەوام دەبێ لەسەر کاروانەکەیو چرۆکانی دەبوژێنەوەو بەخششەکانی تەواو دەکات وە مرۆڤ ڕێنمایی دەکات بەرەو شاڕێو، سەرکەوتنو سەرفرازیو، شارستانێتییەکی پڕ لەخێرو بێرو، ئاشتیو ئاسایشێکی بەردەوام بە پشتیوانی خوای گەورە.

لێرەدا دەتوانین بڵێین کە پرسیارەکە بۆ گەڕان بەدوای ئەو کەسەدا نییە کە لێپرسراوبووە یان سەرزەنشتی بکەین، بەڵکو حەقیقەتی پرسیارەکە گەڕانە بە دوای هۆکارەکانی کەم تەرخەمی کاروانەکەمانو هەرەس هێنانی دەست کەوتەکانی، وە گەیشتن بەباشترین ڕێگە بۆ گەڕانەوەی بینیەو بۆ چونمانو نوێ کردنەوەی وزەکانمانو گەیاندنە جێی کاروانەکەمان. ئامانجی گەڕان ئەو کاتە دەبێتە هەنگاوێك بۆ نوێ کردنەوەی بینیەو چاکسازی کردنی پرۆگرام گەراییو گەشەپێدانی سەرچاوەی تواناو وزەو کار، بەرەنجامی ئەوەش ئەوە دەبێت کە نەتەوەکەمان دەست کەوتو بەروبوم بدات بەدەستەوە، وە زۆر شتیش تا ئێستا

ماوەو بەتەمای دەبین و خوازراوە،ئەو کارەی پێویستیشە لەسەرمان ئەوەیە کە بە دیدێکی ڕەخنەگرانەی وردو پشکنەرانەوە دەست پێبکەین تابتوانین ڕووی لاوازی و خەلەلی دەرون و هزرو پرۆگرامەمان هەست پێبکەین تا بگەینە چاکسازی و بەخشش بەدەستەوەدا

بەم شێوەیە گەیشتینە جێیەکی گونجاو لەم خاڵەدا لە ڕووی لێکۆڵینەوەوە، تا بەدیدێکی گشت گیرانەوە لەبەرزی هزرو مێژووی هزرو پرۆگرام گەرایی ئیسلامیمان بڕوانین بەڵکو یارمەتیمان بدات بۆ ناسینی ڕووگەمان و ئەو مل ملانێ ڕاستەقینانەی کە پێویستە بەرەنگاری ببینەوە،و تێ بگەین بۆ ئەوەی بتوانین ئەو ڕەسەنایەتی یە ئیسلامی یە بهێنینەدی کە دەمانەوێت و لەقەوارەو هزرو مومارەسەی کۆمەڵایەتی و شارستانیماندا بڕوێنین بە پشتیوانی خوای گەورە.

ئیسلام وەك پەیامێکی ڕێنمایی لەلای خوای گەورەوە هاتووە بۆ خەڵکی لەقۆناغێکدا خەڵکی لەنەفامی یەکی ئەنگوستە چاوی مێژوی مرۆڤایەتی دابون، هەموو پەیامەکانی تر دەستکاری کرابون، ستەم فەرمان ڕەوایی دەکرد، خراپەکاری هەموو شتێکی گرتبۆوە، ئیسلامیش تاریکی یەکانی ڕۆحی ڕەواندەوە، دەرگاکانی عەقڵ و مەعریفەو بنیاتنانی لە بەردەم مرۆڤدا والاکرد، مرۆڤایەتی کاروانێکی ژیاریی نوێی دەست پێکرد بە ڕادەیەك گەر ئیسلام نەبوایە بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ هاتۆتەدی هەرگیز نەئەهاتەدی

وە لەگرنگترین ئەو شتانەی ئیسلام بۆ مرۆڤی سەردەمی بەدیاری هێناوە تەواوکردنی زانیاریەتی لەڕێی متمانەکردن بە سروشی خوایی و پاراستنیەوە هەروەها ڕزگارکردنی عەقڵ و جڵەو بەر دارنێتی تا خۆی لە بواری زانست و چاکسازی و بنیاتناندا ببینێ.

وە پرۆگرامگەرایی عەقڵی موسڵمان لەسەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلامیدا پرۆگرامێکی خۆڕسکی تەواو بووە کە پشتی بەحیکمەتی سروش و سەلامەتی ئیجتیهادی عەقڵ و دەرك و هۆشیاری خۆڕسکیانەی زیرەکانە بەستووە سەبارەت بەحاڵەتەکانی فیطرە لەدەرونی مرۆڤ و بونەوەریەکاندا، وە سەردەمی پێغەمبەرو جێنشینە ڕاشدینەکان شایەتن و پێشرەوێکی ڕێنوماکارو ڕزگارکاری درەوشاوەن لە گۆشەکانی ڕۆحی مرۆڤ و کاروانی نەوەکاندا،و هەر خێرو خۆشی یەك لەسەرزەوی ئیسلامداو لەنێو گەلانی ئیسلامدا کەتائێستا بەرچاو دەکەوێت و ماوە بەهۆی ئیسلامەوەیە، وە بەرهەمی ئەوو ئامانجەکانێتی بەم شێوەیە ئیسلام لەگەڵ ئەو هەموو هۆکارانەی کە لەکاردابون بۆ ڕوخاندنی لەهەستی نەتەوەدا وەك قەڵایەکی پۆڵایین هەر مایەوەو بە درێژایی سەدەو ڕۆژگارەکان نەتەوەی لە تیاچوون و لەناوبردن پاراست.

# بەشی سێهەم

# پرۆگرام گەرایی هزری ئیسلامی:
# ڕێساکان و بنچینەکان

# پرۆگرامگەرایی هزری ئیسلامی: ڕێساکان و بنچینەکان

لەو باسانەی پێشوماندا بە مەبەستی پێناسەو ڕەخنە گرتنێکی کورت چاوێکمان بەسەر چوارچێوە کلاسیکی‌یەکەی پرۆگرامی هزری ئیسلامی‌دا گێڕاو تیایدا باسی بنچینەو ڕێسا کنیمان کرد، وە ئەو چوار چێوەیەشمان ڕوون کردەوە کە ئەوانە دەنوێنێت لەگەڵ ئەو کێشەو گرفتانەی بە دەستیانەوە دەناڵێنێ، لەگەڵ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو کێشەو گرفتانە، هەروەها ئاماژەمان کرد بۆ گرنگترین ئەو شوێنەوارە ناهەموارانەی کە لەکەلێنی بونیادی ئەم پرۆگرام گەرایی‌یە کەوتەوە.

لەسێبەری بارودۆخی شارستانیی سەردەمی سەرەتایی لەژیاری ئسلامی‌دا، تواناو وزەکانی عەقڵی موسڵمان‌و چوار چێوەی پرۆگرامی ئوصوڵی ڕۆڵی خۆیان لەگەڵ زۆربوونی کەم‌و کوریشدا لەئەنجامی تێ پەڕبونی کات‌و دورکەوتنەوەی دۆخی کات‌و شوێنی واقعی نەتەوەو ڕوو بەڕوو بوونەوەکانی لەچاو بارودۆخ‌و هەڵسوکەوتی چینی یەکەم(سەرەتای ئیسلام)و کارنامەی سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەردەمی پەیام‌و دابەزینی نیگادا.

ئەو عەقڵ‌و ئەو پرۆگرامە توانیان، وێڕای تێکڕای بارودۆخ‌و کۆسپەکان کە ئیسلام‌و موسڵمانان ڕووبەڕووی بوونەوە، ئەندازەیەکی زۆر لەووزە ئیسلامیەکان بخەنە گەڕ، ئادەمیزادو عەقڵی ئادەمیزادییان خستە نێو چوار چێوەیەکی نوێوە، ئاسۆ گەلێکی فراوانیان لەکردارو داهێنان کاری لە بەردەم عەقڵی ئادەمیزادی موسڵمان والاکردو، توانی کە لەپورو هزرێکی ژیاریی ڕێکخراوەیی‌و یاسایی‌و زانستی وا پێشکەش بە ئادەمیزاد بکەن کە پێشتر نموونەی نەبووە، ئاسۆکەی ئادەمیزادیی کە پێشتر ئەفسانەو گومرایی‌و ڕاڕایی‌و ستەم‌و داچون‌و دابڕانی لەمافەکان‌و سەرجەم سەربەستی‌یەکان باڵی ڕەشی بەسەردا هێنابوو ڕۆشنیان کردەوە.

بە دوورکەوتنەوەی کات‌و گۆڕانی دۆخەکان‌و گەورەبوونی دەلاقە لەنێوان ئامانجی ئیسلامی‌و پابەند بوون پێیەوە لەلایەک‌و، سەرکردایەتیە ڕامیاری‌و کۆمەڵایەتیەکاندا، لەلایەکی ترەوەو، بەزیاتر گۆشەگیربوونی بیری ئیسلامی‌و

زانایـــانی موســـڵمان، کاریگـــەریی ئیســـلامی، وردە وردە لاوازبـــوو، بەرهـــەم و بەخششی(العطاء) ئیسلامی کەم بویـــەوە، هـــەروەها نـــەمانی گیـانی بەرپەرچدانـــەوەو ڕوو بـەڕوو بوونـەوەی ژیاریی نەتـەوەی ئیسلامی لەبەرانبـەر دوژمنـدا بـووە هۆکـارێکی یاریدەدەر بۆ دارمان و لێکەوتـەیی، هەرچەندە بۆ مـاوەی چـەند سـەدەیەکیش حـاڵی باشترو بـە تواناتر بـوو لـەژیارو نەتـەوەکانی تـر.

بـە دەرکـەوتنی بەرهەڵسـتی ڕۆژئـاوایی ئـەورووپی لەسـەدەکانی دوایـیدا نەتـەوەی ئیسـلامی، ناچـاربوو بـە چـاو پیاخشـاندنەوەی بارودۆخـەکانی و تاقیکردنـەوەی ڕێساکان و دەرچـەو پرۆگرامـە هـزری و سسـتەمەکانی.

بـە تێپـەڕبوونی کـات و، لەبـەردەم زۆر بوونـی ژمـارەی تاکـەکانی نەتـەوەو ژمـارەی گـەلانیدا وەفـرە بوونـی ئـەو ڕوو بـەڕوو بونەوانـەی کـە ئاڕاسـتەی قـەوارەو بـوون و تواناکانی دەکرێت و، لەبـەردەم کەڵەکـە بوونـی ئـەو مەترسیانەی لـە ئـەنجامی ئـەو نەخۆشـیە شارسـتانیانەوە دەکەونـەوە کـە لـەناو قـەوارەی نەتـەوەکانی ڕۆژئـاواو کۆمـەڵگاکانی لـەم کاتـەدا بڵاوبوونەتـەوە و، بونەتـە مایـەی هەڕەشـەی ڕووخـاندن نـەک تەنـها بۆ سـەر نەتـەوە ڕۆژئاواییـەکان، بـەڵکو بۆ سـەر سـەرجەم مرۆڤایـەتی بەگشـتی، ئەمـە هیچی بۆ نەتـەوەی ئیسـلامی نەهێشـتنەوە مەگـەر چـاوێک بـە خۆیـی و یاسـاو قـەوارەو هـزرو دەرچـەکانیدا بخشـێنێتەوە، پـاش ئـەوەی بـۆ هـەموو خـاوەن عـەقڵێک سـەلمێنرا کـە چارەسـەرکردنێکی هـزری ڕووکـەش کـەڵکی نییـە بـۆ سـەر ڕۆڵـی نەتـەوەو ئـەو ڕوو بـەڕوو بوونەوانـەی کـە ئاڕاسـتەی دەکرێـت هـەروەها بـەر هەڵسـتی سـەربازی و ڕامیـاری و سـۆزگەرایی بـە سـەرنەکەوتووش، بۆیـە هـەر دەبـوو لەبـەردەم ئـەم واقیعـە تاڵـەدا هـەموو دەمامکێکی کـە هنووتـی و بەرژەوەندییـە پوچـەکان و ئـەو کێشـمە کێشـە تەقلیدییـە پارێزکارانەیـە چـۆک دابـدات و بکـەوێت بـە شـێوەیەک کـە نەتـەوە - بـەهۆی بـاری لاوازی و دواکـەوتنی و ناڕەحەتیەکانـەوە - ئـەوەی کەسـامی لێدەکـات و دەترسـێ لەدەسـتی بچـێ تەنـها ئازارەکـان و ناڕەحەتیـەکانی و پـەرت بوون و لاوازییەکانیـەتی.

بەرپرسیاریەتییە ژیارییـەکانی نەتـەوە بـەر پرسـییە لەبەرامبـەر خـودو مێـژوودا، لەبەرانبـەر بەرپرسـیاریەتییە پیرۆزەکـانیدا لەجێنشـینی و چاکسـازیدا کـە لـە ناوەڕۆکی پەیامەکەیـەوە دەرچـە ئیسـلامییە بـەرزەکانی هـەڵدەقوڵێ کـە گێڕاویـەتی بەشایستە بۆنـەوەی بنچینەیـەکی ژیاریی ئـادەمیزادی هاوچـەرخ پێـک بـهێنێ.

بە ڕاستی ژیاریی ڕۆژئاوایی لەسەر پێگەی پەیامی ئیسلامو ئەو کلتورە شارستانێتییە ئیسلامییە بنیات نراوە کە زۆرێک لەو ڕەسەنایەتییەی پێشکەش کردووە کە بەشداری کردووە لە چاکسازی زۆربەی پێگە ژیارییە مرۆییەکانی پێش خۆیو، زۆرێک لەوە بە ڕوونی دەبینرێت لە چاکسازی ئاینیو ڕەوشتیو کۆمەڵایەتیو هزریو زانستیدا. کە ئەوروپییەکان لەنەتەوەی ئیسلامو ژیاری ئیسلامیو کەلەپوری ئیسلامییەوە وەریان گرتووە بە ڕاستی ئەوروپییەکان زەوی ئیسلامو هزری ئیسلامیان تاوتوێ کردووەو توێژینەوەیان لەسەر کردووەو فێریبون لەزانکۆو پەرتوکنامە ئیسلامیو وەرگێردراوە ئیسلامییەکانەوە فیکری چەرخی ڕاپەرینی ئەوروپیو کەلەپورو چاکسازیە ژیارییەکانی گەواهی بۆ دەدەن، بەڵکو زۆرێک لەنارەحەتییەکانی ڕۆژئاواو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان، بەتایبەتی لەباری ندروستی دەروونی بۆ تاکو خێزان کە ئەمڕۆ پێیەوە ئەتلێنەوە، ئەمانە هەموویان لە بۆچونی ئێمەدا دەگەڕێتەوە بۆ وازهێنانی ڕۆژئاوا لەزۆرێك لەوپێگەو چەمکە چاکسازیو کۆمەڵایەتیو ڕەوشتیانەی کە لەژیاری ئیسلامییەوە وەریان گرتووە، ئەمەش دوای ئەوەی لەسەر پێی خۆیان وەستانو لەخۆیان بایی بوونو پێیان وابوو کە ئیتر پێویستیان بەهیچ شتێکی تر نابێت تا لەئیسلامەوە وەری بگرن لەو بەهاو چەمكو چاولێکەری یانەی کە پێشتر وەریانگرتوە، وزەو توانا ماددییەکانیان لەچاکەو فەزیلەی خۆیانەوە هەڵدەقوڵێو دەگەڕێتەوە بۆ کەلەپوری بت پەرستی یۆنانیو ڕۆمانی، بۆ کەلەپوری خورافیی مەسیحیی ناوەند، بەدوور لەژیاری ئیسلامیو بەهاکانیو پێگەکانی، کە لێیەوە فێری چاکسازییەکانی هزریو زانستیو کۆمەڵایەتییان بوون کاریگەری ئەو ڕۆژگارە بەڕوونی دەبینین لەناوەندی ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیو خێزانییە تێك ڕووخاوەیاندا، هەروەها ئەم بارەش لەنەمانی پابەندی ڕەوشتیدا لەگۆڕەپانی زانستو تەکنەلۆژیاو ڕامیاریدا بەدی دەکەین ئەوەش بۆتە شتێکی ئاشکراو هەموو کەسێکی بیناش دەیبینێتو دەزانێت کە ئەوە کارێکی هەڕەشە ئامێزە دژی قەوارەی خۆراوا خۆی لەناوەوەیداو قەوارەی مرۆڤایەتیش بەگشتی لەڕووکاری دەرەوەیدا.

لەگەڵ ئەوەی کە ئەمڕۆ ڕۆژئاوا لەسەریەتیو پەیڕەوی دەکاتو ئەو بارەش کە جیهان تیایەتی هیچ بۆ ئادەمیزادی ئەم چەرخەو نەتەوەی ئیسلامی نەماوەتەوە

جگە لەئیسلامو پێگەکانی نەبێ بۆ ئەوەی کاروانی نەتەوەو ئادەمیزاد سەر لەنوێ بەرەو ڕاستە شەقام بەرێت، وە هاوسەنگیو ئارامی بۆ کاروانی مرۆڤایەتیو ژیاری لەسەر بنچینەی(پرۆگرام)ی هەقو دادگەریو ئامانجی ڕەوشتی بگێڕێتەوە، بنیات بنێتو نەڕوخێنێت، چاکسازی بکاتو تێك دان وازلێ بێنێت، ویستی خوایی لە چاکسازیو ئاوەدان کردنەوەدا بهێنێتەدی.

بۆ دووان لەبارەی پرۆگرام گەرایی ئیسلامی سەبارەت بەفیکرو ژیان، پێویستە یەکەمین جار وێنەی چوار چێوەی هەموایەتی بۆ ئەو پرۆگرام گەراییە بکێشینو، سەرچاوەو پێگە بنچینەییەکانی بزانین تاکوو پاش ئەوە بتوانین بەردەوام بین لەکرداری زانستیو ژیاری لەبوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو ژیاری جۆراو جۆردا. بەوەش عەقڵی موسڵمان ئامادە دەکەین بۆ ئەوەی بتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ لەدووبارە ڕێکخستنەوەی یەکەمینەکانیو سەر لەنوێ داڕشتنەوەی پەیوەندییەکانی بە ئاراستەی چاکەو .چاکسازیو ئاسایشو ئاشتی.

ئێستاش لێکۆڵینەوە لەسەر یەکێك لەگرنگترین دۆزەکانی پرۆگرام گەرایی ئیسلامی دەست پێ دەکەین کە دۆزی چوار چێوەی هەموایەتی ئەو پرۆگرام گەراییەیە کە هزری ئیسلامی تێدا دەبزوێتو دەخولێتەوە.

## ١. چوارچێوەی ( پرۆگرامگەرایی ) بیری ئیسلامیو زانینەکانی:

### تەواو کارێتی نادیارو دیار:

ئەوەی کە زۆر گرنگە تێگەیشتنە لە چوار چێوەی ئیسلامی گشتگیر بۆ ژیانو بوون تاکوو بتوانرێ بیری ئیسلامیو(پرۆگرام گەرایی) ئیسلامیو چوار چێوەی بزواندنیان بزانرێت وە تاوەکو ئەو پەیوەندیو چەمكو پێگە بنچینەییانەی کە بیرو پرۆگرام گەراییو بنیات نانی ژیانی ئیسلامی ڕێك دەخەنو جیایان دەکەنەوە بزانینو تێی بگەین.

چەمکی دیارو نادیار لەئیسلامداو، ڕوونی ئەم چەمکەو ڕەهەندەکانی لەعەقڵو پرۆگرامی موسڵماندا، گرنگییەکی زۆری هەیە ئەگەر بمانەوێت لەسروشتی بیری ئیسلامو پرۆگرام گەراییەکەیو، لەواتای ژیانی ئیسلامی،و بوونی ئینسانیو، پەیوەندیو ئامانجە ئادەمیزادیەکان تێبگەین، کە ئیسلامو بوونی چاکخوازیشی لەپێناو هێنانەدی یاندا تێدەکۆشن.

چەمکی نادیارو دیار لەئیسلامدا ئەو چەمکەیە کە واتای ژیانو بوون دیاری

دەكات، ئامادجی ژیان‌و بوون‌و، پەیوەندی ئەوەش بەوەی لەپشت ژیان‌و پشت بوونەوەرو پشت مادده دایە.

چەمكی نادیارو دیار ئەو چوار چێوە گشتگیرەیە كە واتای بوونی مرۆیی‌و واتای عەقڵیشی دیاری دەكات هەروەها لەگەڵ ڕۆڵی ژیانی مرۆیی‌داو، سنووری ئەو ڕۆڵەو بوارەكانیشی.

چەمكی نادیار لەئیسلامدا چوار چێوەی وەڵامی ئیسلامی دەنوێنێ لەسەر پرسیارێكی گشتگیر لەبارەی بناغەی ژیان‌و بوون‌و ئامانجەكانیان‌و، بەمەش واتای پەیوەندی بنچینەیی یان دیاری دەكات.

جیهانی نادیار بریتی‌یە لەو جیهانە كە تەنها لەزانین‌و عیلمی خوای تاك‌و تەنیادایە، سروش دەكات بەوەی بیەوێ بۆسەر هەر كەسێك خۆی بیەوێت لەنێو بەندەكانی‌داو، بە پەیامەوە دەیاننێرێت بۆ نەتەوەكان بۆ ڕێنمایی‌و بەرچاو ڕوونیان سەبارت بە واتای بوونیان‌و، ئامانجی ئەم بوونەو، پەیوەندی پێیانەوە.

پەیوەندی ئادەمیزاد بەپێی چەمكی ئیسلام بە جیهانی نادیارەوە بریتی‌یە لەپەیوەندی‌یەكی چاكخوازی‌و بنیات نان، كە ئامانجی بەر پاكردنی هەق‌و دادگەری‌یە لەژیانی ئادەمیزاد داو ئاوەدانكردنەوەی زەوی‌و پارێزگاری گیان لەبەران‌و زەوی‌یە لەتێكچوون ﴿ الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم احسن عملا ﴾ الملك(٣) ﴿ ان الله يأمر بالعدل والاحسان وايتاء ذى القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي ﴾ النحل(٩٠)

ئەتوانین پوختەی گرنگترین بنەمای جیهانی نادیارو بە خششەكانی بۆ ئادەمیزاد لەمانەدا كۆبكەینەوە:

— بوون (الوجود) ئامانجێكی چاكی ڕەوشتی‌ی هەیەو بێ هودە دروست نەكراوە ﴿ أفحسبتم انما خلقناكم عبثا وأنكم إلينا لاترجعون ﴾ المومنون:١١٥

— پەیوەندییە هەموایەتیەكانی بوون‌و لۆژیكی ئەم پەیوەندییانەش لەدوای وزەی عەقڵی ئادەمیزادی‌و پەی پێ بردنی ئادەمیزادی‌یەوەیە.

— گرنگترین سیماو بەخشینەكانی جیهانی نادیار ئەوەی تایبەت مەندە بە ئادەمیزادەوە بریتی‌یە لەبوونی خوای تاك‌و تەنیاو بەدیهێنەرو بێ ئاتاج بەكەس،حەققانی دادگەر، یەكەمین‌و دواهەمین كە بەهیچ شێوەیەك هاوشێوەی نی‌یەو، زانایشە بە هەموو شتێك.

ــ ڕۆژی دوایـی‌و زیندووبوونـــه‌وه‌و کۆبوونـــه‌وه‌ بریتی‌یـــه‌ له‌بـــه‌ره‌نجامی حســـابی پاداشـت‌و سـزا، له‌ســـه‌ر ئـــه‌وه‌ی ئـاده‌میزاد بـــه‌جیّ‌ی هێنـاوه‌ لـــه‌م دونیایـــه‌دا، ئه‌گـــه‌ر چاك بوو ئـــه‌نجام چاك ده‌بێت ئه‌گه‌ر خراپ بـوو خـراپ ده‌بێت.

ــ دونیـا بوارێکـه‌ بۆ کـارو ئـاوه‌دانی‌و چاکسـازی، هـــه‌موو بوونـــه‌وه‌ر ژێربـارکراون بـــۆ ویسـتی ئـــاده‌میزاد لـــه‌کاری جێنشـینی‌یه‌تی ئــه‌و له‌ســـه‌ر زه‌وی‌داو، له‌کۆشـش کردنـی‌دا، بـــۆ ئـاوه‌دانی‌و چاکسـازی ســه‌رزه‌وی‌و ژێربـارکردنی ســه‌رجه‌م بوونـــه‌وه‌رانی بـه‌ به‌هۆی ویستی باش‌و خێریـه‌وه‌ بـــۆ کـه‌ڵك لێوه‌رگرتـن‌و سه‌رپه‌رشتی‌کردن‌و چاکـه‌ خـوازی نـه‌ك زیـاده‌ڕه‌وی‌و بـه‌زۆر ڕاپێچ کـردن‌و فه‌سـاد نانـه‌وه‌.

ــ ویســتی ئـاده‌میزاد لـه‌عیلم‌و فـه‌رمانی خوایـه‌و، لـه‌موعجیزه‌ی خـه‌ڵقی خوایـی‌و مـه‌زنیی ده‌سه‌ڵاتیه‌تی، بـه‌و شـێوه‌یه‌ بـه‌دی هێنـاوه‌ کـه‌ هـه‌موو شـتێکی پـیّ بـه‌دی هێنـاوه‌ به‌ویسـتی خـۆی‌و جیـای کردۆتـه‌وه‌و ڕێـزی سه‌ربه‌سـتی ئاراسـته‌کردنی پـیّ به‌خشـی‌و، سه‌ربه‌سـتی بڕیـاری بـه‌ره‌و چـاك یـان خراپـه‌ داوه‌تـیّ، بـه‌ره‌و چاکســازی یـان تێکـدان، بـــه‌ره‌و هه‌ســتان بـــه‌ڕۆڵی جـیّ نشـــینی‌و سه‌ربه‌ســتی‌و چاکســازی‌و ئـاوه‌دانی یـان بـه‌ره‌و شـه‌ڕو تێکـدان‌و زیـاده‌ڕه‌وی‌و سه‌رکه‌شـی‌و له‌ســنور چوونـه‌ ده‌ره‌وه‌ چ به‌پارێزگاری‌و پاککردنـه‌وه‌ یـان ناپـاکی‌و تـاوانکردن.

ــــ ڕینمـایی‌و گومڕایـی لـه‌ژیانی ئـاده‌میزاددا چاره‌نوسـی هـه‌ر تاکێکـه‌و ڕابـردوو لـه‌عیلمی خوایـی‌دا، لـه‌ کـاتێکدا خـوای گـه‌وره‌ ویسـتی سه‌ربه‌سـتی بـه‌ ئـاده‌میزاد به‌خشـی، واتـه‌ ئـه‌و دوو ڕێگایـه‌:ــ ڕێگـای چاکـه‌و خـــه‌یرو ڕێنمـایی یـان ڕێگـای شـه‌ڕو گومڕایـی‌و سـه‌ر که‌شـی،

ــ خـوا ئـاده‌میزادی بـه‌دی هێنـاوه‌و، عـه‌قڵ‌و زانیـاری‌و ڕێـزی پێ‌به‌خشـی بـه‌وه‌ی جـیّ نشـینایه‌تی‌دا پـیّ سـپارد له‌سـه‌ر زه‌وی‌و، پایـــه‌ی بڵندکـردوه‌وه‌ بـــه‌هۆی توانــا زانسـتی‌یه‌کانی‌و سه‌ربه‌ســتی ئـیراده‌ی بـــه‌ جیاکردنـــه‌وه‌و، ڕێـــزداری بـــۆی به‌ســـه‌ر ســـه‌رجه‌م بوونـــه‌وه‌ریاندا، ئه‌گـــه‌ر به‌سه‌ربه‌ســتی خـــۆی ڕێنمـایی هـــه‌ڵبژارد ئـــه‌وا چاکـترین‌و تـــه‌واوترین‌و بـــه‌ڕێزترین دروسـتکراوه‌ له‌تـــه‌رازوی خوایـی‌دا، ئه‌گـــه‌ر گومـــڕاو خراپـه‌کار بـــوو ئـــه‌وا بـــه‌هۆی خراپـــی‌و گومڕایـــی خۆیـــه‌وه‌ بـــۆ(اسـفل السـافلین) ده‌گوێزرێتـــه‌وه‌.

ـــ خـــوا گـــه‌ردوون‌و بوونـــه‌وه‌ریان‌و ژیـان‌و گیـان له‌بـــه‌رانی به‌دیـــهێناوه‌و ڕای هێنـاون له‌ســـه‌ر چـــه‌ند ســـوننه‌ت‌و یاســـاو هۆکـارێك، به‌شـوێن کـه‌وتنی هۆیـه‌کان

کـردەوەو کردارەکـان دەبـن،و ئامانجـەکان دێنـەدی‌و، ویسـتی ئـادەمیزاد سـوربوون‌و ئاراسـتەکردنی خـۆی دەردەبـڕێ‌و بـەبێ گـەڕان بـەدوای کـردەوە هۆیـەکان‌و دابـین کردنیـان توانـای نـابێت‌و گـەرم‌و گـوڕی نـابێت‌و ئامـانج‌و دەربڕیـن نایەنـەدی.

ـــ بـەر پرسـیاریەتی ئـادەمیزاد لـەم ژیانـەو لـەم سـەر زەوی‌یـەدا بریتی‌یـە لەئـەنجامدانی بەرپرسـێتیەکەی لـەجێ نشـینی‌و ئاوەدانکردنـەوەدا،و ژێـر بـارکردنی بونـەوەریان‌و سەرپەرشـتی کردنیـان، ئەمـەش بـە دابـین کردنـی هۆیـەکان‌و کۆشـش کردن لـە پێنـاوی دادەبـێ بەرپرسـیەتی ئـادەمیزاد لـەدابین کردنـی سـوننەتی ژیـان‌و هۆیە کاندایە، بۆ بـەجێ هێنـانی سپاردەو ڕەزامـەندی خـوای گـەورەو هـەق‌و بڕوا بـون پـی‌ی‌و، بـەو ئامانجـەی کـە خـوا ئـادەمیزادی بـۆ فەراهـەم هێنـاوە، بـە بـڕواوەو بـە بـەجێ هێنـانی بڕیـاری خوایی‌یـەوە لـەوەی کـە فرمـانی پێ‌کـردووەو لەوەشـی کـە قەدەغـەی کـردووە،و بـە متمانـەوە بـە دەسـەڵات‌و توانـای خوایـی‌و ئـەوەی کـە لـەنێو بونـەوەریاندا داینـاوە لەڕێسـاو سـوننەتەکان. بـاوەڕداریش پـاش جێ‌بـەجێ کردنـی بەر پرسیاریەتی لەگـەڕان بـەدوای هۆیـەکان‌و کۆشـش کـردن بـەو پـەڕی گەرمی‌یـەوە، بەپێ‌ی ڕێسـاو سـوننەتەکان، ئـەتوانێ ئـەرك‌و سپاردەکان بـەجێ بـهێنێ‌و،پـاش ئـەوە پشـت بـەخوا دەبەسـتێ کـە خـاوەنی کـارو بـارەو زانایـە بەغـەیب‌و گـەردون هەڵدەسوڕێنێت، بـەبڕواو متمانـەوە بـە دانایی‌یەکـەی، هـەموو(قـدر)ێکـی خوایـی بـۆ بـەندەی بڕوادار پـاش ئـەوەی ڕۆڵـی خـۆی دەبینـی‌و هـەڵگری بـەر پرسـیاریەتی خـۆی دەبـێ لـەدابین کردنـی هۆکارەکـان، ئـەوە بەڕاسـتی خـێری دونیـاو ڕۆژی دوایـی بـۆ خـۆی تێدایە. ئـادەمیزاد بـەدڵ‌و جەسـتەوە ڕوو دەکاتـە خـوای خـاوەن دەسـەڵات‌و بـە متمانـەوە تـا ڕەزامـەندی خوایـی بەدەسـت بێنێـت لـەوەرگرتنی کردەوەکـانیدا دادپـەروەریی خـوای گـەورەو هەموایـەتی لـە ڕەببانیـەتی‌داو هەموایـەتی دانایی‌یەکـەی دابـین کـاری سـەرکەوتنی کـردەی بـاوەڕدارو بـەکار هێنانیـەتی بـۆ هۆیـەکان لەجێ‌نشـینیەتی سـەرزەوی‌دا،و دابـین کـاری پاداشـتە بـۆ بـەندەی خـاوەن بـاوەڕ لـەم ژیانـەو ڕۆژی دواییشدا بەپێ‌ی دانـایی‌و بـەزەیی‌و دادی خـوای پـەروەردگار.

ـــ ئـادەمیزادی بـڕوادار هـەڵ دەسـتێت بەئـەرکی جێ‌نشـینی‌و. کۆشـش دەکـات لەچاکسـازی‌و ئاوەدانکـاری بـەپێ‌ی فیطـرەو سـوننەتەکان، ئـەو ئەرکـەیش کـە خراوەتـە ئەسـتۆی لـەکارو تێکۆشـان‌و گـەڕان بـەدوای هۆکـاردا لەپێگـەی ئیمـان هێنانیـانی بـەخواو متمانـەی بـەدانایی‌و دادو بەزەیی‌یـەکانی بـەجێ‌دێنێت، لەبـەر

ئەمەشە بڕوادار بەعەقڵ بیردەکاتەوەو پشت بەخوا دەبەستێ، لەقەدەرێکی خواییەوە بەرەو قەدەرێکی تری خوایی هەڵدێت، بەئاگابە لەخۆیو جێ بەجێ کردنەکانیو بەرپرسیاریتییەکەی، باوەڕەکەی تێکۆشانەو تێکۆشانەکەشی باوەڕە، لەبەرئەوە لەئاکارەکانیدا لەداواکردنی هەقو کۆشش کردن بەچاکسازیانەو جێ بەجێ کردنی مافی جێ نشینیو ئاوەدانکردنەوەدا لەڕێی هۆیەکانەوە داوا دەکاتو متمانەی هەیە بەخوا، لەکەس ناترسێ جگە لەونەبێت، ڕوودەکاتە خواو پشتیپێ دەبەستێو لەکۆتاییدا دڵنیایە کە باوەڕدار سەرکەوتووە لەم دونیاو لەڕۆژی دواییدا، لەبەر ئەمەش باوەڕداری ڕاستەقینەی هۆشیار کە لەواتای بڕواهێنان بەخواو دانایی یەکانیو قەزاو قەدەرەکانی خوا دەگات، لەخەڵکی زیاتر گەرمو گوڕی هەیە لەسەرکارەکانی بەپێی سوننەتی خوا لەسەر زەویو جێنشینیەتی تێیدا لەبەر ئەمەشە لاناکاتەوە تەنها بەلاکردنەوەیەکی پشکنێرانەو کار بەجێیانە نەبێت بۆ بەشییەکانی(الجزیئات)ی بزافی جێبەجێ کردنو کۆشش کردنەکەی، بەسەر کەوتنەکانی بایی نابێت، وەنارەحەتییەکانی نائومێدی ناکەن، چونکە ئەزانێت ئەوە جێگای تاقیکردنەوەو نارەحەتییەکانە(الابتلاء)، کە لەلایەن خوای باڵادەستەوە بەداناییەوە دەینرێت، لەبەر ئەوەش ئەوەی دووچاری مرۆڤی بڕوادار دەبێ لەجموجوڵو کۆشش کردنەکەی هەمووی خەیری دونیاو دوارۆژی تێدایە، وە بزافو جمو جوڵی بڕوادارو سەراپا ژیانی، تەرخانە بۆ کارکردنو لێ بڕانو دابین کردنی هۆکارەکان، وە کاروباری باوەڕدارانی کاراش کە سپاردەو ئەرکەکانیان باش ئەنجام دەدەن بەرەو خێرو سەرکەوتنو دەسەڵات هەنگاو دەنێن، خوای گەورە پەیمانی بۆ باوەڕداران دەهێنێتەدی ئەگەر سپاردەو بەرپرسیاریەتییان بەچاکی بەجێهێناو، بە باشیش باوەڕیان بەقەزاو قەدەر هەبوو، لەبەجێ هێنانی کارو کۆشش کردنو دابین کردنی هۆکارەکانو سوننەتەکاندا کەم تەرخەم نەبوون، هیچ باوەڕێکی بەدەر لەمەش لەبیروباوەڕی خاوەن ئیمانو واقیعی جمو جوڵی ژیانی موسڵماندا نییە، خوای گەورە سەرکەوتنی باوەڕدارانی بەبڕوای چاکو بەجێهێنانی بەر پرسیاریەتی یان بەڕێكو پێکییەوە گرێداوەو دامەزراویان دەکاتو دەیان گێڕێت بەجێنشین، ئەمەش پەیمانی خواو سوننەتیەتی، باوەڕی ئیمان داری زیرەكو هۆشیارە﴿ ان تنصروا الله ينصركم ويثبت اقدامكم ﴾ محمد(٧).

ـ عەقڵی ئادەمیزادو پەی بردنی ئادەمیزاد شیاوە بۆ ژیانی ئەم سەرزەوییەو بەجێهێنانی ئەرکی جێنشینییەتی لەچاکسازیو ئاوەدانیدا. ئەم عەقڵو پەی بردنەش ئامرازی بنچینەیی ئادەمیزادو جوێ کەرەوەی گەورەیە بۆ هەڵگرتنی گرنگیی ئەو لێپرسراویەتییەی کە کەوتۆتە ئەستۆی لەم ژیانەدا، جێ نشینییەتی گەردونو ئاوەدانکردنەوەیو کۆشش کردن تێیدا بەچاکسازی﴿ واذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الارض خليفة * قال يا آدم انبئهم باسمائهم ﴾ البقرة (٣٠ -٣٣). ئامادە سازی ئادەمیزاد بۆ جێنشینی کردن بەهۆی زانستەوەبوو، عەقڵیشی ئامرازی زانستو هۆکارەکەیەتی لەم جیهانی دیارە لەسەر ئەم زەوییەدا.

- سروش ئەوچاوگە خواییە کە ئەوەی ئادەمیزادو مەعریفەی کەپێویستیەتی لەزانینی کاروباری نادیارو پەیوەندیەکانیو ئامانجە هەموایەتییەکانی، پێی دەبەخشێ لەگەڵ پەیوەندی ئادەمیزادیش بەم هەموایەتیو ئامانجانەوەعەقڵیش ئامرازی ئادەمیزادە بۆ زانیاریو مەعریفەو ئاکارەکان لەم سەرزەوییەدا، ئەوەش جیهانی دیارە، ئەمەش بە مەبەستی هێنانەدی ئەرکی خەلافەتو مەبەستەکانی لەبەر پاکردنی پەیوەندی ڕەواو هەقو داد پەروەریو چاکە خوازی یەکان.

- سروشو عەقڵ بەم واتایە تەواوکاردەبن بۆ دیاریکردنی پێگەی ئادەمیزاد لەجیهانی دیارو چەسپاندنی بوونیو کۆششکردنی لەبەرانبەر هێنانەدی ئامانج لەعەقڵو سروشتدا لەجیهانی دیاردا. سروش مەعریفەی هەموایەتیو ئامانجە ڕەببانیەکان بەمرۆڤ دەبەخشێ لەو مەعریفەو پەی پێبردنانەی کە لەوەوە نادیارو نەزانراون، بەوەش بینیەو مەعریفەکەی بەرەو تەواوکاری دەچێ بۆئەوەی ڕێ بەرەو ئامانجو بەرژەوەندییەکان دەرکاتو پلەی دڵنیایی بەدەست بێنێو، وەڵامی داواکاریەکانی فیطرەوخواستەکانی بداتەوە لەتوێکانی قەوارەو بونیادەکەیدا. بەمەش سروشی بێگەردو دڵنیایی بەخش ئامرازی ئادەمیزاد دەبێت بۆ ئامانجو هەموایەتییەکان، عەقڵیشی دەبێتە ئامرازی ئادەمیزاد لەزانینی جیهانی دیارداو ئەوەی لەگەردون دایە، لەفیطرەو لە سووننەتەکانیو مۆرکو(طبائع) کەرەستەکان بۆ ڕام هێنانیان، کە بەهۆیانەوە ئەو عەقڵە چاکسازیو ئاوەدانییە بەرپادەکات بەپێی ئاراستەو مەبەستە خواییە پەسەندەکان.

- لەپێگە فیطرەو پێگەی باوەڕی ڕۆشن بەیەکتاپەرستی خواو ڕێنمایی

سروش، هیچ بوارێک لەڕوانگەی ئیسلامیەوە نەهێڵراوەتەوە بۆ دژایەتی کردنی لەنێوان سروشو عەقڵ گەردوون. سروش تایبەتە بەجیهانی نادیارو هەموانەکانی(کلیات) بوونو ئامانجەکانیو بەرژەوەندییەکانی لەگەردونو ژیاندا، ئەوەش لەفەرمانی خواییە، کۆشش کردن بەدەر لەوەی سروش دەیەوێت گومڕاییو گومانو خۆبەگەورە زانینە، کۆشش کردنو گوێ ڕایەڵی لەوەی سروش هێناویەتی لەهەقو ڕاستی، ئەوەیە جیاکەرەوەی زانیاری خەیرو زانیاری پووچەڵ (الفاسد)ە ئەم پێوەرەبوو کە زانیاری فریشتەولۆژیکی پێ گەیشتووەکان لەزانیاری ئیبلیسو لۆژیکی پووچەڵی جیاکردەوە﴿ قال سبحانك لاعلم لنا إلاّ ماعلّمتنا﴾ البقرة(٣٢) ئیبلیسیشی بەوەی دەیزانی لەپێکهاتەی ماددی خۆی بەفیزو گەورەییەوە وتی(خلقتني من نار وخلقته من طين)الاعراف(١٢) وە وتی﴿ أأسجد لمن خلقت طينا﴾ الاسراء(٦١) خوای گەورە بە زانیارییە هەموانەکەی خۆیو تواناو دەسەڵاتی هەمەلایەنی فەرمووی﴿ إني أعلم مالا تعلمون﴾ البقرة (٣٠)، عەقڵو لۆژیکو پەی بردنی ئادەمیزاد عەقڵێکی دروستو پێ گەیشتووە، ئەگەر کۆششکاری خۆی بەرەو جیهانی دیارو هەڵگرتنی بەر پرسیاریەتی لەجێ بەجێ کردنی ڕۆڵی خۆی لەجێ نشینایەتی جیهانی دیاردا ئاڕاستە بکات بەو پێیەی کە خوای گەورە بینیەیی سەبارەت بەزانستی جیهانی نادیار بۆ ڕۆشن کردۆتەوە لەدیاریکردنی ئامانجەکانو پێوەرەکانی چارەنووسو پێشهاتەکان بە مەبەستی چەسپاندنی ئادەمیزادو بەر پرسیاریەتیەکانی لەزەویدا لەژێر بارخستنیو ئاوەدان کردنەوەی بە دادپەروەریو چاکەخوازی بەم چوارچێوە تەواوکارییەی نێوان زانستی نادیارو زانستی دیارەو، نێوان سروشو عەقڵو گەردوون، پێشەنگانی یەکەم لەیارانو پیاوانی ئیسلام ڕووی خۆیان وەرنەچەرخان بەرەو شۆڕبوونەوەی نێو کارو بارەکانی نادیار، بەڵکو تەواوی پێداویستیەکانیان لەوەدا ئەبینییەوە کە سروش هێنابووی لەبارەی ئامانجەکانو دیاریکردنی پێوانەکانەوە، کە ئاڕاستەکاریو ڕێنمایی بوون بۆ ئادەمیزادو عەقڵی ئادەمیزاد لەگشت ڕووەکانی جیهانی دیارەوە بەزانستو کۆشش کاریو بنیاتنانو ژێربارکاریو ئاوەدان کارییەوە، لە چوارچێوەی ئیسلامیی هەمەلایەنەدا، کە بنیات نراوە لەسەر حەقیقەتی یەکتاپەرستیو یەکتایی، دیارونادیار تەواو کاردەبن، سروش عەقڵو گەردون تەواو کاردەبن، باوەڕو کردار تەواوکار دەبن،

پشت بەخوابەستنو کۆشش تەواو کاردەبن، لەگەڵ تەواوکاری بیروباوەر بەقەزاو قەدەرو متمانە بەهەموانەیی ڕەببانی(بالكليات الربانيه)و فەرمانەکانی خوایی، لەگەڵ تەواوی لێبڕانو کۆشش لەتێگەیشتنو زانینی سوونەتەکانو فیطرەو هۆکارەکانو دابینکردنیانو سووربوون لەسەریان، ئەوەش بەرپرسیەتی ئادەمیزادەو ئامرازی ویستو توانایەتی لەهێنانەدی ئامانجی بوونیو ڕاستگۆیی لەبڕواو تەسلیم کردنی ئەو ویستە بەدەسەڵاتو ویستی خوایی، بۆ ئەمەش خوای گەورە باوەڕو کردەوەی چاکی لەهەموو شوێنێکی قورئانی پیرۆزدا، بەهاو تەریب هێناوەتەوە کە دەفەرموێت ﴿ الذين آمنوا وعملوا الصالحات ﴾ العصر(٣) بە هەموو واتایەك کە ووشەی چاکسازی دەیگەیەنێت لەواتای بابەتیانەی تێگەیشتنو، سووربون لەسەر کۆششو بەدوادا گەڕان لەسەر بنچینەی هەق، وەك چۆن خوا فەرمانی پێ کردووە لەنیگاداو، لەڕێساو سوننەتەکانیشیدا بەرپای کردووە، چاکسازی تەنها بەنیازپاکیو مەبەست تەواو نابێت، ئەمەش ئەو واتایەیە کە بڕوا بوون بەخوا دەیخوازێو لەسەرەتای دەربڕینەکەیشەوە لەئایەتەکەدا ئاڕاستەی بۆ دەکاتو وەصفی دەکات، بەڵکو بەدەر لەوەی لێی دەخوێنرێتەوە چاکسازی کۆشش کردنی بابەتیانە لەدابین کردنی هۆکارەکانو چاکی بەجێ هێنانو کارکردنیش دەگرێتەوە.

لەمەوە دەگەینە پوختەی ئەوەی کەعەقڵی موسڵمان عەقڵێکە ڕوو بەڕوی جیهانی دیارو کاروباری ژیانو بوونەوەریانە دەنێت، کۆشش دەکات بۆ ژێر بارخستنو ڕێکخستنو سەرپەرشتی کردنو چاکسازی لەژیاندا لەسەر بنچینەیەك لەزانیاری بابەتیانە بەکاروبارو سروشتی، ژیانو، لەوەی کەخوای گەورە لەسوننەتو ڕێساکانی تیا فەراهەم هێناوە بۆ بەدی هێنانی واتای جێ نشینایەتی بەپێی ئاڕاستەکردنی نیگاو فەرمانەکانیو مەبەستەکانی شەریعەتو ئەحکامە دابەزێنراوەکانی. هیچ بوارێك نەهێڵراوەتەوە بۆ عەقڵی موسڵمان بۆ لەدەست دانی کاتو ئەو کۆششانەی کە پێویست بەدرێژە پێدان ناکاتو سوودی نیە لەکارو بارەکانی جیهانی دیارو ئەوەی پەیوەستە بە زاتیخوا خۆی،و هەموایەتی(کليات) فەرمانەکانی یەوە، تەنها بەوەندە نەبێت کە سروشو پەیامی پێدابەزیوە، لاوازیی عەقڵی موسڵمانیش ئەوەستێ لەسەر لەرزۆکیو لاوازی بینییەیو ئەو ساتانەی پشتی وەرگێڕا لەو سوونەتانەی بۆی ئاسان کراو خرایە بەر دەستی

لەجیهانی دیارو داوای کۆشش کردنی لەزانستی بوونەوەریان و ڕێکخستن و ژێر بارخستنیان لێ کراو، نەک لەشوێنێکی ناشیاو بەخۆیدا شۆڕبێتەوە لەکاروباری هەمووانەیی(کلیات)و خواوەندێتیو، لەکاروباری جیهانی نادیار دەست وەردان.

عەقڵی موسڵمان بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ باری ئاسایی پێویستە بینیەی ئیسلامییانە بێت کە لەسەر یەکتاپەرستیو یەکتایی بنیات نراوە کەتێدا ئامانجایەتیو دوای هۆکار کەوتن پێویست دەبێ، کەتێدا دیارونادیار یەک دەگرن و تەواوکەری یەکتردەبن، هەروەها سروش و فیطرە(عەقڵ و گەردوون) یەک دەگرن و یەکتری تەواو دەکەن، بەمەش کاروانی ئادەمیزادو عەقڵە کامڵ دەبێت، و کۆششی خۆی دەبینێتەوەو بەڵێنی خوایی بۆ دێتەدی لە بەتوانابوون و سەرکەوتندا. پاش ئەوە ئەگوێزینەوە بۆ دۆزێکی گرنگی تر لەدۆزەکانی (پرۆگرام گەرایی) ئیسلامی کە بریتییە لەدۆزی سەرچاوەکانی ئەم پرۆگرام گەراییەو ئەم هزرەو ئەوەی کە لەنێوانیان دا هەیە لەپەیوەندی پاڵ پێکەوەدان یەکتری تەواو کردن.

## ٢. سەرچاوەی هزرو پرۆگرامگەرایی ئیسلامی: نیگاو عەقڵ و گەردوون:

سروش وەکو سەرچاوەیەکی مەعریفەو ئاراستەکردن لەژیانی ئادەمیزاددا مەبەست تێدا بەشێوەیەکی گشتی ئەو وشە هەقەیە کەخوای گەورە بەنیگا بۆ پێغەمبەران و نێردراوانی ناردوو، بۆ ئەوەی بیگەیەننە نەتەوەکانیان. سروش وەکو سەرچاوەیەکی مەعریفەیی و ئاراستەکاری ئیسلامی مەبەست تێدا ووشەی خواو ئیرادەی (ویستی) هەقە، کەخوا بەنیگا دایبەزاندوەتە سەر پێغەمبەرەکەیو نێردراوەکەی کە محمد(ﷺ) بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە سەرجەم خەڵکی، دوا پەیامی بێ کەم و کورتیو گشتگیرە، ڕێنماییە بۆ خەڵکی و ئاراستەکردنێکە بۆ واتای بوونیان و ئامانجی ئەم بوونەو، ڕوون کردنەوەیە بۆ مەبەست و بنەماو بەهاو ئەو ئەحکامانەی کە پێویستە لەسەریان دەستی پێوەبگرن بۆ بەدیهێنانی ئامانجی بوونیان و گەیشتن بە مەبەستی کردەو پەیوەندییەکانیان، ناوەڕۆکی ئەوەی کە سروش پێش کەشی خەڵکی دەکات بریتییە لەڕوون کردنەوەی سروشتی پەیوەندی یان بە خواوە، و ئامانجی بوونی ئادەمیزاد لەم گەردوونەداو، ڕێبەری بزافی لەم ژیانەداو، چارەنووسیشی لەپاش ژیان.

ئادەمیزاد ڕێزمەندترین دروستکراوی خواییە کەجیاکراوەتەوەو ڕێزدارە

بەهۆی ویستو توانای لەهەڵسوکەوتو ژێر بارکردنی گەردوونو ژیاندا، کە عەقڵی پێ بەخشراوەو فیطرەی بۆ پەی بردنو بیرکردنەوەو تێ رامینو بەڕێوەبردنی ژیانو (مقدراتی) پێ سپێرراوە بە پێی ئەو زانیاریەی کە فێرکراوە سەبارەت بەڕێساو هۆکارەکانو هۆیەکان، بەمەش بەڕێکو پێکی بە پێی پابەندی بەهەقەوە بەرزدەبێتەوە، هەروەها بەدوورکەوتنەوە لەهەقو شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووەکانی پلەی دادەبەزێتو زیادەڕەوی دەکاتو پوچەڵ دەبێت.

پەیوەندی ئادەمیزادی بەدیهێنراو بەخوای بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری ژیانو گەردوون پەیوەندییەکی توانست(الارادە)و پەی بردنو خۆ ویستە کە لەبنچینەدا بریتییە لەپەیوەندی بە بەندە بوونو مل کەچی پەیوەندی جێ نشینایەتیو ڕێز مەندییە ، ڕووکردنی ئادەمیزادە بەرەو لای خواو شوێن کەوتنی فەرمانەکانیو دوورکەوتنەوەیە لەسەر پێچیەکانی، بریتییە لەپەیوەندییەکی شکۆمەندیو ڕێزمەندیو سەر بلندی چونکە پەنا بردنە بۆ خواو هێنانەدی چاکەو، حەقیقەتە، کەڕێگایەکی دامەزراوی تۆکمەیە،و لەخۆیدا ئامانجێکی بەڕێزو خۆشەویستە کە ئادەمیزادی دامەزراو کۆششی لەپێناودا دەکاتو بەدوایدا دەچێتو، بەرز دەبێتەوە بەدوادا چوونیو گەیشتن بەئاسۆکانی، هیچ بوارێک بۆ پەیوەندی لەواتای سەر شۆڕیو خۆ بچووك کردنەوە لەچەمکی ئیسلامیدا نەهێڵێراوەتەوە. بەڵکو پەیوەندییەکە لەبنچینەدا خۆشەویستیو بەرەو ئاسۆ چوونو شانازیو ڕێزمەندیو هێزە، ئەم ئاسۆگەو ڕەهەندو بەهایانە لەکەسایەتی پێغەمبەری (*) خواو یارانی بەڕێزیدا پێش هەر کەسێکی تر هەست پێدەکەیت لەم ڕووەوە پێغەمبەر (*) دەفەرموێت (لخلوف فم الصائم اطیب عندالله من ریح المسك) (١) واتە بۆنی دەمی ڕۆژووان خۆشترە لای خوا لەبۆنی میسك، هەروەها دەفەرموێت:(ألله اشد فرحا بتوبة عبده حین یتوب الیه، من احدکم کان علی راحلته بارض فلاة فانفلتت منه و علیها طعامه وشرابه فأیس منها فأتی شجرة فاظطجع فی ظلها وقد أیس من راحلته فبینما هو کذالك اذ هو بها قائمة عنده) (٢) واتە : خوای گەورە فرە دڵخۆشترە بەگەڕانەوەی بەندەیەکی کە بۆلای دەگەڕێتەوە، لەکەسێك لەئێوە کە لەسەر ووشترەکەی بێ لەزەوی یەکی کاکی

---

(١) رواه بخاری ومسلم

(٢) رواه مسلم

بەکاکیو پاشان لەدەستی دەربچێ خۆراکو خواردنەوەکەی بەسەریەوەبێو، بێئومێدە لەگەڕانەوەی، لە ناچاریدا ئەچێتە ژێر درەختێکەوەو لێی پاڵ دەکەوێت، تەواو بێ ئومێدە لەوشترەکەی، لەو حاڵەدا ئەبێ کەچی وشترەکە ئامادە دەبێەوە لەلایدا، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ واذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الارض خليفة ﴾ البقره(٣٠) هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ولقد كرّمنا بنى آدم وحملناهم فى البر والبحر ﴾ الاسراء:(٧٠).

پێویستە لەیادمان نەچێ کە هۆی رێز لێنانی ئادەمیزاد لەنێوان دروستکراواندا، هەروەها جێگای ئادەمیزاد لەچاو دروستکراوەکاندا، کار بەجێیی پەروەردگاری بالادەست لە دروستکردنیدا، چەسپاندنی لەسەر زەویدا، ئەویش بریتییە لەو سیفەتە بڵندیو بێ وێنەیە کە پێی جیاکراوەتەوە، کە سیفەتی ویستی سەربەستو تواناشیەتی لەسەر ئاراستەکردنو رێنمایی کردنی بە شێوەیەکی ئازاد، ئەوەیشە کە گێراویەتی بەجێگەی سوێند خواردنی بەدیهێنەری بالادەست کە دەفەرموێت:. ﴿ ونفس وماسواها * فألهمها فجورها وتقواها * قد أفلح من زكاها * وقد خاب من دساها ﴾ الشمس (٧ـ١٠).

ئادەمیزاد بەهۆی سەرپێچیو خراپە کاریو لادانیەوە لەهەق بەردەبێتە خۆیو ستەمی لێدەکاتو چلکاوی سەرپێچیو خراپەو زیادەڕەوی ئەیگەوزێنێو، بەرەو پلەی سەرنەوی بوونو بەدبەختی دەیباتو پەیوەندی لەگەڵ حەق پێ دەبرێ، لەو رۆژەی کەخەڵکی لەبەردەم پەروەردگاری جیهانیان دەوەستن. لەبەر ئەمە پێویستە پلەی سەر بڵندیو رێزمەندی کە بۆ ئادەمیزادی چاك ویست، ﴿ لقد خلقنا الانسان في أحسن تقويم * ثم رددناه اسفل سافلين * الاالذين آمنوا وعملوا الصالحات فلهم أجر غير ممنون ﴾ التين(٤ـ٦). کە تێکەڵ نەکەین لەگەڵ گوتاری خوایی بۆ دڵ ڕەقانو خۆ بەزل زانو پێشێل کارو سەرکەشان، کە مەبەستی خوا بەو گوتارە پێ شکاندنی سەرکەشی خۆ بە زال زانانو هەڵدانەوەی پەردەی خەیالاتو بێ باوەڕیو گومڕاییانە، وەك سەرکەشو بێ بەزەییو دڵ ڕەقەکانی پیاوانی عەرەب، بە نموونە (ئەبی جەهلو ئەبی لەهەب) ڕاستیش نییە ئەوەمان لەبیر بچێتەوە کە واتای گوتاری رێز لێنانەو لەهۆشماندا تەنها گوتاری ڕاچڵەکاندنو بەسەر داماڵین بمێنێتەوە، و ئەوە بە بنچینەی گوتاری خوایی بۆ ئادەمیزادو، بەمەبەستیشی لە پەیوەندییەکەی پێیەوە لەژیاندا بزانین،

وە بەگوتارێك بۆ بانگەشەو چەمكێك بۆ پەیوەندی خوایی بە ئادەمیزادەوە لە ژیاندا مەزەندەی بکەین.

بەهەمان شێوە پێویستە تێکەڵ نەکرێت لەنێوان هەستی بڵندیی باوەڕداران‌و ڕێز مەندی‌یان کە (ئەمەش سەر بڵندی هەق‌و ئاڵاندنە پیی‌و بانگەشەیە بۆی) لەگەڵ هەڵوێستی مل کەچی‌و لاڵانانەوەو پاڕانەوەیان لەتوێژەکانیاندا بەرەو هەق کەخوای ڕۆژی دەرو ڕێزمەندو زاناو لێبووردەیەو وەك دوو هەڵوێستی دژ تەماشا بکرێن، هەریەکە لەو دوو هەڵوێستە هەڵوێستی سەر بڵندی‌و چاکەو ڕێزمەندی‌یە شیاوە بەباوەڕدار لەپەیوەندی کردنی بەخواوەو مرۆڤ دەچەسپێنێ لەسەر زەوی بۆ گەیاندنی پەیامەکەی‌و بەدیهێنانی ئامانجی بوونی، وەك جێ نشینێکی سەر بەرزو چاك خواز، کە بڕوای بەپەروەردگارەو پشتیشی پێ‌دەبەستی‌و کۆشش دەکات بۆ گەیشتن بەرەزامەندیی .

نیگا بەم واتایە سەرچاوەیەکی بنچینەیی‌یە بۆ مەعریفەی ئادەمیزاد کە بەئاگای دەهێنێتەوە بۆ ئامانج لەبوونی‌و پێگەی لەم بوونەداو چارەنوسیشی لەپاش ئەم بونەدا﴿ الذی خلق الموت والحیاة لیبلوکم أیکم أحسن عملا ﴾ الملك (٢).

هیچ ئامرازێك لای ئادەمیزاد چنگ ناکەوێت بۆ زانینێکی بێ گومان سەبارەت بە ئامانج لەبوونی‌و پێگەی لەم بوونەداو پەیوەندیی بەپاش ئەم بوونەو ئەم ژیانەوە تەنها لەڕێگای نیگاوە نەبێ، ئادەمیزاد بەکردەو زانیاری‌و لۆژیکی خۆی ناگاتە ئەو دڵنیاییە بێ گومانە سەبارەتبە زانینی هەموایەتیەکان

وە لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە دەرونی مرۆڤی لەسەر(فطرە) بەدیهێناوە، ژیری پێ‌داوە، توانای دەرك پێکردنی پێ بەخشیوەو، ئەو شتانەش کە لەبەدیهێنراوەکان‌و گەردووندا دەبینێت لەچوارچێوەی(فطرە)ەو سوونەنی گەردوونیدا دەیانبینێت، وای‌لێ‌دەیت کە خودی خۆی بەبێ‌دەسەلاتو دەستەوسان نەبینێ لە ئاستی‌زانینی هەموانەیی(کلیات)ی ئەم بونەوەرەو جێ‌شوێنی خۆی لەم گەردوونەدا، خۆ ئەگەر وانەبوایە ئەوا بزافەکانی مرۆڤ هیچ ئامانج‌و مەبەستێکی ئەو تۆی نەدەبوو کەمانای(بوون)ی خۆی بسەلمێنێ بەشێوەیەك(فطرە)ی ژیری‌و یاسا گەردونیەکانی خوای گەورە لەبونەوەردا پێی ڕازی بێت، بەڵکو پشێوی‌و نائارامی لەناخی دەرونی مرۆڤ دا بەرپادەکردو دەبووە سوتەمەنی ترس‌و

سەرسامییەکان. سروش(الوحی) تاکە هۆکاری گرنگە بۆ ئەم جۆرە مەعریفەیە، کە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆیەوە بوون و کەرەسەی بەردەوامی کاروانی ژیانی خۆی دابین بکات، لەبەر ئەوە سروش بۆ عەقڵ و ئیدراک و هزری مرۆیی لەم ژیانەدا پێویستەو ناکرێت دەست بەرداری ببین، هەروەها بەبێ سروش هزری مرۆڤ ناگاتە قۆناغی دڵنیایی و یەقین، هەر ئەویش تەواوکەری رێبەری بزافەکانی ژیانە، وەك سەرچاوەیەکی بنچینەیی بۆ کارە مەعریفی و زانستیەکانی هۆش و عەقڵ لەجیهانی دیارو بەرجەستەدا.﴿ قد جاءكم من الله نور وكتاب مبين * يهدي به الله من اتبع رضوانه سبل السلام ويخرجهم من الظلمات الى النور بإذنه ويهديهم الى صراط مستقيم﴾ المائدة: (١٥ـ ١٦)

عەقڵی مرۆڤیش ئامرازێکە بۆ پەی بردن و تێگەیشتن و تێڕوانین و لەیەکتر گەیشتن و جیاکردنەوەو هاوسەنگی، هەروەها ئامرازی ئادەمیزادە بۆ بەجێهێنانی بەرپرسیەتی لەبوون و ئاکار لەجیهانی دیارو ژیاندا.

عەقڵیش بەو فیطرەیەی لەسەری پێکهاتووە بەوەیش کە ئامرازێکی بنچینەیی یە بۆ پەی پێبردن ئەوا لەناوەڕۆکیدا هەڵگری واتاو پەیوەندی یە بەڵگە نەویستەکانە لەنێوان ئادەمیزادو بوون و بونەوەریاندا، کە لۆژیك و چەمکە بنچینەییەکانی خۆی لەسەر بنیات ئەنێت، بەبێ عەقڵیش نەئادەمیزادو نەپەی بردن و تێ گەشتن و نەهوشیاری ناین بەهەمان شێوەش بەرپرسێتی نابێ.

عەقڵی ئاراستەکەری ئادەمیزادو پاڵنەرو ئامرازییەتی بۆ هەست کردن بەپێگەو ئامانجیشی لەژیاندا، هەروەها ئاڕاستەکەرو پاڵنەرو ئامرازیشیەتی بۆ بەدوا گەڕانی عیلمی نادیارو وەرگرتن لە پەیامەکانی سروشەوە.

عەقڵ و توانای لەسەر پەی بردن و لێك جیاکردنەوەو تاقیکردنەوە ئامرازی ئادەمیزادە بۆ زانینی ناوەڕۆکی نیگاو دانانی لەجێگای رێبەرایەتی کردن و ئاراستەکردنی ئاکاری ئادەمیزادو رێکخستنی ژیان و دەست کەوتەکانی، بەوەی کە ئامانجی نیگاو مەبەست و ئەحکامەکانی بهێنێتەدی.

عەقڵە سروشی پاك و ڕاست و دروست، لەفرۆفێڵ و ئەفسانەو کەهانە(الکهانە)درۆزنانەی خراپی گومڕاکەر جیادەکاتەوە، کە هەر ئەویشە ویستی ئادەمیزاد دەجوڵێنێ بۆ بەراوردوو هەڵ بژاردن، لەبەردەم بەرپرسیاریەتی رێڕەوو چارەنوس سازیدا دای ئەنێت.

بەبێ بوونی ڕۆڵ و سروشتی عەقڵ هیچ بوارێك بۆ بوونی ئادەمیزاد وەك ئادەمیزادێك و، بۆ وەرگرتن لەبارەی پەیامی سروشەوە وەك سەرچاوەی زانین و ئاراستەکردن و زانیاری و، هیچ بوارێك بۆ بەرپرسیاریەتی جێ نشینی و ئاوەدان کاری نامێنێتەوە.

(سروش)ی نەتەوەکانی پێش ئێمە بەلادان و گۆڕان و تێك چوون، ڕاستگۆیی خۆیان لەدەستدا وەك سەرچاوەیەکی دڵنیاکەری زانین، بەڕاستی عەقڵی موسڵمان ـ کە جیاکراوەتەوە بە پەیامی تەواوکارو

ڕاستگۆیانە ـ بەوە جیادەکرێتەوە کە تەواوکاریی تیایە لەڕووی سەرچاوەی زانینی یەوە لە هەردوو جیهانی دیارو نادیار، نیگا سەرچاوەی زانستە هەموایەتی یەکان و جیهانی نادیارە، عەقڵیش سەرچاوەی زانستی جیهانی دیارو بەڕێوەبردنی ژیانە، کە بەدی دێنێت لەوەی خوای گەورە پێی سپاردووە لەپێودانگ و بەلگە نەویستەکان و چەمکەکان، ئەوەیشی لەبەرەنجامی زانیاری دەربارەی گەردوون و بونەوەریان و سروشتیان و پەیوەندی یە گەردوونی یەکان بەدەستی دێنێت کەژیانی پێ بنیات دەنێت و ڕۆڵی خەلافەتی لەگەردوون و نێو بوونەوەریاندا پێ دەبینێت،

بەمەش هەردوو سەرچاوەی سروش و عەقڵ لەگەڵ گەردووندا یەکتری تەواو دەکەن، تا وەکوو ئادەمیزاد بەتوانابێ لەهێنانەدی مەبەستەکانی و گێڕانی ڕۆڵی جێ نشینایەتی کردندا.

ڕۆڵی هۆش و عەقڵ بریتی یە لەزانیاریەکانی جیهانی دیار بە سەلماندنی ڕاستیی نێردراوان و دروستیی پاڵپشتەکانی نیگا کە پێیان گەیشتووە و چەسپاندنیان، گۆڕەپانی عەقڵ زانستە دیارو بەرچاوەکانە لەڕێگەی دەرککردن بە مەبەستەکانی نیگا لەبونیادی ژیان و ئادەمیزاد لەجیهانی دیاردا، هەروەها ڕۆڵی عەقڵ بریتی یە لەتێ گەیشتنی جیهانی دیارو لەوەی کەتیایەتی لەفیطرەی گەردوون لەمۆرك و پەیوەندی یەکان و توانستەکان لەژێر ڕۆشنایی دەستە بەرکراوەکانی سروشدا لەبارەی ئامانجی ژیان و پێودانگی بزافەکانیەوە، ڕۆڵی عەقڵی موسڵمانیش بریتی یە لەبنیاتنانی جیهانی دیارو جێ نشینایەتی کردنی ئەم ئەگەردوونە لەژێر داخوازی و ئاراستەکردنەکانی ویستی خوایی و، ئامانجەکانیدا لەگەڵ ئەوەی کە خوای گەورە لەناو دەروون و بونەوەریاندا دانی ناوە لەفیطرەو سوننەت گەلێك تابگەنە ڕێبازی ئاشتی و ڕێگای ڕاست و دروستی دامەزراو.

عەقڵی موسڵمان هێزو هاوسەنگیو جێگیربوونی هەنگاوەکانیو لەسەر بێ وەستانی لەو زانستە سروشییەوە وەردەگرێ کەهەیەتی، بەهێندی ئەو بڕەی لەزانستی سروش هەیەتی دەتوانێت(علم الیقین)لە(علم الغیب) بزانێت، کە عەقڵێکی باوەڕدارو پێ گەییو دڵنیایە خۆ بەزل نازانیۆ بەدنمەكو بەفیز نییە، کە دڵنیایی واز لێ بێنێ بۆ گومان، ڕێنمایی بخاتە لاوە بۆ گومڕایی، عەقڵێکی باوەڕداری بەتوانای بە بەرهەمی وایە کە لەدرێژەی بەرپرسیارێتیدا لەجێ نشینێتی کردنی گەردوونو ژیانو ئاوەدانکردنەوەو چاکسازیدا لەسەر زانیاریو ڕووناکیو دڵنیایی دامەزراوە، سەرگەردان نییە خۆی نادات لەمەسەلەی گومانو ڕاڕاییو کارە غەیبیەکان بەبێ زانیاریو بێ فریادڕەسو بێ چرایەکی ڕۆشن.

ڕۆڵی سروشی پەروەردگاریش بریتییە لەدابین کردنو بەخشینی زانیاری سەبارەت بەجیهانی غەیب بەپێی پێویست بەعەقڵی موسڵمان، ڕوون کردنەوەی ئامانجە چاکەکەی لەهێنانەدی ئادەمیزاد لەجیهانی دیاردا، ڕۆڵیشی لەجێ نشینایەتی کردنی زەویدا، ڕۆڵی عەقڵی موسڵمانیش تێ کۆشینە لەجیهانی دیارو بەرپاکردنی جێنشینایەتییە لەسەر زەویدا لەبەر ڕۆشنایی ئاراستەکانی سروشو پەیامی پەروەردگاریدا.

ئەمە بوو کە پێشەنگانی یەکەم لەسەری بوون،و ئەمەیشە کە دەبێ عەقڵی موسڵمان لەسەری بێ کاروبارەکانی ڕێك بێت جێ بەجێ کردنەکانی دروست بوون، هیچ تێکەڵیو بەرچاو لێڵیو تاریکییەكو کۆششێکی ون بوو، وزەیەکی بەفیڕۆ چووی تێدانییە، تێکەڵۆ پێکەڵیو دڵەڕاوکێۆ ڕاڕایی هەمیشەیی بەخۆوە نابینێ.

ون بوونی ئەم بینیە ڕۆشنە یەکلاکەرەوە ناسکەی واتای سروشی پەروەردگاری خوایی،و ڕۆڵی نیگای خوایی لەژیانی ئادەمیزادو جیهانی ئادەمیزاددا، بەهەمان شێوە نەبوونی بینیەیەکی ڕۆشنی یەك لاکەرەوە لەواتای عەقڵی ئادەمیزادو ڕۆڵیشی لەپەی بردنی واتای نیگاو مەبەستەکانیو، لە پێودانگی بەڕێوەبردنی جیهانی دیاردا، پەی بردن بە کێشەو ڕووداوەکانو بەرەنگارییەکانو ڕێڕەوی ژیانو،و سروشتو مۆرکیاندا، هەر ئەم بزر بونەو ئەم دارمانە لەسەر دەمە دوا بەدوایەکەکانی مێژووی ئیسلامی پاش چەرخی یەکەم ڕێگای خۆشکرد بۆ تێکەڵی یەکی هەڵە لەبیری ئیسلامیدا، لەنێوان چەمکی نیگاو چەمکی عەقڵۆ، پەیوەندی نێوانیانو، سروشتی هەریەکەیانو شوێن یان بەپێی

سروشتی ئادەمیزاد لەجێ بەجێ کردنەکانو ئامانجی بونیاندا، بەم شێوەیە وا لەعەقڵی موسڵمانو هێزی موسڵمان کرا تووشی سەرە ڕۆیی ببێت تا بچێتە جوغزی چەند مەبەستێکی ترەوە جگە لە مەبەستەکەی خۆی، وردە وردە بینیەی ئیسلامی ئەو خەسڵەتانەی لەدەستدا کە پێی دەناسرایەوە لەوانەش جیاکردنەوەو ڕوون بینییەکی ڕەها سەبارەت بەهەر یەکە لەنیگاو عەقڵو دەوری هەریەکەیان.

لەبینیەو پرۆگرام گەرایی ئیسلامیانەی ڕاستو دروستدا هیچ دەرفەتێك نامێنێتەوە بۆ لەڕێ لادان بەناوی عەقڵ یان ئایینەوە،هەروەها دەرفەتیش نیە بۆ ستەم کاری بەناوی عەقڵەوە بەخستنە پشت گوێی مەبەستەکانی سروشو ئامانجو ئاراستەکانی، لەهەمان کاتدا بواریش نادرێت کە بەناوی ئاینو پیرۆزییەوە ستەم بکرێت وە چاو بنوقێنرێت لەکاروبارەکانی نەتەوە لەکاتێکدا خودی نەتەوە قەناعەتی بەو شتانە نەبێتو بە پێی ڕاوێژێكو کە گوێڕایەڵیو وەلای پێ وەدەست بێنیو بەرژەوەندی یەکانیشی هێنابێتەدی، هەروەها بواریش نادرێت کە لەسنوری ڕاوێژو قەناعەتی نەتەوە لابدرێت یان کوێرانە ڕێگە بگیرێتەبەر، بێگومان نەزانین نارەوێتەوە بە ڕوناکی زانست نەبێ، لاوازی تواناو هەڵەداوانی ڕێکخستن نارەوێتەوە تەنها بە گەشەپێدانی تواناو تانەفی ڕێکخستن نەبێ، هیچ بوارێك لەبەردەم بیری موسڵمانو عەقڵی موسڵماندانییە جگە لەوەی کە ڕۆڵی خۆیو بەرپرسیاریەتی لە بەئاگا هێنانەوەی نەتەوەدا ببینێ سەبارەت بە هۆکاری نارەحەتیو کەمو کوڕیی دارمانو شپرزەیی ڕابردووی بەدرێژایی چەرخو سەدەکانی پێشوو.

ئەگەر نەتەوە بیەوێت ناسنامە ڕونو ئاشکراکەی خۆی بگەڕێتەوەو ببێتەوە بەخاوەنی هێزو توانایەکی گەورەی پڕ لەبەخشش هیچ بوارێك بۆ دەست بەسەرا گرتنو خۆ بەسەرا سەپاندن نامێنێتەوە بەسەر عەقڵی موسڵمانەوە لە هەوڵدانە بنچینەییەکانیدا بۆ لێ هەڵگواستنو دۆزینەوەی وە تێڕوانینی وردو ئەزمونو تێگەیشتنو پەی بردن بە ڕوکاری ئاراستەکاریو بەرژەوەندی لەناخی خەڵكو کۆمەڵگە مرۆییەکاندا، لەبەر ڕۆشنایی سروشو تێ گەیشتنی شەریعەتەکەی لەسەر شێوازێکی زیندوی بەهێزو دامەزراوی چاك، کە داوای بەدی هێنانی مەبەستەکانی شەریعەتو بەرپاکردنی کۆمەڵگەی جێ نشینی دەکەن.

گەر بمانەوێت ئاسۆیەکی ڕوونو بەرهەم بۆ فیکرمانو توانا بۆ نەتەوەمان بگێڕینەوە ئەوا پێویستە پارێزگاری عەقڵی موسڵمان بکەین لەشۆڕبونەوە لەو مەسەلە غەیبیانەی بەدەرن لەوەی کە سروش هێناویەتیو پەیامی خوایی ئاماژەی بۆ دەکات.

ناکرێتە کە سروش لەبینیەی ئیسلامیانەی ڕاستەقینەدا ببێتە هۆکارێك بۆ پەك خستنی عەقڵو بیکاتە چەند وێنەیەکی مێژوویی وا لەعەقڵ بکات کە ببێتە، شوولی ترساندنو تۆقاندنو بیکاتە کۆتو زنجیری لەفەرمانو قەدەغەکردنو حەرام کردنو تاوان بارکردنی خەڵکی کە هیچ پەیوەندیەکی بە بارو گوزەرانی خەڵكو ڕێڕەوی ژیانیانەوە نیە هەر لەڕوو بەڕوو بوونەوەکانو، هەر شتێکیتر کە ببێتە مایەی بەرەو پێش چونی ژیانو گیانی داهێنان کاریو بەرز بوونەوەی ئاستی توانایان.

گەر بمانەوێت ڕونی بۆ بینیەمان بگەڕێنینەوە ئەوا بوار نادرێت بۆ ئەوەی پەیامەکەمان یاخود سروش بکرێتە بابەتێکی ئەکادیمیی ئاڵۆز کەخاوەنی هەیکەلو چەندەها بەڕێوەبەر بێو چۆنیان بوێ بەو بارەدا دایشکێننەوەو، بەناویەوە دەسەڵات پیادەبکەن بەسەر تواناکانی ژیانو عەقڵەکان. بەپێی ئەو بینیەیەی کە ئەوان هەیانە سەبارەت بەژیانو کۆمەڵگە، وە پرسو ڕا بەهیچ کەس ناکەن سەبارەت بەوشتەی پێویستە بۆ نەتەوەو ئەو ڕوبەڕو بونەوانەی ڕووی تێدەکات لەگەڵ ئەو خواستو توانایانەی دەیخوازێتو ئەو بەرەنگاریانەی کە ڕوو بەرووی دەبنەوەو ئەو ئیمکانیەتو چاوتێ بڕینانەی بۆیان دەڕوانێتو، هەروەها هەرشتێك پەیوەندی بەمانەوە هەبێت.

بەڕاستی موسڵمانانو عەقڵی موسڵمان زۆرێك لە ووزەو تواناکانی خۆیان لەکاروانی مێژوودا بەهەدەردا لەکاتێکدا ڕێگە درا بەم عەقڵە بڕواتە قولایی باش لەنادیارو(الالهیات)و درێژە پێدانەکانی فەلسەفی کە پەیوەستن بە هەموایەتی پەروەردگاریەی جگە لەوەی کە لەڕوانگەی ئیسلامیەوە پەسەندە بەخۆیو بە چوارچێوەی هزری پرۆگرام گەرایی کە سروش هێناویەتیو فیطرە ڕاستاندویەتیو، چەرخی کاروانی یەکەمی ئیسلامیلێ هاتویی بە کاربردنەکەی سەلماندوە.

ئەو ڕوانگە ئیسلامیە بەهێزەی کەتێدا نیگاو عەقڵو گەردوون تەواوکاری

یەکتردەبن و لا بەعەقڵی موسڵمان دەکاتەوە بەرەو تەماشاکردن و بیرکردنەوەو کار لەجیهانی دیارو کاروبارەکانی وەك چۆن سرووش ئاراستەی دەکات، ئەو ڕوانگەیە کە پێشەنگانی یەکەم توانییان ڕەشۆی داهێنانی پێ بگرن و، لەبەردەم عەقڵی موسڵماندا دەرگای ئەزموون و تەماشاکاری و پشکنین لەسوننەتەکانی ژیان و زیندەوەران بکەنەوە،و لەبەردەم ئادەمیزاددا ئاسۆگەیەکی نوێ لەبواری ژیاریدا والاکرد، ئەو بنچینەیەش بوو کە ژیاری نوێ پرۆگرامە زانستییە ئەزموونییەکەی لەبەر داڕشت، لەگەڵ دەستکەوتە ماددیەیە ئەزموونەکەی کە ئادەمیزاد لەپێشوودا هیچ هاوتاو نموونەیەکی وای بەخۆوە نەدیبوو.

بە ئەندازەی ئەوەی کە ڕەخسابوو عەقڵی موسڵمان لەپاك و بێگەردی بینیەی ئیسلامی لەو چەرخانەی کە بەسەریدا ڕۆشتووە بە ئەندازەی ئەوە توانای لاکردنەوە بەلای بنیاتنانەوەی ژیان و هەڵگرتنی ئەرکایەتی لەجێ نشینیی جیهانی دیارو ئاوەدانیدا هەبووە ـــ کە کەلەپووری ژیاری موسڵمانان گەواهی بۆ ئەدەن لە جۆرەها زانیاری و هونەری سروشتی و پێش کەوتنی تەکنەلۆژی و شەرعیدا ـــ بە ئەندازەی شۆڕبوونەوەی عەقڵی موسڵمان لەمەسەلەکانی غەیب و ئیلاهیات و جیهانی پاش ماد دەی ئەزەلییەوە ـــ کە ڕەهەندێکی ترەو عەقڵی ئادەمیزادو ژێر بێژی یەکەی پەی پێنابەن و مل کەچی هۆکارەکانی عەقڵی ئادەمیزاد نییە، لەجیهانی ئادەمیزاددا هاوتای نیە﴿ لم یلد ولم یولد ﴾ ﴿ لیس کمثله شیء ﴾ ـ، بەو ئەندازەیە کۆشش و توانای لە کیس داوە بەبێ ئەوەی چارەسەری کێشەیەك بکات یاخود گرێ کوێرەیەك بکاتەوە، بەڵکو هەتا ئێستا خەیاڵ پڵاوی و بگرەوبەردەیە(السفسطات) و ئەو کێشانەی کە لەپێناویا تێ کۆشێ ماوەتەوە، تێك هەڵچوون لەگەڵیدا بەردەوامە، هەتا ئێستاش کوێرایی بوون(العماوة) جیاوازی و بەربەرەکانی تێدا ڕوو لەزیاد بوونەو کەمیش ناکەن، هەتا ئێستاش دووبەرەکی و خۆکوژی بەردەوامە کە نەئەبوو درێژە بکێشێ، هیچ خێرێکی تێدانییە کەچی ڕوو لە زیادبوونە، هەتا ئێستا خراپ بەکاربردنی(استغلال)ئەم مەسەلەیە لای خاوەن ئامانجەکانیش گەورە دەبێت، نەتەوەش، بەدابڕ دابڕ بوون و هەڵگیرساندنی ئاگری مل ملانێ لە ڕیزەکانیدا، زەرەرمەند دەبێت، بەمەش دووری دەکاتەوە لەڕاستی ئەو ڕووبەڕووبونەوانەی کە ئاراستەی دەبن،و دوژمنان زاڵ دەبن بەسەریداو چاو تێ برین و ئامانجەکانیان بۆ دێتەدی.

بەڕاستی شەریعەتی ئیسلامی و نیگای ئیسلامی بۆ چوون گەلی گەورەو ئامانج و مەبەست و چەمك و بنەماو بەهاو ئەحکامی بنچینەیی هەیە، پێویستە ڕوون

بکرێتەوە لەرێکخستنی عەقڵیو پرۆگرامی زانستی دروست داو، بکرێتە یابەتێکی پەروەردەیی زانستی هەزری وا کە رۆڵەکانی نەتەوەی پێ پەروەردە بکرێتو لەسەر بنچینەیان پەیکەری دەروونیان دابڕێژێتو خۆراکی بیری پێ بداتو ئامرازی عەقڵیو زانستی یان بخاتە گەڕ.

پێویستە عەقڵی موسڵمانو پرۆگرامی لەم چەرخەدا رێك بخرێت، دەقو وشەکانی سروشو پەیام لە رێکخستنێکی تۆکمەو رێکو پێکی وادابێت کە مەبەستو ئامانجەکانی پێ ڕوون بێتەوە، چەمكو بەهاکانی تیادا بدرەوشێتەوە، لەسەر بنچینەی یەکەمینەکان (الاولویات) رێك بخرێن، ئەمەش تاوەکو زاڵ دەبێ بەسەر سەرچاوەی تێکەڵیو لێڵی لە بینیەیدا کە رێگای پێ داوەو بەردەوامیش رێگە ئەدات بەتێڕوانینی ناکامو بیری تیۆری نەزۆك بۆ بڵاوبونەوە، بۆ ئەوەی وشەی خۆی هەبێو شوێنێکیشی لە هەزری نەتەوەو فەرهەنگیدا بکاتەوە. بەڕاستی ڕوونیی لەبینیەو مەبەستو باش رێكو پێك کردنو نمایش ئەوەیە کە زاڵ دەبێت بەسەر ئەو لێڵیو تێکەڵیەدا، هەر ئەوەیشە کە نایەڵێت دیدی بێ ئاگا (الجاهل) لە دەقو پەیوەندییو یەکەمینەو ئامانجەکانیدا پێگەیان بۆ بمێنێتەوە.

پێویستە عەقڵو هۆشی ئیسلامی بەیەك پارچەیی بڕوانێتە سروشو لەسەر ئەەو بنەمایەش کارەکانی رێکخاتو یاسا گوزارییەکان پیادە بکات.

هەروەها پێویستە هزرو هۆشی ئیسلامی بە مەبەستی توێژینەوەو فێر بوونو سوود گەیاندن بڕوانێتە ژیانو زیندەوارانو مرۆڤو سوونەنو بارو دۆخو ژینگەو ڕووداوەکانو چارە بدۆزنەوە بۆ کێشەو گرفتەکانیانو، رێساو یاسایان بۆ دارێژن، لەڕوانگەی ئیسلامەوەو بە پێی مەبەستو داخوازیەکانی سروش.

کاتێك عەقڵی موسڵمان بە هاوبەش لەگەڵ سروشو بوونەوەردا وەك چاوگەکانی مەعریفەی ئیسلامی، رۆڵی ژیاریی خۆی دەبینێ، رۆڵە ئەکادیمیە پەسەندە ئیسلامییەکانی بوارە شەرعیو کۆمەڵایەتیو مرۆییە یاساییەکان لەلایەكو لەگەڵ ئەرکە سیاسیو یاسا گوزارییەکان لەلایەکی ترەوە هیچ تێکەڵییەك ناکاتو لێی تێك ناچێت. چونکە رۆڵی توێژینەوە زانستیو ئەکادیمیەکان لەبوارە جۆراو جۆرەکاندا بریتییە لەدەوڵەمەند کردنی نەتەوەو سەرکردەییو دامو دەزگاکانی بە مەعریفەو هزرو شارەزاییو لێکۆڵینەوەو جیایە لەئەرکە سیاسیە یاسا گوزارییەکاندا هەیە.

پێویسته ئەرکی سیاسی یاسا گوزاری قەوارەی نەتەوە پوختەی بینیەو ئەزموون و قەناعەتی نەتەوە بنوێنێ سەبارەت بە بەڕێوەبردنی کارو بارەکانی و، ئاراستەکردنی وزەکانی وە خستنە گەڕی داهاتەکانی و، بینیەی لەبەر پەرچ دانەوەی تەحەدییاتەکاندا، لەبەر ئەمانە ئەرکی سیاسیی یاسا گوزاریی سەرکەوتوو پێویستە سوود لەڕاوێژ کردن بە پۆلەکانی ئوممە، بەگشتی وەرگرێت لەسەر هەموو ئاستەکان و بەشێوەیەکی وا بوار بۆ گشت تاکەکان لەدەربڕینی ڕاو بۆچوونیاندا برەخسێنرێت و، هەموو خاوەن ئەزموون و پسپۆڕێك کارامەیی خۆی بنوێنێ، کە بەم جۆرە بینیەی سیاسی واقع بین و گشت گیرو بەرچاو ڕوون دەبێت و، پشت بەستوو بە ئوممەو ئەزموون و قەناعەتەکانی دەبێت و، پشتگیری و پابەندیشی بۆ خۆی مسۆگەر دەکات.

پشت بەستنی بینیەی ئیسلامی بە سروش وەك چاوگێکی هزرو مەعریفەی ئیسلامی و، پابەندی هۆشی موسڵمان لەدیدو بەخششیدا بۆ ئامانج و مەبەستەکانی سروشەوە، تێکەڵی نێوان دۆزی زانستی توێژەرەوەی ئەکادیمی لەگەڵ دۆزی سیاسیی یاسا گوزاری نا گەیەنێت و، گۆڕینی گۆڕەپانی سیاسیی یاسا گوزاریش نیە بۆ گۆڕەپانێکی فێرگەیی ئەکادیمی تیۆری، بەڵکو واتای دەوڵەمەندکردنی تەشریعی ئیسلامی و ڕامیاری ئیسلامی دەگەیەنێت لەبوارەکانی ئاراستەیی یە پەروەردگاری و ڕێنمایی یەکانی پەیامدا، بە بەشداربوونی توێژینەوە زانستی یە پسپۆڕەکان لەکاتی وەرگرتنی بڕیاری سیاسی و یاسا گوزاریدا.

پرۆگرامێك لەسەر بڕیاری سیاسیی بەکۆمەڵو گشتگیرانە بەندبێت هیچ دژایەتیەکی نیە لەگەڵ بوونی قەناعەتی تاکەکان یان نەبوونی لەچەند گۆشەیەکەوە بۆ هەرکارێك یان دۆزێك، هەروەها وەرگرتنی ڕایەکی تایبەت بۆ کارێکی دیاریکراو دژی گەڕانەوە لەڕایەکەوە بۆ ڕایەکی تر نیە، ئەگەر بەلای کۆمەڵەوە قەناعەتی ئەو گۆڕان و گەڕانەوەیە دروست بووبێ. لەجێیەك بڕیاری بەکۆمەڵ بەو هەموو تواناییانەوە شایانی هەڵەبێت بێ گومان بڕیاری تاکەکان گریمانەی هەڵەی زیاتری لێ دەکرێت. لەهەر بارێکدابێ ئەوا بڕیارەکانی کۆمەڵ جێگەی گرنگی دان و بایەخ و بەرژەوەندی بالایە، وە تواناکانی ڕاوێژکاری و تاقیکاریی بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆ بەرجەستە دەبێت هەروەها بەشداری کۆمەڵ لەداڕشتنی بڕیاری سیاسی و تەشریعی یەکاندا نزیکترە لەباری تێگەیشتن و وەرگرتن و پابەندبوون و جێ بەجێ کردنەوە.

بینیەی ئیسلامیی پشت بەستوو بەسروش و فیطرە وەك سەرچاوەیەك بۆ بنیاتنانی لەعەقڵ و گەردووندا بەپێویستی دەگێڕێت تەواوی بڕیارەکانی نەتەوەو کۆمەڵ بە ڕاوێژ بەڕێوە بچێ، چونکە ڕاوێژکاری و ڕەزامەندی گشتی یە لەنەتەوەدا کە بەرپرسیاریەتی ئیرادەی مرۆیی دەهێننە کایەوەو ئامانجەکانی جێ نشینی بەدی دەهێنن و پشتی ستەمکاری و سەرکەشی و ناچارکردنی خەڵکی و کۆمەڵگا کە دژی بەرژەوەندی و بینیەو ڕەزامەندی خۆیان ببزوێن دەشکێنن.

ترسان لەهەڵەی نێو بڕیارەکانی نەتەوەو، سووربوون لەسەر دروستی لەو بڕیارانەدا بڵاوبوونەوەی زانین و مەعریفە لەنێوان ڕۆڵەکانی نەتەوەداو گەیاندنی ئامۆژگاری پێیان، و پێکهێنانی دایەنگەیەك لەسەر شەونخونی پەروەردەکردنی نەتەوەکانیان و ڕۆشنبیرکردن و ڕێك و پێك کردن و ڕاهێنانیان لەسەر بەجێ هێنانی داخوازی یەکانی سروشتی دروست و عەقڵی دروست لەکاروبارەکانی ژیانیاندا پێویست دەکات هەروەها کردنەوەی کەناڵەکانی زانست و مەعریفە کە جەماوەری نەتەوە ئامادە دەکات بۆ هەڵبژاردنی چاکترین کەس لەکەسانی پابەندو خاوەن ڕاو ئەزموون، بۆ ئەوەی سەرپشك بن لە پێسپاردنی بڕیارە ڕامیاری و یاسا گوزارییەکاندا. جگە لەمەش دەرەنجامەکەی تۆقاندن و ستەمکاری و داڕووخان بێت، و نەزانین و بەرژەوەندی یە تایبەتیەکان و خراپ کاری ئارایشت و بەرگی هەق و بانگەشەی بەرژەوەندی گشتی دەپۆشن.

بەم شێوەیە نە لەبینیەی بۆچوونە ئیسلامی و نە لەبیری ئیسلامی دا نیگاو پەیام کە خوای گەورە پەیمانی پارێزگاری و هەردووکیانی داوە، تێکەڵ نابن لەگەڵ توێژینەوەو تێ گەیشتن و تێڕوانین و باسکردن و ڕوون کردنەوەو ڕاوبۆچووندا.

لەبینیەی ئیسلامی دروستدا بەڕوونی شوێنەواری نیگاو ڕۆڵی گرنگی دەمێنتەوە، هەروەها ڕۆڵی ئەدای زانستی و ئەکادیمی و، ڕۆڵی تێ ڕوانین و ئیجتیهادی تاکەکەسی لەبابەتە زانستی یەکاندا، هەروەها بە ڕوونیش ڕۆڵی یاسا گوزارییە کۆمەڵایەتی یەکان دەمێنێتەوە کە بوونەکەی لەپابەندیی بەنیگاو ئاراستەیی نیگاوە وەردەگرێت، کە ئەم یاسا گوزارییە والێدەکات لەهەموو کات و شوێنێکیدا مامەڵە لەگەڵ کێشەی نەتەوەو پێداویستی یەکانی و لەزۆربەی بوارەکانی ژیاندا بکات، بەوەیش کە تێیدایە لەبڕیارەکانی دەسەڵاتی گشتی بۆ فێرکردن و ڕاگەیاندنی بە ڕۆڵەکانی نەتەوەش.

گرنگـە کـە لەلێکۆڵینـەوەی پرۆگرامگـەرایی ئیسـلامیدا سـەرچاوەی مەعریفـەی ئیسـلامی ـ کـە بریتییـە لەسـروش و عـەقڵ و سـووننەت و ئـەو سروشـتگە و مۆرکانـەی کـە داچـنراوە لەگـەردوون و بوونـەوەریاندا تێکـەڵ نـەکرێت لەگـەڵ ئامرازەکـانی توێژینـەوەو لێکۆڵینـەوە زانسـتییە کۆمەڵایـەتی و مرۆڤایـەتی یـەکاندا، هـەموو بوارێکی زانستی ئـامرازی تایبـەتی خـۆی هەیـە کـە لەگـەڵ سروشـتیا گونجـاوە و وەڵام دەرەوەی پێداویستیەکانیەتی. بـەڵام سـەرجەم ئـەم بوارانـەی زانسـتی ئیسـلامی پشت بەنیگاو فیـترەت ـــ کەعـەقڵ و سـووننەتی خوایـی دەگرێتـەوە لـەنێو دروست کراوەکـانی لەگـەڵ تێکـڕای ڕێسـاو مۆرکیـان ـــ دەبەسـتێ و سەرچاوەیەکیشـە بـۆ مەعریفـەو ئاراسـتەکردن، بـە بـەکارهێنانی ئـامرازی دەسـت کـەوتوو لەهـەموو بوارەکـاندا بەیـەکتری تـەواوکردنی بەخشـی سـروش و عـەقڵ و سـووننەتەکان، خانـەکانی مەعریفـەی ئیسـلامی بـە گشـتگیری و واڵا کـراوی دەناسـرێن بـەڕووی هـەموو ئـامرازێکی گونجـاودا کـە زانسـتی و مەعریفـەی بەکـەڵکی بـۆ ئـادەمیزادان لێ بکەوێتـەوە.

ئـەو دواکـەوتن و ناڕەحەتیانـەی کـە دووچـاری نەتـەوە بـوون، پێویسـت دەکـات عـەقڵی موسـڵمان کـە ڕۆڵـی دروسـتی خـۆی بگێڕێتـەوە وەکـو چـاوگێك بـۆ هـزری ئیسـلامی، تـەواوکارو یـاریدەدەر لەگـەڵ سـەرچاوەی نیگـاو گـەردووندا بـۆ کـارکردن لەسـەر بنیـات نانـەوەی بینیەیـەکی ژیـاری لەڕوانگـەی ئیسـلامییەوەو، بنیـات نانـەوەی کۆمـەڵگای موسـڵمانی هاوچـەرخ و دام و دەزگاکـانی کـە پێداویسـتی نەتـەوەو ئایندەی ئەو ڕوو بـەڕوو بوونەوانـەی کـە ئاڕاسـتەی دەکرێـن خوازیـارن بـۆی.

ڕۆڵـی عـەقڵی موسـڵمان وەك سـەرچاوەیەکی مەعریفـەی ئیسـلامی، هێشـتا عـەقڵی موسـڵمانی ئـەم چەرخـە بەشـێوەیەکی ڕێـك و پێـك بەپیریـەوە نـەچووە، چونکـە ئـەم ڕۆڵـە تـەواو نـابێ تەنـها بەپشـت بەسـتن بەمەعریفـەی وەرگـیراو لـەفیطرە نـەبێ کـە خـوای گـەورە لـەنێو بوونـەوەریاندا دایناوە، تەنـها بـەبنیات نانـەوەی زانسـتە کۆمەڵایەتییـە ئیسـلامییەکان نـەبێ کـە لەڕوانگـەی ئیسـلامییەوە سـەرچاوە دەگرێ و بـە توێژینـەوەکانی کـە نەتـەوەی ئیسـلامی ئامادەبـاش دەکـات و مەعریفـەی پێویسـتی پێشـکەش دەکـات.

بۆ ئـەوەی عـەقڵی موسـڵمان و بـیری موسـڵمان هەسـتن بـەبنیات نانـەوەی زانسـتە کۆمەڵایـەتی یـەکان پێویسـتە بەتـەواوەتی بنچینـەکان و دەسـپێکو چـەمکی بنـەماکانی

ڕوون بێ، کەبیری ئیسلامی پشتیان پێ دەبەستێ و ئەو بنکە پرۆگرامگەراییە گشتییەی دەنوێنێ کە بەڕێنماییەکانی ڕێگا دەدۆزێتەوەو لەسەری دەڕوات.

**٢ ـ دەرچە بنچینەییەکانی پرۆگرامگەرایی ئیسلامی و هزری ئیسلامی:**

پرۆگرام گەرایی ئیسلامی کە لەپشتیەوە بیری ئیسلامی هەیە بەوە جیادەکرێتەوە کە دەرچەی بنچینەیی خۆی هەیە، بەبێ تێ گەیشتنیان ناتوانرێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، یاخود کردەوەی دروستی بنیات نەری لەمیانەدا بکرێت، ئەم دەرچانە بریتین لەو کۆڵەکە بنچینەییانەی کەڕێگا ڕۆشن کەرەوەن لەبەردەم عەقڵی موسڵماندا لەبزافە هزریە داهێنەرانە کەیدا بەرەو ڕەوتی گەیشتن لەکرۆکی ژیان و گیان لەبەران و بونەوەریان و هەڵس و کەوت لەگەڵیاندا و بەڕێوەبردنی کاروباریان و ئاراستەکردنی کاروانەکەیان.

ئەو دەرچە بنچینەییانە بریتین لەدەرچەی یەکتاپەرستی(الوحدانیە)و، خەلافەت و، بەرپرسیاریەتی، ئەم سێ دەرچە هێڵە سەرەکی یەکانی عەقڵی موسڵمانن، هەرنەخشەیەك لەم دەرچانەوە هەڵنەقوڵێت لەویژدانی موسڵمان و ویستی موسڵماندا وزەیەك بۆ بزاوتن و بیانوویەك بۆ بەجێ هێنان نابینێتەوە.

**أ) یەکتایی (الوحدانیة)**

یەکتایەتی بریتییە لەدەرچەی بنچینەیی یەکەم لەعەقڵی موسڵماندا، عەقڵی موسڵمان هیچ بوونێکی نییە ئەگەر باوەڕی بە یەکتایی نەبێ لەسەر ئەوەی کە بەڵگە نەویستێکی عەقیدەیی دروستیی فیطری و عەقڵی تێکەڵ بە هەموو گەردێکە لە قەوارەو هۆشیاری و ویژدانی و تێگەشتنەکانی لەخۆیی و ژیانی و گەردوونی دەوروبەری، بنچینەی ئەم بیروباوەڕە بەڵگە نەویستە فیطریە عەقڵییە بریتییە لەبڕوای ڕەهاو پەی بردنی ئاشکرا بەخوای بالادەست و بەدیهێنەرو تاك و تەنیا کەبێ نیازە بەهیچ کەس و هیچ شتێك و هاوتای نییە.

ئەم دەرچەیە وەك چۆن زاراوەکەی ئاماژەی پێ ئەداو، ووشەی شایەتمان دەری دەبڕێت و، قورئانی پیرۆزو فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی دەکەنەوە، عەقڵ و بیری موسڵمان و پرۆگرامگەرایی ئیسلامی لەسەر گریمانی هەق وەك بنچینەو خولگەو هیوایەك بۆ هەموو گەردوون و بونەوەریان ڕادەگرێ و دەچەسپێنێ، هەروەها لەسەر گریمانی بوونی گەردوون و بونەوەریان، کە

گێڕانەوەی بوونیان بەرەو دەسەڵاتی خوای بەدیهێنەری تاك و تەنیاو بێ هاوەڵ و بێ هاوتایە، هەروەها لەسەر گریمانی یەکێتی سەرچاوەو یەکێتی حەقیقەت کە لێیەوە دەست پێدەکات و لەگەردوون و بونەوەریدا ڕەنگ دەداتەوە، هەروەها لەسەر گریمانی یەکێتی ئادەمیزاد کە خوا بەدی هێناوەو ڕێزمەندی کردووە بەتوانست و خەلافەت و سەرپەرشتی کردنی بونەوەریان لەسەر بنچینەی حەق و داد پەروەری و چاکە خوازیدا.

لەبەر ئەوەش عەقڵی موسڵمان لەبزافە زیندەیی یەکەیدا بنەمای یەکتایی لەبۆچوون و سەرجەم پەیوەندی یەکانیدا بەر جەستەیە، لەبەرنامەی ئەم عەقڵەدا بوارێك یاخود ڕێگایەك بۆ ڕاڕایی یان گومان یان سەرسامی یان شپرزیی یەك لەسروشتی بوون و ئامانج و ئاواتیا نەهێڵراوەتەوە.بە متمانەیە لەڕووگەیدا، دڵنیایە لەڕووی هەنگاونانەوە، لەو ئاراستەیەدا ڕێی هیچ لادانێك نیە بواری تێکدانی کۆششەکەی نیە ڕێی لادانی نی یە لەبارەی ئەرکی چاکەخوازییدا لەژیان و گەردووندا، چونکە پابەندە بەدەسپێکی یەکتایی و توند دەستی پێوە گرتووە،و وێناکراوە بەڕێنمایی یەکانی، چ لەبواریکۆمەڵایەتی یان سروشتی یان تەقەنیدا. هیچ کاتێك عەقڵی موسڵمان سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە تەنها لەمیانەیدەست گرتن بەدەسپێکی بنچینەیی خۆی نەبێ لەیەکتاپەرستیدا، گومڕابوونیشی بەهۆی پشتگوێ خستنی بووە بۆ دەسپێکی یەکتاپەرستی و یاخود بێ ئاگابوون لێی، خۆ خەریك کردنی بەشتی لاوەکیەوە کە ئەو بنەمایەی وەك ڕێبەرێك بۆ فکرو بزاوتن و پابەندبوون کار پێ نەکردووە.

بەم شێوەیە عەقڵییەتی ئیسلامی و پرۆگرامی ئیسلامی هۆشیار بەیەك باری و بەرچاو ڕوونی و بنکەیەکی دامەزراو بۆ ڕوانینە گەردوون و ژیان دەناسرێتەوە،و هیچ بوارێك بۆ دژایەتی یان مل ملانێ نەهێڵراوەتەوەو، هیچ بوارێك بۆ جیاکاری یان خۆ بەزل زانین و خراپەکاری نەماوەتەوە دەرچەی عەقڵییەتی ئیسلامی و پرۆگرامی ئیسلامی بریتی یە لەبنکەی چارەسەریی دروست بۆ نەخۆشیەکانی هەواو ئارەزوو ڕەگەزپەرستی و خۆ بەزل زانین و خراپەکاری، وەڵامی تەواویشی هەیە بۆ ئەوەی کە عەقڵی ئادەمیزاد تووشی دەبێ ــــ وێڕای هەموو دەستکەوتە مادیەکانیشی ــــ لە هیلاکی و ئارەحەتی و سەرسامی و دۆڕان لەبەدی هێنانی ئاشتی و ئاسایش و دڵنیایی بۆ دەروون و کۆبەستن و گەلان.

﴿ سبح اسم ربك الذى خلق فسوى * والذى قدر فهدى ﴾ الاعلى: ١٣

﴿ ما اتخذ الله من ولد وما كان معه من اله * اذا لذهب كل اله بما خلق ولعلا بعضهم على بعض سبحان الله عما يصفون ﴾ المؤمنون: ٩١.

﴿ ام خلقوا من غير شيء ام هم الخالقون ﴾ الطور: ٣٥.

﴿ قال ربنا الذى اعطى كل شيء خلقه ثم هدى ﴾ طه: ٥٠.

﴿ هذا خلق الله فأروني ماذا خلق الذين من دونه ﴾ لقمان: ١١.

﴿ صنع الله الذى أتقن كل شيء انه خبير بما تفعلون ﴾ النمل: ٨٨.

﴿ خلق السموات والارض بالحق وصوركم فاحسن صوركم واليه المصير﴾ التغابن: ٣.

﴿ ماترى فى خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور﴾ الملك: ٣.

﴿ أفحسبتم انما خلقناكم عبثا وانكم الينا لاترجعون * فتعالى الله الملك الحق﴾ المؤمنون: ١١٥-١١٦.

﴿ لوكان فيهما آلهة الا الله لفسدتا فسبحان الله رب العرش عما يصفون﴾ الانبياء: ٢٢.

﴿ ليس كمثله شيء وهو السميع البصير ﴾ الشورى: ١١.

﴿ ومن يؤمن بالله يهد قلبه والله بكل بشيء عليم ﴾ التغابن: ١١.

﴿ ذلك بان الله هو الحق وأنَّ مايدعون من دونه هو الباطل وأنَّ الله هو العلي الكبير ﴾ الحج: ٦٢ .

### ب) جیٚ نشینایەتی (خەلافەت)

مەبەست لەخەلافەت جیٚ نشینیی ئادەمیزدە لەزەویو گەردوندا، کە بریتیە لەجیٚ نشینی لەرووی سەرپەرشتیو ئاوەدانکردنەوەو بەڕێوەبردنو ڕام هێنانی دروست کراوەکانو گیان لەبەران لەژێر فەرمانبەری ئادەمیزاددا، کەئادەمیزاد پێی هەڵدەستیٚ وەك سەرپەرشتیارو نوێنەرە لەلایەن خوای گەورە لەهەڵسو کەوتو ڕەفتاری ناو گەردوونو زەویو نێو دروست کراوەکانو زیندەوەران. موسڵمانیش بەفیطرەو بیرو باوەڕەکەیو پرۆگرامی بیریەوە لەسەر بنچینەی ئەم پێگەیەو، بەوەی خوای گەورە ڕێزمەندی کردووە بەهۆی توانستو توانای زانیاریەوە لەڕوانگەی خەلافەتەوە دەڕوانێتە مرۆڤ وەك سەرپەرشتو چاکسازو ئاوەدانکار.

بەم شێوەیە جێ نشینی لەچەمکی عەقڵی موسڵماندا بریتییە لەنیعمەتو ڕێز لێنانێك کە ئادەمیزاد لەجێگای تواناو زاڵ بوونی بەسەر گەردووندا دائەنێ، وەژێر بارخستنە بۆ پێداویستیەکانی خۆیو پێ سپاردنی فەرمانی دەسەلاتیشە بۆ بەڕێوەبردنی ژیانو، ئاوەدانکاریو چاکسازی تیایدا. کە بەرپرسیاریەتییە کە واتاکەی لەناوەڕۆکدا بریتییە لەسەربەستی لەتواناو بڕیاردا.

ئادەمیزاد ناتوانێ ڕۆڵی خۆی لەژیاندا ببینێو، دەروونو ویژدانی ئۆقرە ناگرێ تەنها بەکردەوە بڕیاری زیندوو نەبێ لەبەڕێوەبردنی گەردوونو ژێر بار خستنو چاودێری کردنیداو هێنانەدی داخوازیەکانی بوونو جێ نشینایەتی لەسەر زەوی لەبەر ئەوەش کردار داواکاری ئادەمیزادە. بڕیاریش هەر داواکاریەتی بۆی، زانستیش بەهەمان شێوە، پێگەی جێ نشینیەتی عەقڵی موسڵمانیش ئامانجی ئەو داواکاریە فیطریانە ئاراستەو دیاریدەکات، بەم شێوەیەش دەبنە داخوازی بەرەو چاکەو سەرپەرشتیو ئاوەدانکاری.

﴿ أفحسبتم أنما خلقناكم عبثا وأنكم الينا لاترجعون ﴾ المؤمنون: ١١٥.

﴿ الذى خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم احسن عملا ﴾ الملك: ٢.

﴿ واذ قال ربك للملائكة اني جاعل في الارض خليفة ﴾ البقرة: ٣٠.

﴿ وسخر لكم مافي السموات وما فى الارض جميعا منه ان في ذلك لآيات لقوم يتفكرون ﴾ الجاثية: ١٣.

﴿ هو الذي جعل لكم الارض ذلولا فامشوا فى مناكبها وكلوا من رزقه واليه النشور ﴾ الملك: ١٥.

﴿ قل سيروا فى الارض فانظروا كيف بدأ الخلق ﴾ العنكبوت: ٢٠.

عەقڵی موسڵمان لەپێگەی جێنشینییەوە بانگکراوە بۆ ڕام هێنانی گەردوونو بوونەوەریان بۆ ئەوەی کە سوود بەخشە: بۆ خۆیو گەردوونو کۆشەو کەنارەکانی، بانگکراوە بۆ زانستو نهێنیەکانیو ژێر بار خستنی ئەو زانیارییە بۆ خزمەتو خێر. عەقڵی موسڵمانیش لەپێگەی جێ نشینییەوە خاوەنی ڕێزو پایەو ووشەیە لەگەردووندا، داوای کۆششو داهێنانو ئاوەدانی لێ کراوە، بەزانستو ئاوەدانیو ڕام هێنان ئادەمیزاد ئەرکی خۆی لەسەر زەوی ئەنجام دەداتو دەگاتە ئاستی ئامانجی، هیچ ڕێگایەك نیە بە پێی فیطرە دەڵێت بۆ دڵنییای دەروونی ئادەمیزاد جگە لەزانستو کردەوەو کۆشش کردنی چاکە نەبێ لەسەر زەویدا،

هیچ بوارێك لای عەقڵی موسڵمانو لەویژدانی زیندووی هۆشیاریدا نەماوەتەوە بۆ چۆك دادانو نەفامیو دانیشتنو وازهێنان لەزانینی خێرو کردەوەی چاکەو کۆشش بۆ خێروچاکە، ئەوە ئامانجی بوونی ئادەمیزادە، ئەوەش جێ نشینییەتی لەسەر زەوی، پاشە ڕۆژیش لەپاش ئەم ژیانەوە تەنها بەرئەنجامێکی ئەم کردەوەو زانیاریو کۆششانەیە.

بەڕاستی ڕەهەندی خەلافەتە لەعەقڵیەتی ئیسلامیدا کە دەتوانێ ڕاڤەی وزەو توانای قافڵەی یەکەمان لەپیاوانی ئیسلام بۆ بکات، ئەو وزەو توانایەی کە کوژانەوەی نەبوو لای پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) یارانی، ئەو تواناو وزەیەی کە تەمبەڵی نەزانیوەو بێ تاقەتی ڕووی تێ نەکردووە لەکۆششو کردارو بەخشینو(الایثار)و تێکۆشاندا گۆشەو کەناری دونیایان لەچەند ساڵێکی کەمدا بەحەقو ڕێنماییو چاکسازیو ئاوەدانی ڕووناك کردەوە، سەردەمانی پەیامو ڕێنماییەکانی ئاسمانییان بۆ ئادەمیزاد نوێ کردەوە، دەنگی شارستانێتیو چاکسازی وابڵند بوویەوە هیچ بستە خاکێك نەما کەشوێن دەستو کەڵكو خەیری پێ نەگەیشتبێ.

پێگەو مەدلولی جێ نشینیو ئەرکەکانی جێنشینی لەبینیەی قافڵەی یەکەمدا سەرچاوەی تواناو وزەو کۆششو بەخشینو پاك دەروونیو داوێنی یانو قەناعەتو(ئیثار) یان بووە. هیچ بوارێك بۆ هیچ کەسێکی حاڵی لەم پێگەیە نەماوەتەوە کەپەنا بەرێتەبەر چۆك دادانو نەزانیو دواکەوتنو خوویان بداتێ.

**ج ) بەرپرسیاریەتی ڕەوشتی:**

دەرچەی سێ هەم کە عەقڵیەتی ئیسلامیو پرۆگرامی ئیسلامی لەسەری پێك دێن بریتییە لەپێگەی بەرپرسیاریەتی ڕەوشتی، هەرگیز ناتوانین لەئادەمیزادی موسڵمانو عەقڵی موسڵمان بگەین بەبێ ئەوەی لەپێگەی بەرپرسیاریەتیو ڕەهەندی ئەو عەقڵیەتە تێ بگەین، تەنانەت لەسەردەمەکانی دواکەوتنیشداو، تەنانەت لەناوازەترین کاتی ون بوونی ئادەمیزای موسڵماندا، چونکە ئەوەی کە دەیپارێزێ لەتیاچوونو دەیهێڵێتەوەو ناهێڵێت لەلۆچەکانی مێژوودا ون بێت ئەو ویژدانە بەخەبەرە زیندوویەتیو هەست کردنیەتی بە بەرپرسیاریەتیو کەمو کورتییەکانی لەجێ بەجێ کردندا. لەبەر ئەوە عەقڵی موسڵمان مایەوەو بەردەوامیش لەکۆششدایە ڕازی نییە بەو واقعە دواکەوتوییە ژەنگ گرتووەراوەستاوەی،

چونکە ڕەهەندی هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی ڕەوشتی لەعەقڵی موسڵمان‌و ویژدانی موسڵماندا‌گرانە‌بەلایەوە کەواز لەموسڵمان بهێنێ لەنێوەندی شپرزی‌و کەم‌و کورتی‌دا بتلێتەوە، لەبەر ئەمەش مێژووی نەتەوەی ئیسلامی لەسەدەکانی دوایی‌دا کاتێك تیێ ڕوانینەکانی لێلْ داهاتن‌و ڕێگای وون کردو کاروانەکەی دواکەوت بووە مێژوویەکی(خەو لیْ زڕاو) بێ ئارام، هیچی بۆ نەمایەوەو بەدەستەوە نەما تەنها هەست کردنی بەر پرسیاریەتی نەبیْ، لەبارەی گێڕانی ڕۆڵی بۆچوون‌و دیدیەوە لەبارەی کەم‌و کورتی یەکانیەوە، بۆتە مایەی گەڕانی بەردەوام‌و لەسەریەك بۆ دەرچوون لەو بارە نائومێدەی کەتێیدا دەژی‌و، لەو دواکەوتنەی کەدووچاری بووە ڕێنمایی کردن‌و ڕێ نیشاندەری مەوقعی لەجیْ نشینی یەتی زەوی‌و ژیاری ئادەمیزادی لەئاوەدان کردنەوەی گەردوون‌و چاکسازی تیایدا.

پێگەی بەرپرسیاریەتی‌و ڕەهەندەکانیشی بریتی‌یە لەو پێگەو ڕەهەندانەی کە ڕووی دووەمی پێگەی جیْ نشینی‌و چەمکەکەی لەپێکهاتەی عەقڵیەتی ئیسلامی دەنوێنیْ. جیْ نشینی‌و ئامانج شایستەیی یەکانی لەسەربەستی توانا‌و توانستی پەی پیْ بردن‌و وزەی زانست، لەگەڵ خۆی‌دا بەرپرسیاریەتی ڕەوشتیی ئادەمیزادیی هەڵدەگرێت لەبارەی ئەو دەورەی،و ئەوەی بەدوای دادێت لەبڕیارەکان سەبارەت بەڕام هێنانی گەردوون‌و بەڕێوەبردنی، بەکۆشش بیْ یاخود بەپاڵدانەوە، بەچاکسازی بیْ یان تێکدان، بەداد پەروەری‌و مام ناوەندێتی یان بەفیڕۆدان‌و زیادەڕەوی.

پێگەی یەکتایی بریتی‌یە لەپێگەی لیْ براوانەی بوون‌و جیْ نشینایەتی‌و بەرپرسیاریەتی، لەبەر ئەوە ژیان لەئایینی ئیسلامدا بریتی‌یە لەتاقی کاری بۆ ویستی ئادەمیزادو توانینەکانی(قدراتە) کە لەپێناو هەندیْ لەجیْ نشینایەتی گەردووندا بەدی هاتووە، هەر کەسێك بەرەو ئامانجی فیطرەی خۆی لەچاکسازی‌و ئاوەدان کردنەوە کۆششی کرد مانای وایە بەرپرسیاریەتی هەڵگرتووەو بڕیاری چارەنووس سازانەی چاکەی خۆی بدا وە هەتا هەتایە، هەرکەسێکیش بەویست‌و توانینەکانی کۆششی کرد بەرەو بەدەر لەو فیطرەیەی کەبۆی بەدی هاتووەو، بردی بەرەو کەم‌و کورتی‌و ستەم‌و خراپ کاری ئەوەیە کەوازی لەبەر پرسیاریەتی هێناوەو سنوری ئەرکایەتی خۆی‌و ئامانجی بوونی بەزاندووەو، کۆتایی بەچارەنووسی خۆی بۆ دواین جار هێناوە بەرەو بنکی بنەوەی ئاگر.(اسفل السافلین).

هەر لەپێگەی بەرپرسیاریەتی‌وە لەعەقڵ‌و ویژدانی موسڵماندایە، کە کۆششی

موسڵمان و بڕیارەکانی و زانیاری یەکانی تەواو وەرگیراو نابێ هەتا وەکو بەهەق و داد پەروەری و چاکە و کۆشش کاری و چاکسازی و ئاوەدانکاری یەوە بەئەنجام نەگەیەنرێت.

﴿ قل انما أنا بشر مثلكم يوحى اليَّ انما الهكم اله واحد فمن كان يرجو لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه احدا ﴾ الكهف: ١١٠.

﴿ يايها الناس كلوا مما فى الارض حلالا طيبا ولاتتبعوا خطوات الشيطان انه لكم عدو مبين ﴾ البقره: ١٦٨.

﴿ وابتغ فيما آتاك الله الدار الاخرة ولاتنس نصيبك من الدنيا واحسن كما احسن الله اليك ولا تبغ الفساد فى الارض ان الله لايحب المفسدين ﴾ القصص:٧٧.

﴿ واتقوا يوما ترجعون فيه الى الله ثم توفى كل نفس ماكسبت وهم لايظلمون ﴾ البقره:٢٨١.

﴿ ان الله يامر بالعدل والاحسان وايتاء ذي القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي يعظكم لعلكم تذكرون ﴾ النحل: ٩٠.

﴿ من عمل صالحا فلنفسه ومن اساء فعليها ثم الى ربكم ترجعون ﴾ الجاثيه:١٥.

﴿ الا تزرُ وازرةُ وزر اخرى * وان ليس للانسان الا ماسعى * وان سعيه سوف يرى * ثم يجزاه الجزاء الاوفى ﴾ النجم: ٣٨-٤١.

﴿ ثم ردوا الى الله مولاهم الحق الا له الحكم وهو اسرع الحاسبين ﴾ الانعام:٦٢.

﴿ ثم جعلناكم خلائف فى الارض من بعدهم لننظر كيف تعملون ﴾ يونس:١٤.

﴿ فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره * ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره ﴾ الزلزله:٧-٨.

کۆششی موسڵمان بەدەسپێکی خەلافەت و ژێر بارهێنانی بۆ بوونەوەرو بەڕێوەبردنی بۆ بوونەوەریان و دروستکراوان لەسەر بناغەی حەقیقەتی یەکتایی، سەلماندن و بەرز ڕاگرتنی زاتە، گەیشتنە بەحەق و حەقیقەت، بۆیە دەبێتە کۆششێکی خۆشەویستانە و پڕ شانازی بۆ حەق. بەرپرسیاریەتی موسڵمان بەم واتایە لەناوەڕۆکدا سۆزی سوور بوون و پێ داگرتنە لەسەر حەق و شانازی پێوەکردنیەتی، ئەگەر ترس و بیمێك ڕێ لەم سۆزەپاکە بگرێت ئەوە ترسێکی

پیرۆزەو لەپێناو بەردەوام بونی خێرو حەقێکە کە فیطرەو بینیەی روون و ئاشکرا بۆ مانای بوون و ئامانجایەتی ئەو بوونە دەیهێننە کایەوە.
دەرچەی بەرپرسێتی بەو پێ یەی تەواو کەرە بۆ دەرچەی خەلافەت لەعەقڵ و ویژدانی موسڵماندا ووزەی خۆشەویستی و بەخشین و ویژدان و جددیەتی قافڵەی یەکەمی ئیسلاممان بۆ لێك دەداتەوەو دێنێتەوە یاد، کە وەك پێشەنگ لەمێژووی نەتەوەو کۆمەڵگاکاندا ناویان دەبرێت و بە نموونە دەهێنرێنەوە، هەروەها ڕاڤەی ئەو نموونە بڵندانەمان لەپیاوانی سەرەتای هاتنی ئیسلام بۆ دەکات کەتەماع و خۆدەرخستن و خۆ هەڵکێشان شوێنەوارێکی لەدڵ و دەروونیاندا نەبوو بەڵکو بەخۆگرتنەوەو ماڵ بەخشین و کۆنەکردنەوەی خۆیان ڕازاندبووەوە. لەگەڵ ئەوەی توانای ماڵ کۆکردنەوەشیان هەبوو لەو سنورەی خوا دیاری کردبوو بۆیان، حەزیان لەپاشەکەوت کردنیش هەبوو بەلام ئەوان ﴿ ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما وأسيرا * إنما نطعمكم لوجه الله لانريد منكم جزاءً ولا شكورا ﴾ الانسان: ٨-٩
دەرچەی بەرپرسێتی زامنە بۆ دامەزراوێتی هزری ئیسلامی دروست،و زامنیشە بۆ دەست کەوتنی خەیر لەپرۆگرامی عەقڵی ئیسلامی‌دا، عەقڵ و پرۆگرامی موسڵمان لەدەرچەی بەرپرسێتیە ڕاستەوخۆکەیەوە لەبەردەم پەروەردگاردا لەڕووی بەجێ هێنانی ئەرکیەوە وەك خەلیفەی سەرزەوی و سەرپەرشتیارێتی و ئاوەدانکردنەوەی‌دا ئۆقرە ناگرن و خۆیان ناگرن تا دڵنیانەبن لەوەی کارمەندێتی و ئامانجیان خەیرەو بەرەو خەیرە، مەبەستیش کە خەیری و بۆ چاکسازی بێت لەزانست و کرداراو بەجێ‌هێناندا یەکەمین و بەرزترین پێوەرە لەئەداو بەجێ هێنانی کاری موسڵماندا:(انما الاعمال بالنيات * وانما لكل امرىء مانوى) متفق عليه.
ئەگەر واتای هەرسێ دەرچەی(یەکتایی و خەلافەت و بەرپرسێتی) مان بۆ روون بوەوە لەگەڵ پەیوەندی نێوانیان بنیات نانی عەقڵ و ویژدان و پەیڕەوگەرایی هزری موسڵماندا، وا لەتوانای تاك و کۆمەڵی موسڵماندا دەبێت کە ڕێگاو ڕێبازی و سەرچاوەی ووزەکەی بدۆزێتەوەو سەرکەوتن بەدەست بهێنێ لەپەروەردەکردنی ڕۆڵەکانیدا لەسەر پرۆگرامێکی ئیسلامیانەی دروستی وا کەهزرو عەقڵی موسڵمان بۆ کارگوزارییەکی پوخت ئامادەبکات،و ووزەکەی بەشێوەیەك نوێ بکاتەوە ببێتە پاڵنەرێك بۆ بەردەوامێتی ڕەوتی نەتەوەو سەرکەوتنی بەسەر پلەکانی مێژوو

ژیـاردا، وەك هـێزێكی بەهەڵمـەتی پێشـەنگی خـێرخوازی دامێنـەر لەبـەر ڕۆشـنایی فیطرەتو ئایینی پـاكدا.

دەرك كـردن بەحەقیقـەتی یـەكتایی پـەروەردگار دەبێتـە هۆكـارێك بـۆ عـەقڵی موسـڵمان كـە ڕووگـەو ڕێڕەوی خـۆی دیـاری بكـاتو تێیـدا سـەركەوتووبێت،و بـەهۆی ئـەنجامدانی خەلافەتەكـەی بەشـێوەیەكی بـاش پـێ هـەڵبگرێو بـۆ پێشـەوە بـڕوات، هـەروەها هەسـت كردنـی بەرپرسـێتی یـەكی كامڵانـە كاروبارەكـانی تۆكمـەو گونجـاو دەبێـت، لەكۆتاییشـدا بـەپێی وەهـا پرۆگرامێكـی تـێرو تـەواو دەبێتـە موسـڵمانێكی جیددی، هـەموارو كـامڵ لـەبواری دۆزە ڕەوشـتیەكاندا، مـاندوو نەناسـنو بـە بەرهـەم بەهەمیشـەیی.

ئەمانـە ئـەو پێگـەو دەرچانـە بـوون بـۆ پرۆگرامـی حـەق كـە ئـەركی موسـڵمانە پیادەیـان بكـاتو بەتەنگیانـەوەبێت،و ڕێ نـەدات خڵتـەی فەلسـەفەو كـەلتورە نامۆكـان،و پـەردەی كـارە بـەرماوە لاوەكیـەكان ببنـە ڕێگـر لەئاسـتی دەرك كردنـی بەئامانجو مەبەستەكانی خۆیو ڕێكخسـتنیان بـەپێی گرنگیـان.

عـەقڵی موسـڵمان كـاتێك دەتوانێـت هـێز بەبـەر خۆیـدا بێنێتـەوەو ڕێـڕەوی ڕاسـت بكاتـەوەو پرۆگرامـی فیكـری خـۆی چـاك بكـاتو ببێتـەوە ڕێبـەرو پێشـەنگی نێـو نەتـەوەكان، كـە بەشـێوەیەكی گشـت گیرانـەوە بڕوانێتـە ئیسـلامەكەیو ئایەتـەكانی قورئـانی پـیرۆزو مەبەسـتەكانی.

## ٤. چەمكە بنچینەییەكانی پرۆگرامگەرایی ئیسلامی:

ئەگـەر بمانـەوێت دەركـی چۆنیـەتی ئـەداو بـەكاربردنی عـەقڵی موسـڵمان بكـەین تەنـها ئـەوەندە بـەس نیـیە كـە بـەچوار چێـوەو پرۆگـرام گـەرایی ئـەو عەقڵـەو دەرچـەكانی بزانـین، بەڵكو پێویسـتە ئـەو چەمكانـە بناسـین كـە بنچینـەو بزوێنـەری كـاركردنی عەقڵەكـەو پرۆگرامەكەیشـیان،و لایـەنی كردەوەیـیو بـەجێ هێنانیشـمان دەنوێنـن.

بەداخـەوە كەخڵتـەو لێڵاوێكـی زۆر لكـاوە بەچەمكـە بنچینەییـەكانی پرۆگرامگـەرایی ئیسلامییەوە، لەڕێی كولتـوورو فەلسـەفەو مـەعاریفو جاهیلییـاتی ئـەو گـەلو نەتەوانـەی هاتنە ناو ئیسلامەوەو تێكەڵ بـەفكری ئوممـەبوون، لەهـەمان كاتیشدا لاوازی لەپابـەندێتی زۆر لەسـەركردایەتیە سیاسـیەكانی ئوممـەت بـەئایینو هـەڵ پەرسـتییان بەتایبـەتی لەسەردەمەكانی دواییدا فاكتەرێكی هاندەرییو بۆنەو مەبەستە.

ئەو تێکەڵ بوون و ئاڵێیە لەبواری پرۆگرام گەرایی عەقڵی موسڵماندا بووە هۆکارێکی کاریگەر بەدەست ئەو جۆرە سەرکردایەتییانەوەو لەو ڕێیەوە توانیان دیدو ڕوانگەی ئوممە لاوازبکەن و خۆیان زاڵ بکەن بەسەر چارەنووسیدا بەشێوەیەکی ستەم کارانە،و بەم پێ یەش لادان و سەرکەشی و هەوەس بازی سەری هەڵداو سەرکردایەتی و بەڕێوەبردنی کاروباری نەتەوەیان پشت گوێخست.

لەگرنگترین ئەو چەمکە پرۆگرامگەراییانەی دەبنە نوێنەر بۆ ڕووەی جوڵەو بزاوتن لەپرۆگرام گەرایی عەقڵی موسڵماندا ئەمانەن:

ا. چەمکی ئامانج گەرایی لەبەدی هێنان و بووندا.

ب. چەمکی بابەت گەرایی حەقیقەت و پێگە ڕێژەیی لەو بابەتیەدا.

ج. چەمکی سەربەستی لەبڕیارو ویستدا.

د. چەمکی هەموایەتی تەوەککول.

ه. چەمکی سەبەبییەت لەبەجێ هێنانی کاری مرۆییدا.

**ا- ئامانج گەرایی لەبەدیهێنان و بووندا:**

عەقیدەی یەکتاپەرستی و بنەمای یەکتایی بریتیین لەو عەقیدەو بنەما بنچینەییەی کە عەقڵییەتی موسڵمانی لەسەربەندە، ئەگەر بێت و واتای ئەم عەقیدەیەش بەشێوەیەکی وشیارانە بەپێی مەدلول و ڕەنگدانەوەکانی لەژیان و بوونیدا لێك بدرێتەوەو وەربگیرێت ئەوا یەکبوون لەخەلق و یەکبوون لەژیان و مرۆڤ و حەقیقەتدا بەرجەستە دەکات، ئەم یەکبوون و یەك مەبەستییەش ئامانج گەرایی لەبەدی هێنان و بووندا بەرجەستە دەکات:

﴿ وما خلقنا السموات والارض وما بينهما لاعبين لو أردنا أن نتخذ لهوا لاتخذناه من لدنا ان كنا فاعلين ﴾ الانبياء: ١٦-١٧.

﴿ وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون ما اريد منهم من رزق وما اريد أن يطعمون ﴾ الذاريات: ٥٦-٥٧.

بەدیهێنەرێتی تەنها خوای پەروەردگاریش بۆ هەموو بوونەوەر ئەوە دەسەلمێنێت کە بوونەوەریان هەموو یەك سەرچاوەیان هەیە، بۆیەك ئامانج بەدی هێنراون، فیطرەی عەقڵی مرۆیی عەقیدەی عەقڵی موسڵماندا لەبارەی یەکتایی بوونەوە ڕێنمایی عەقڵی موسڵمان بۆ ئەوە دەکەن کە یەکبوون و یەکپارچەیی

خەلق و ئامانج گەرایی یەکەی و ئەو تەواوکاری و ڕێک و پێکیەی بسەلمێنێت و قەبوڵی بکات. فیطرەو عەقیدەی یەکتاپەرستی لەنێو عەقڵی موسڵماندا دەبنە ڕێبەری براوتنی عەقڵەکەی کاتێك مامەڵە لەگەڵ بوونەوەریان و ڕووداوەکانی نێو بوونەوەر دەکات لەپێگەو دەرچەی ئامانج گەرایی و سستەم و یاسادا. بەپێی ئەم چەمکو واتایەش هەڵوێستی ناهەموارێتی لەعەقڵییەتی ئیسلامی قەبوڵ ناکرێت سەبارەت بە پەیوەندییەکانی بەبوونەوەریان و دروستکراوان و ڕووداوەکانەوە، هەروەهاش ڕێڕەوی پاڵ دانەوەو عەقڵییەتی سەرپێیانەش هەر قەبوڵ ناکرێن.

عەقڵ و بونی موسڵمانیش بەپێی سروشتە مرۆییەکەی و وشیاری و دیدە ئیسلامیەکەی خەلیفەو شوان و شایەت و سەرپەرشتە بەسەر بوونەوەرو بوونەوەریاندا، وە هەموو بوونە وەرییەك و هەموو ڕوداوێك واتای خۆیان هەیە لەفام و وشیاریی موسڵماندا هەروەها مەبەست و ئامانجێکیان هەیە کە تەرخان کراون بۆی و لەبیر خۆبردنەوەو پشت گوێ خستن و کەم کردنەوەو بەکەم زانینی پلەو پایەیان ڕاست نیە.

ئامانج گەرایی لەخەلقدا لەبارەی ڕۆڵی خەلافەتی ئادەمیزادو بەرپرسیێتی لەبەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندنی کاروباری بوونەوەرو ئاوەدانکردنەوەیدا پێویستی دەکات لەسەر عەقڵی موسڵمان کەدەرك بەلۆژیکی براوتنی ئەم بوونەوەریانەو ڕێسای کارگوزارێتی یەکەیان بکات تاکوو بتوانێت ئەرکی بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی و ڕام هێنانیان بگرێتە ئەستۆ بەپێی ئامانجەکانی بەدیهێنانی خەلایق و پێداویستیەکانی جیهادو خەلافەت.

تاریکی و لێڵی دیدو تێ گەیین سەبارەت بەچەمکی(ئامانج گەرایی و سەبەبیەت) بووە هۆی چەوتی و تێکچوون لەلێکدانەوەی چەمکی تەوەککول و باوەڕ بەقەزاو قەدەر داو عەقڵی موسڵمانیشی بەرەو حاڵەتی سەرگەردانی و پشێوی و چۆك دادان و خاوبوونەوە بردو تووشی دەردی پاڵ لێ دانەوەو بێ چارەیی و دەستەوسانی و چاوبڕینە غەیری موسڵمانی کرد، و ووزەو تواناو ڕۆڵە چاکخوازییە ژیارییەکانیشی لەناوبرد.

ئەگەر لەواتاو مەدلولی چەمکی(ئامانج گەرایی) تێ بگەین بەشێوەیەکی تەواو ڕاست ئەو کاتە دەزانین کە ئەو چەمکە بنچینەیەکی پتەوو قەڵایەکی بەهێزە کە جێی هیچ شکڵ و شێوەیەکی پاڵ دانەوەو ناهەموارێتی و چۆك دادانی تیا

نابێتـەوە، بـەڵکو پـاڵ بـەدەروونی موسـڵمانو مرۆڤـی موسـڵمانەوە دەنێـت بـەرەو هیدنییـەت لەکۆشش‌و گـەڕان بـەدوای زانسـتدا، هـەروەها بـەرەو هـەوڵدان لـەپێناوی پەیوەندییـەکانی مـرۆڤ بـەژیان‌و بوونـەوەرو ڕووداوەکانـەوە وەك کۆششـێك بـۆ بەدیـهێنانی ئامـانج‌و ئاتاکـانی ئـەو پەیوەندییـە بـەپێی سسـتمی خـەلق‌و ڕێسـاکانی فیطـرەی ژیـان‌و لۆژیکی بزاوتەکـەی.

﴿ ولم يكن له شريك فى الملك وخلق كل شيء فقـدره تقديـرا ﴾ الفرقـان:٢.

﴿ صنع الله الذى اتقن كل شيء انه خبير بما تعملـون ﴾ النمـل: ٨٨.

ب ـ بابەت گەرایی حەقیقەت‌و پێگە ڕێژەیی لەو بابەتیەدا:

چـەمکی بابـەت گـەرایی حەقیقـەت بەسـەر عـەقڵی موسـڵماندا سـەپاوە بـەهۆی فیطرەتـە بینشـیەکەیەوە وەك بـەدی هێـنراوێکی کـاتی کـە هاتوەتـە ڕوو لەبوونـەوەرێکی کـاتی‌دا کـە ئـەویش هـەر ڕووداوەو بـەدی هـاتووەو لـەڕێی سسـتمێکی فراوانـی تونـدو تۆڵـەوە ڕێـك خـراوە. سسـتمی بوونـەوەرو ژیـانیش حەقیقەتێکـە مـرۆڤ بەهۆی فیطرەتـە کەیەوە هەسـتی پـێ دەکـات‌و لەگـەڵیدا دەژی‌و مل کەچـە بۆی‌و لەگەڵی ئاوێتـە دەبێت لەهـەموو ساتەکانی وجودیـدا، سـنورداریتی‌و کەرتـە بەشـێتی‌و مرۆڤیـش ڕای دێنـن. کـەدەرك بـەبوونی بوونـەوەرو چـەمکی سسـتمەکەی بکـات. هـەروەها دەرك بەچـەند ڕووکـارێکی ئـەم سسـتمەو حەقیقەتـەکانی بوونـی‌و پێـك هـاتنی بکـات بـەڵام لەهـەمان کـاتدا نـاتوانێت پـەی بەهـەموو بـوون‌و سسـتم‌و ئامـانج‌و مەبەسـت لەبزاوتنەکـەی بـەرێت‌و هـەرواش دەمێنێتـەوە.

عـەقڵ‌و وشـیاری‌و فیطـرەی موسـڵمان لـەڕێی پێگەیشـتنەکانیانەوە بەئەسـڵی بـوون‌و بـەدی هێنـەرو پێکهێنەرەکـەی‌و، وەسـتانی لەبـەردەم حەقیقـەتی ژیـان‌و بوونەوەردا، دەبێت مامەڵە لەگـەڵ ژیاندا بکـەن‌و پشـتی تـێ نەکـەن‌و دەرکـی لەسـەر دانەخـەن‌و قەبوڵیشـی بکـەن. ئەمـەش بـەپێی ئـەوەی دەسـتیان کـەوتووە لـەدیدو بۆچوونێکی هەموایەتی یەوە، کـە چاوگەکـەی عیلـم‌و هیدایـەتی ڕەببانی‌یـە. بەمـەش عـەقڵی موسڵمان دەرك بـەئامانج‌و مەبەستی ژیان‌و بوونی مرۆیـی دەکـات.

عـەقڵ‌و فیطـرەی موسـڵمان بـەهۆی ڕۆشـنایی‌و نـوری سـروش‌و ڕێنماییەکەیـەوە بیینـاو چـاوکراوەن، بۆیـە حەقیقـەت لای ئـەو عەقڵـە حەقیقـەتێکی بابەتیانەیـەو پایـەدارەو دەرك بـەبوون‌و ڕەهـەندەکانی دەکـات‌و کۆشـش بـۆ ئاوێتـە بوونێکـی

پوخت و دروست لەگەڵ حەقیقەتەکەو ڕێساو سوننەتەکانی دەکات، بەمەش عەقڵی موسڵمان بەشێوەیەکی تەواو بابەتیانەیەو هەواو خواستە دەروونیو شەهەواتەکان نایبەن بەرێدا، کاری پیرۆز داینەمۆی ژیانی، کۆششی بۆ بەرجەستەبوونی حەق و حەقیقەتە بەگرنجاندن و پێوەگرێدانێکی هەموارانە لەگەڵ سستمی بوونەوەرو ڕێسای فیطرەو بزاوتەکەی.

راتاو چەمکی ژیان و سەرکەوتن لای عەقڵی موسڵمان لەبەرەڵلایەتی و تێک چوونی سستم و دۆخی ژیاندا نییە، بەڵکو لەتۆکمەیی و هەستێکی دروست و هاوسەنگی و گونجاوییەکی پاکدایە لەگەڵ حەق و حەقیقەتدا لەسستمی ژیاندا.

هیچ دژایەتیەک لای عەقڵ و سستمی موسڵماندا نییە لەنێوان ئەوەی حەققەو ئەوەی بەرژەوەندی هەموو لایەن و ڕووکارەکانی بوونی مرۆیی تیایە ئایا تاکەکان بن یان کۆمەڵ. هیچ لەت بوون و لێکبڕانێکیش لەعەقڵی موسڵماندا نییە لەنێوان ماددەو مانادا، لەنێوان دونیاو ڕۆژی دوایی‌دا، بەڵکو ئەمانە هەموو پارچەو کەرەستەکانی حەقیقەتن لەبوونداو لەگەڵی گونجاو و تەواوکارن.

بەم واتاو چەمکو بۆ چوونە تێرو تەواوە موسڵمان جێی شیاوی خۆی لەسەر پەرشتی و بەرپرسی‌دا پڕدەکاتەوە لەکردارو ئەو دەورانەی دەیانگێڕێ، نکۆڵی لەئامۆژگاری ناکات بۆ دەوروبەری، بەڕاوێژو شوێن کەوتنی حەق و حەقیقەت و دادخوازی کاروباری خۆی بەڕێوەدەبات. (فکلکم راع * وكلكم مسؤول عن رعيته)(١) (المؤمنون تتكافأ دماؤهم * وهم يد على من سواهم * ويسعى بذمتهم أدناهم)(٢) وە موسڵمان ئەرکی ئامۆژگاری لەسەرە وەك لەم فەرمودەیەدا هاتووە (الدين النصيحة) ثلاثا، قلنا: لمن؟ قال: (لله ولكتابه ولرسوله ولائمة المسلمين وعامتهم)(٣) وەکاری موسڵمانان دەبێت لەسەر بنەمای ڕاوێژکاری بێت لەنێوانیاندا ﴿ وأمرهم شورى بينهم ﴾ نەك دەمارگیری یان قەومییەت یان حیزبایەتی یان تیرەگەری بەهەموو ئەو واتایانەی ئەمڕۆ دەیگرنەوە لەجیاکردنەوەو ستەم و لەسنور دەرچوون و هەواو فەساد.

---

(١) رواه الشيخان.

(٢) رواه ابو داود والنسائي.

(٣) رواه المسلم.

ئەگەر لای عەقڵی موسڵمان حەقیقەت بریتی بێت لەمەسەلەیەکی بابەتیانە ئەمە بیر تەسکی ئاسۆ ناگەیەنێت، حەقیقەتیش هەرچەندە یەك ناوەڕۆکی هەیەو نەگۆڕە بەڵام پێگەی مرۆڤ چ تاك یان کۆمەڵ لەبەرانبەر ڕێژە گەراییە لەڕوانگەو دیدو پێگەو بەجێهێناندا، چونکە عەقڵی موسڵمان لەڕوانگەی پێگە ئادەمییەکانەوە مامەڵە لەگەڵ حەقیقەتدا دەکات چ وەك تاکەکان یان کۆمەڵان، بۆیە مامەڵەو پرۆگرامەکان بەپێی پێگەو پێداویستیەکان جیاوازدەبن، بەم پێیە مامەڵەو پرۆگرامی منداڵ وەك مرۆڤێکی پێگەیو نییە، ئەوان وەك لێکەوتە نییە، زانا وەك نەزان نییە، پێگەی پەروەردە لەپێگەی دادوەری جیایە، پێگە لەکاتی ئاشتیدا جیایە لەپێگەی زەمانی جەنگ، پێگەی هەژانیو دەست کەوتن وەك پێگەی کاتی گرانیو نەبوونی نین، لەبەر ئەمانە هەرچەندە لەعەقڵی موسڵماندا یەکبوونو هەمواییەتی بەرجەستە بوویێت بەهەمان شێوە فرەییەتیو جیاوازیش بەپێی پێویستو کاتو شوێن جێی بوەتەوە، بەبێ ئەوەی بنەماو دەلیل وون بکات.

لە دەرچەی ویستی مرۆییو ڕێژەگەرایی لەپێگەو موقع دا لەبەرانبەر حەقیقەتدا، لەعەقڵی موسڵماندا فراوانیەكو چاوپۆشیەك بەدی دەکرێت کە سەربەستی بیروباوەڕو فیکرو فرەیی هەڵوێستە فیکریو عەقیدەییەکانو شێوەی بەجێ هێنانو جیاوازیەکانیانی تیا پارێزراوو بەرجەستەیە.

ئەم فرەییو جیاوازیو جۆر بەجۆریە لەقەوارەی بوونە ئیسلامییەکەدا هیچ مەترسییەکی لێناکەوێتەوەو لەگەڵ هیچ بنەماو بنچینەیەکدا تێك ناگیرێت؛ بەڵکو بوارێکە بۆ هاوکێشەییو دەلاقەیەکە بۆ گەشەسەندنو ئارامی، چونکە عەقڵو فکری موسڵمان بەپێی ئەودیدە ڕۆشنەی کە لەڕێنماییەکانی سروشو بەهاو چەمكو دەرچەکانیەوە سەرچاوەی گرتووە بە بەهێزیو زاڵیەوە دەمێنێتەوە بەشێوەیەك نەتەوەو جەماوەرەکەشی لەسەر ئەو بنەما بنچینەییانەی کۆکنو کۆدەبنەوە، ئیتر ئەو جێگە فرەو جۆر بەجۆرو دژانە دەبنە ئامێری بزاوتنو گەشەکردنو داهێنانو نوێ خوازی.

بالادەستی سستمی ئیسلامیو دەوڵەتی ئیسلامو بۆچوونو مەبەستەکانی هیچ مەترسییەك بۆسەر سەربەستیو ئازادی فیکرو بیروباوەڕ دروست ناکەن بەڵکو بەپێچەوانەوە زامنو پاڵپشتن بۆ سەربەستی فیکرو بیروباوەڕ، هەروەهاش

سەربەستی لەفیکرو بیروبارەڕدا مەترسی نین بۆسەر سستەمو دیدی ئیسلامی، چونکە ئیسلام لەڕووناکی زانستی هیدایەتی خوایی‌و وەلام دانەوەشی بۆ فیطرەی پاکی مرۆیی‌یەوە بەهرەمەندەو نیگای وەرگرتووەو بووەتە نوێنەری حەقیقەتی بابەتیانە لەژیان‌و بووندا، کە ئەم حەقیقەتەش هەر دەمێنێتەوەو پەل دەهاوێژێ‌و مرۆڤەکان خۆ دەهاوێژنە ژێر سێبەری‌و لەکانیاوەکانی هەڵ دەگۆزن.

نمونەی فیکرو ئازادی فیکر لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا وەك ڕووبارێکی قووڵ هەڵ دەقووڵێت. چەند قووڵ تر بێت ئەوەندە بەهێزدەبێت، هەڵقوڵانیشی لەو ناخە قووڵەوە بەرەو ئامانج‌و ڕێگاکەی جوانترو دڵڕفێنتری دەکات.

ڕوانگەو دیدی ئیسلامی هەموو کاتێك دڵنیاو بەمتمانەیە لەوزەو زاڵیەتی خۆی بەهۆی جۆشخواردنی بەحەقیقەتی سروش‌و چاوگەکانی فیطرەی پاك‌و پوختەوە، نەك پشت بەستن بەدەوڵەت‌و هێزیەوە. وەتا لەسەر ئەو پرۆگرامە ڕاستەشی بەردەوام بێت پاکی لەجۆراو جۆری‌و نەیاری نی‌یە، بەڵکو ئەوانە دەبنە هۆی چالاك بوون‌و ڕازاندنەوەو گەشەسەندنی زیاتری.

بەم شێوەیەش تا باشترو جوانترو زیاتر لەئیسلام بگەین‌و نمایشی بکەین‌و پیادەی بکەین زیاتر گەشاوەو پەرە دەسێنێت.

قین‌و ستەم‌و ناهەمواریش نابنە بەرگری لێ‌و نابنە هۆی زیاتر تێگەیشتنی بەڵکو ئەوە بەدەست درێژی بۆ سەر ناوەڕۆك‌و حەقیقەت‌و ئامانجەکانی ئیسلام مەزەندە دەکرێ.

﴿ لا اكراه فى الدين قد تبين الرشد من الغـــي ﴾ البقــرة: ٢٥٦.

﴿ فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفــر ﴾ الكــهف: ٢٩.

﴿ ولو شاء ربك لجعل الناس امة واحـــدة ﴾ هــود: ١١٨.

﴿ أفانت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنـــين ﴾ يونــس: ٩٩.

﴿ من عمل صالحا فلنفسه ومن أساء فعليها ثم الى ربكـــم ترجعــون ﴾ الجاثيــة:١٥.

﴿ فألهمها فجورها وتقواها * قد أفلح من زكاهــــا * وقــد خــاب مــن دســاها﴾ الشــمس:٨ ــ ١٠

﴿ وبالحق أنزلناه وبالحق نزل وما أرسلناك إلاّ مبشــرا ونذيــراً ﴾ الاســراء:١٠٥.

﴿ولقد جئناهم بكتاب فصلناه على علم هدى ورحمة لقــوم يؤمنــون﴾ الاعــراف:٥٢.

﴿ إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحــافظون ﴾ الحجــر: ٩.

ج. سەربەستی لەبڕیارو ویستدا:

ئەمەش سێیەم چەمکی سەرەکی‌یە کە پایەکانی عەقڵییەتو پرۆگرامکەرایەتی ئیسلامییان لەسەر بینا دەکرێت، ئەمە چەمکی سەربەستی‌و بەرپرسیەتی لەویستو بڕیاری مرۆییانەدا.و تاکوو لەچەمکی ئازادی‌و سەربەستی لەویستی مرۆیی‌و بەرپرسی تاك تاکی ئادەمیزاد لەو سەربەستی‌و ئازادیە نەگەین‌و دەرکی نەکەین ناتوانین لەپەیامی ئیسلام بۆ ژیانی ئادەمیزادو واتاکەی‌و مانای ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)و جیهادو جەنگەکانی‌و هەروەها مل ملانێی نێوان موسڵمانانی سەرەتای ئیسلامو ئیمبراتوریەتەکانی ڕۆمو فارس تێ بگەین‌و حاڵی ببین.

ناوەڕۆکی ژیانی ئەم دونیایە لەپەیامی ئیسلامدا بریتی‌یە لەتاقی کردنەوەی تواناو ویستی مرۆڤ لەخەلافەتەکەی‌دا بۆ سەرزەوی. چۆنیەتی ئەم خەلافەتەشی لەبەکاربردن‌و ممارەسەی ئەم ویستەیدا بەدی دەکرێت. کە ئایا ئەو ویستەی ویستێکی خێرەو کۆشش بۆ حەق‌و خێرو داد دەکات، یان ویستێکی گەندەڵەو لووت بەرزە لەئاستی خێرو حەق‌و داد دا،و کۆشش دەکات بۆ فەسادو زیادە ڕەوی لەزەویدا بەپێی هەوای دەروونی.

ژیانی ڕۆژی دواییش لەپەیامی ئیسلامدا بریتی‌یە لەدەرەنجامی شوێنەوارەکانی ئەو ویستەو چۆنیەتی ممارەسەو بەکاربردنی لەژیانی دونیادا ئەویش هەتا هەتایی‌یەو خێر ئەنجامی خێردەبێت لەوێ‌و ناسازی‌و شەڕیش وەك خۆی دەبێت‌و بەدبەختی هەتا هەتایی بەدواوە دەبێت.

فیطرەی مرۆیی دەرك بەکرۆکی ئەو سەربەستیە دەکات لەویستی مرۆییدا کە لەهەموایەتییە ڕەببانیەکاندا بۆ خەلق‌و ووجود بەرجەستەکراوەو پەیامی خوایی بڕیاری لەسەر داوەو پەردەی لەسەر لاداوە.

﴿ ونفس وما سواها * فالهمها فجورها وتقواها * قد أفلح من زكاها * وقد خاب من دساها ﴾ الشمس: ٧-١٠.

﴿ ولله مافى السموات وما فى الارض ليجزي الذين أساءوا بما عملوا ويجزي الذين احسنوا بالحسنى ﴾ النجم: ٣١.

﴿ وخلق الله السموات والارض بالحق ولتجزى كل نفس بما كسبت وهم لايظلمون ﴾ الجاثية: ٢٢.

﴿ ويستخلفكم فى الارض فينظر كيف تعملون ﴾ الاعراف: ١٢٩.

﴿ قل يا أيها الناس قد جاءكم الحق من ربكم فمن اهتدى فانما يهتدي لنفسه ومن ضل فانما يضل عليها ﴾ يونس: ١٠٨.

﴿ صنع الله الذى أتقن كل شيء ﴾ النمل: ٨٨.

﴿ ألا له الخلق والامر ﴾ الاعراف: ٥٤.

چەمكی سەربەستی لەبڕیارو ویستی مرۆییدا چەند لایەن و ڕەهەندێكی هەیە كەبەبێ تێگەیشتن لەو ڕەهەندو ڕووكارانەو جیاكردنەوەیان لەیەكدی ناتوانین واتای ئەو سەربەستییە بەتەواوی بدەین بەدەستەوە.

ئەم لایەنانەش لەم سێ ڕەهەندەدا خۆ دەبیننەوە: ڕەهەندی سەربەستی لەعەقیدەدا * ڕەهەندی سەربەستی لەفكردا * ڕەهەندی سەربەستی لەبەجێ هێنانی كۆمەڵایەتیدا.

## یەكەم - ڕەهەندی سەربەستی لەعەقیدەدا:

ئیسلام بێپەردەو بەشێوەیەكی یەكلایی كەرەوەو بەو پەڕی تواناییەوە بڕیاری لەسەر ڕەهەندی سەربەستی عەقیدەو ویستی مرۆڤ داوە، هەر بۆیەش سەربەستی لەبیروباوەڕدا بوەتە بنچینەی بانگەشەو ڕێكخستنەكانی، لەمەبەستیشی لەجەنگە گەورەكانیدا دژی هێزە سەركەش و ستەم كارەكان، و لەدەرچەی چەمكی سەربەستی بیروباوەڕەوە ئەوە بەدی دەكەین كە هەر ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلام بوون سەربەستی بیروباوەڕی نا موسڵمانەكانی ژێردەستی خۆیان زامن دەكردو دەپاراست، وە لەدەرچەی چەمكی هەمان سەربەستییەوە لەئیسلامدا لەماناى پەیام و نامەكانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەلیك و سەران و ئەمیرەكان دەگەین كەداوای لێدەكردن موسڵمان ببن و دەست هەڵگرن لەسەر كەشی و ستەم و چەوساندنەوەی ژێر دەستەكانیان تا بەكەرامەتی سەربەستی لەعەقیدەو باوەڕیاندا شادبن. هەر لەدەرچەی مافی مرۆڤەوە بۆ هەڵبژاردن و مومارەسەی عەقیدە بەسەربەستانەوەبوو كەسوپای هاوەڵان لەسەرەتای ئیسلامەوە بەوپەڕی ئیمان و لێبڕانەوە بەرەنگار دەبوونەوە لەگەڵ هێزی قین و سەركەشیدا بۆ بەرگری كردن لەمافەكانی مرۆڤ سەبارەت بەئازادیی بیروڕای و هەستانی بە بەجێ هێنانی كاری بەرپرسیتی سەرشانی، هەروەها بۆ ڕەت كردنەوەی دەست درێژی ستەم كاران كە ئازادیی خەڵكیان لەهەڵبژاردنی

بیروباوەڕدا زەوت کردبوو.

لەئیسلامدا مرۆڤەکان ئازادو سەربەستن لەهەڵبژاردنی جۆری ئەو عەقیدەیەی باوەڕیان پێ یەتی، جا ئیسلامە یاغەیری ئیسلام؟ ئەوە هەر خۆیان سەر پشکن‌و لێشی بەرپرسن، لەسەر ئیسلام‌و دەوڵەتی ئیسلامی‌و کۆمەڵگەکەشی پێویستە ئەو مافەیان بپارێزن‌و ڕێز لەو بڕیارەیان بگرن کەبتوانن پێی هەستن لەسەر زەوی ئیسلامداو بەڵکو لەهەموو زەوی‌داو بۆ هەموو مرۆڤەکان.

وە لەبەر ئەوەی سەربەستی: مافەو هەڵوێستەو بەرپرسی، وە ناکرێ مومارەسەبکرێ لەدۆخێکی بێ سەروبەرو پشێویداو بەگاڵتەجاڕی ناگیرێ، پێویستە لەمەرجەکانی ئەهلییەتی بەکاربردنی مافەکانی ئەو سەربەستیە لەڕەهەندەکەیدا تێ بگەین. وە سەربەستیش زیاتر لەهەر کارێکی تر پێویستی بەکۆنترۆڵ‌و ڕێکخستن هەیە چونکە گرنگترین شوێنەواری لەژیان‌و واتای بوونی مرۆڤدا هەیە. بۆیە پێویستە چاك لەمەرجەکانی شیاوێتی‌ی بۆ مومارەسەو بەجێ هێنان لەکۆمەڵگەدا بگەین. سەربەستی لەویست‌و بڕیاردا بەگشتی‌و سەربەستی لەعەقیدەدا بەتایبەتی مافی هەر تاکێکن کە دارای تواناکانی دەرك کردن‌و پێگەیین‌و کامڵ بوونی مرۆییانەبێت بەو مانایەی لەواتاو شوێنەوارو سنوری بەکاربردنی ئەو سەربەستیە بگات لەژیان‌و بوونی خۆی‌و کۆمەڵگەکەیدا. بەم پێیە سەربەستی مافی کەسی بالغ‌و عاقڵە، منداڵ‌و نەفامیش نابێت ڕێزیان پێشێل بکرێت‌و کەم‌و کوڕییان بقۆزرێتەوەو گاڵتە بەویستەکانیان بکرێت‌و دەست درێژی بکرێتە سەر ئەرکی ویصایەی سەرپەرشت‌و پەروەرشکارانیان‌و دەستی تێ وەربدرێت، تاکوو دەگەنە ئاستی شیاوی مومارەسەی سەربەستی‌و هەڵگرتنی بەرپرسێتی یەکەی بەگەورە بوونی تەمەن یاچاك بوونەوەی نەخۆشی عەقڵیی نەفامەکە. هەروەها پێگەیشتن‌و کامڵ بوون لەڕووی ژیاری‌و شارستانیشەوە ئەکرێ ببێتە مەرجێکی پێویستی شیاو بوونی مرۆڤ بۆ مومارەسەی ماف لە سەربەستی‌دا بەتایبەتی سەربەستی عەقیدە، چونکە بارودۆخی سەرەتاییەتی ژیاریی‌یان‌و دواکەوتوویی ژیاری لەهەندێ سەردەمی چۆڵ نشینی‌و شێوەی بیابان نشیندا مرۆڤیان دەگەیاندە حاڵەتێکی پڕ لەکەم‌و کوڕی شارستانی‌و کۆمەڵایەتی‌و زیهنی وا کە نەتوانێت بڕیاری مرۆییانەی شیاو وەرگرێت‌و شیاوێتی بۆ سەربەستی نەبێت، بەڵکو پێویستی بەسەر پەرشتیەکی ئەوتۆ ئەبوو کەئامادەی بکات بۆ ئەو

بەرپرسـیە، ئەمـەش ئیسـلام پـێی هەسـتا هـەر لەسـەرەتای سـەرهەڵدانیەوە سەبارەت بەتیرەو هۆزە عەرەبەکانی بیابان کەزۆر سـەرەتایی و بت پەرست بوون، بـەوەی کەهـەموو شـێوازێکی لەگـەڵیاندا گرتەبـەر بـە مەبەسـتی ڕزگارکردنیـان لەمومارەسـاتە سـەرەتایی و بـێ ئامانجـەکانیان و لەکـەم و کـوڕی و دواکـەوتویی یـان لەڕووی ژیاری کۆمەڵایەتی یەوە. ئیسـلام لـەڕووی بەرپرسـیەوە هـەوڵی ئـەوەی دەدا کەئەو هـۆزە چـۆڵ پەرسـتە هەمەجیانـە مـل کـەچی سسـتمە ژیـاری یەکـەی خـۆی بکـات بەمەبەسـتی ڕزگارکردنیـان لـەو هەمەجیـەت و خورافـات و پڕوپوچیانـەی بـت پەرسـتێتی.

هـەر بۆیـە ڕاشـکاوانە ئـەوەی ڕاگـەیاند کـە مەسـەلەی مـل پـێ کـەچکردنی ئـەم هۆزانـە مەسـەلەی سەربەسـتی ویسـتی مرۆیـی عـەقیدەیی نیـە بـەڵکو مەسـەلەی سـەرپێدانەواندنیانە بـۆ سسـتمی ئیسـلام لـەپێناوی ڕزگارکردنیـان لـەو هەمەجیـەت و بێسـەرو بەرییـە کۆمەڵایەتیـەی تیـایدا دەژیـن.

﴿ الذين عاهدت منهم ثم ينقضـون عـهدهم فى كـل مـرة وهـم لا يتقـون ﴾ الانفـال: ٥٦.

﴿ لا يرقبون فى مؤمن إلاً ولا ذمة واولئك هـم المعتـدون ﴾ التوبـة: ١٠.

﴿ ياايها الذين آمنوا إنما المشركون نجس فلا يقربوا المسـجد الحـرام بعـد عامـهم هذا ﴾ التوبـة: ٢٨.

﴿ وقاتلوا المشركين كافة كما يقـاتلونكم كافـة واعلمـوا ان الله مـع المتقـين﴾ التوبـة: ٣٦.

﴿ وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكـون الديـن كلـه لله فـان انتـهوا فـان الله بما يعملون بصير ﴾ الانفـال: ٣٩.

﴿ قالت الاعراب آمنّا قل لم تؤمنوا ولكن قولـوا اسـلمنا ولـما يدخـل الايمـان فى قلوبكـم وان تطيعوا الله ورسوله لايلتكم من اعمالكم شيئا ان الله غفـور رحيـم ﴾ الحجـرات: ١٤.

هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە(ئەعراب)ی بیابان نشینی بت پەرستی سەرەتایی هەڵوێستێکی سەرپەرشتیانەو شیاوکردنە لەڕووی ژیاری و کۆمەڵایەتیەوە نەك هەڵوێستی نکوڵی کردنی سەربەستی شیاوی مرۆییدا، یان پاشەکشێ کردن لەهەڵوێستی سەرەکی خۆی سەبارەت بە سەربەستی ئادەمیزاد لەڕووی عەقیدەوە.

ئەم بنەمایەش لەهەڵوێستی ئیسلامدا ئاشکراو ڕوونە لەهەڵوێستو مامەڵەیدا بەرانبەر ئەهلی کیتاب کە لەژێر سایەی ئیسلامدا عەقیدەیان ئازادو مافیان پارێزراو بوو لەگەڵ هەموو ئەو فێڵو دوژمنکاریانەی کە بەرانبەر موسڵمانان دەیانکرد، هەروەها ئیسلام ئەو مافەشی لەچەند دەقێکدا بەڕاشکاوانە بۆ غەیری ئەوانیش لەئەهلی ژیارەکانی فارسو مەجوس کەشیاو بوون بۆ هەڵبژاردن ڕاگەیاند لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە بت پەرستو موشریکو ئاگرپەرست بوون. ئەمە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە بێ هیچ ئەو مژێک کە سەربەستی لەعەقیدەدا چەمکێکی سەرەکی ئیسلامی یە لەپێکهێنانو دارشتنی عەقڵییەتو مەنهەجییەتی ژیاری ئیسلامیدا، عەقڵو مەنهەجی موسڵمان دامەزراوو ڕاوەستاو نابن تاکوو واتای ئەو ڕەهەندەش لەدارشتنو پێکهێنانیاندا بەرجەستە نەبێت.

**دووەم ـ ڕەهەندی سەربەستی لەفکردا :**

ئەم ڕەهەندە تەواوکەری ڕەهەندی سەربەستی عەقیدەیە بەڵکو هەر لەویش کەوتۆتەوە،و وابەستەیە بەسەربەستی ویستی مرۆییانەو ئەخلاقییەت لەبڕیاری مرۆییدا، بەلام لەچوار چێوەی پابەندێتی گشت گیرانە بەعەقیدەوە. ئەوکەسەی پابەندە بە بۆچوونێکی گشتی دیاری کراوی عەقیدەییەوە ڕوو بەڕووی کۆمەڵێك هەڵوێستو بڕیار دەبێتەوە کە کۆتاییان نایەت لەم چوار چێوەیەدا لەتێگەیشتنی دۆزەکانی ئەم بۆچوونەدا. ئیسلام ویستی مرۆییانە ڕزگاردەکات لەچەوساندنەوەی کاهینییەتو قەشەیەتیو سەرکەشیەکانیو سەربەستی لەقەناعەتو بڕیاردا بۆ دابین دەکات.

لەکۆمەڵگای پابەند بەئیسلامدا بواری سەپاندنی قەناعەتی ناخو ڕەوشتی کەسێك بەسەر دەروونی کەسانی تردانیە مەگەر بەپێی پرۆگرامێك کە بەرانبەرەکە پێی قایل بێتو قەبوڵی بکات بە ویستێکی ئازادو سەربەستەوە، ئەم جۆرە سەپاندنە لەبنەماکانی فیطرەی مرۆیی پاکەوە دوورە هەروەك لەئامانجە بەسەندە مرۆییەکانیشەوە هەر دوورەو ئیسلامیش بەپرۆگرامی نازانێ نە لەژیانی مرۆییدا نە لەکۆمەڵگەی ئیسلامیو ئینسانیدا. بۆیە لەپرۆگرامو عەقڵییەتی ئیسلامیدا ئەوە تۆمار دەکرێت کەویستی ئازادو سەربەستانەی مرۆڤ بەرپرسە لەدوا بڕیاری ئەو مرۆڤەو تەنها ئەو ویستەیە لەدونیاو دوارۆژیشدا لەبەرو بوومی ئەو هەڵوێستە دەچنێو کۆدەکاتەوە. سەربەستی لەفیکریشدا مانای هەڵەشەییو

نەفامیو سەر پێ یەتیو بێئامانجی نیە لەبریارداندا،و عەقڵو پرۆگرامی موسڵمان دەبێ جیددیو بەرپرسبن، ئامانجو جددییەتو بەرپرسیێتیش گەڵاڵە نابن تاکوو مەرجەکانی بریاردان کەبریتین لەزانستو لێکۆڵینەوەو تێ ڕامان بەکۆششی مرۆییەوە دیارنەبن، لەهەموو بارێکیشدا بریاری ئیرادەی مرۆڤ وابەستەیە بە قەناعەتە رەوشتێتییەکەی مرۆڤە تاکەکەوە بەتەنها وە زۆر لێکردنو ناچارکردن هیچ رۆڵێکیان نییە لەبەرانبەر ئیرادەوە:

﴿ وأن ليس للانسان إلاّ ماسعى ﴾ النجم: ٣٩.

﴿ ومن ضل فانما يضل عليها ولا تزر وازرة وزر اخرى ﴾ الاسراء: ١٥.

سەربەستی لەفیکرداو قەناعەتی فیکری مافنو هەڵوێستێکی بنەرەتییە پێویستن بۆ بەدیهێنانی مانا لەبوونی مرۆییو چوونە ژێر باری بەرپرسیێتی خەلافەت لەسەر زەویدا،و هەر زۆر کردنێك لەفکری مرۆڤو قەناعەتە ویژدانیەکەی فاکتەرێکە بۆ لەناوبردنو سرینەوەی مانای ژیانو بەرپرسیێتیەکەی،کە پرۆگرامی ئادەمیزادی قەبوڵی ناکات، وەعەقڵی موسڵمانیش پایەدار نابێت تەنها لەسەر بناغەی دابین بوونی مافی مرۆڤ نەبێت لەرووی سەربەستی عەقیدەو فکرو جێ بەجێ کردنی ئەوماڤەوە.

هەزری موسڵمان لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا هزرێکی سەربەستو داهێنەرە، بەخششەکانی جۆراو جۆرو تەواوکارن، بەڵام لەکۆتاییدا رێرەوو دەرچەو داهێنانەکەی پەیوەست دەبێتەوە بەو ئامانجەوە کە لەبوارەکانی چاکسازیو ئاوەدانکاریو تێك نەداندا وجودی مرۆڤی لەسەر بەندە بەپێی بنەماکانی عەقیدەو مەبەستە سەرەکی یەکانیو بنچینەکانی دیدی ئیسلامی لەلایەکەوەو، پێداویستو زەرووراتی سستمی کۆمەلایەتی لەلایەکی ترەوە.

جا ئەگەر هاتوو سەربەستی لەعەقیدەو دیدی بنچینەیی هەموایەتیدا دۆزێك بێت لەلایەنی موتڵەقو هەموایەتی خۆی هەبێ، ئەوا سەربەستی لەفکردا هەر لەبناغەکەوە رەنگ دانەوەیە بۆ رووانگەو دیدگەی هەموایەتی لەعەقیدەدا سەبارەت بەواقعی ژیانو دۆزەکانی، هەروەها هەڵوێست وەرگرتنە لەئاستی دۆزەکانی عەقیدەو شێوازی مامەڵە لەگەڵ کردنیاندا. هەڵسو کەوتی کۆمەلایەتی ئادەمیزادیش کاتێك دەبێتە کردارو مومارەسەو لەحاڵەتی تویریو ئەگەر دانابێت پەیوەستو بەندە لەسەر سەربەستی عەقیدەو فکر.

زۆر گرنگە کەلایەنی کرداریی لەمەسەلەی سەربەستی یەکاندا بزانرێت. چونکە بەتەنها لایەنی تیۆریی و فەلسەفی بەس نی یەو لێکدانەوەی تەواوی بۆ واقعی مومارەسەی کۆمەڵایەتی نی یە. واقعی مومارەسەی کۆمەڵایەتی بۆ سەربەستی یەکان و پاراستنی مافی تاکەکان تەنها پشت بە بنەما تیۆرییەکان نابەستن بەڵکو مل کەچی ئیعتیبارە واقیعییەکان و دەرچە تیۆری و فەلسەفیەکان چەندە سەلیم بن و، فکری نەتەوەش چەندە ساغ و بێ دەردبێت، ئەوا بەو پێ یەش ئوممەو دام و دەزگاکانیش توانای چاوپۆشی و ڕەخساندنیان زیاتر دەبێت بۆ تاک و گرۆکان لەڕووی پیادەکردنی مافەکانیان لەبواری سەربەستی و ئازادی فکرو عەقیدەدا.

وە چەندەش کۆسپ لەبەردەم کاروانی ئوممەو فکری بنکە بنچینەییەکانی و مومارەساتە ژیاریەکانیدا هەبێت، ئەوەندە مەیلی کەم دەبێتەوە بۆ چاوپۆشی و بوار ڕەخساندن بۆ فکری نەیارو جیاخواز لەدەربڕیندا.

لاوازی توند ڕەوی زیاتر لێ دەکەوێتەوە. هێزیش ــ بە پاشینەیەکی بێ گەردی فەلسەفیەوە ــ چاوپۆشی و بوار ڕەخساندنی بۆ فرەیی زیاتر لێ دەکەوێتەوە. جا ئەگەر مەترسییەکانی داگیرکاری فیکری و پیلانە زاڵ خوازی یە ئیستیعمارییەکان بخەینە سەر بابەتەکە ئەوا ئەگەرو بوارەکانی لێ حاڵی بوون لاوازتر دەبن و پێویستیمان زیاتر بەدانایی و نەفس درێژی و دان بەخۆدا گرتن دەبێت.

### سێهەم ـ ڕەهەندی سەربەستی لە بەجێهێنانی کۆمەڵایەتیدا :

ئەم ڕەهەندەی نێو ڕەهەندەکانی بزاوتی بوون و وجودە مرۆڤی یەکان پەیوەندی بەلایەنی کرداریییەوە هەیە لەم بوونەدا.

واتە بەکۆی کردەوەو ئاکارو هەڵس و کەوت و ئاڵ و گۆڕی بەرژەوەندی و پەیوەندی یەکانی نێوان تاک و کۆمەڵگەوە، چونکە هەستی تاک بەبوونە مرۆییەتیەکەی پایەدارو بەردەوام نابێت ئەگەر تێکەڵ بەکۆمەڵگەیەکی مرۆیی وانەبێت کەئاڵ و گۆڕی پەیوەندی و بەرژەوەندی یەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەو دام و دەزگاکانی لەخۆ گرتبێت.

بوونی تاک لەنێو کۆمەڵگەدا هاوڕێیە لەگەڵ کۆمەڵێك کۆت و مەرج بەسەر بزاوت و جوڵەو وە بەکاربردنە مرۆییەکانی یەوە بەپێی سروشتی بونیادی کۆمەڵگەکەو پێکهاتە جۆراو جۆرەکانی، وە بەپێی واقع و تواناکانی و ئەو ڕوو

بەرِوو بوونانەرەی یەخەی پێ دەگرن، هەروەها بەپێی پێگەی تاکە کە لەنێو کۆمەڵگەکەو ئەندامانی تریدا، ئەو کۆتو مەرجانە لەکۆتاییدا وابەستەشن بەو ئامانجە ئاوەدان کارییەی دێتە گۆڕێ لەبوونی مرۆڤو ژیانو کۆمەڵگەوەو فیطرەی بێگەرد دەی سەپێنێ. دەکرێت وادابنێین کە سەربەستی لەعەقیدەوفیکردا پەیوەستو تایبەتن بەخودی تاکەوەو هەروایشە بەلام ئاکارو کردەوەی مرۆیی سنوری تاک دەبەزێنێو دەچێتە نێو بازنەی کۆمەڵگەو دامەزراوەو داهاتو وزەکانی‌یەوە. کەواتە ئاکارو بەکاربردنی مرۆیی سروشتێکی کۆمەڵەیی هەیە، بەو مانایەی کەدەبێت بەپێی بۆچوونو لێکدانەوەیەك ئەدا بکرێت ئاوێتەو هاوکاربێت لەگەڵ کۆمەڵو بونیادو بریاری بەکۆمەڵیدا، لەبارەی چۆنایەتی ئاکارەکان لەڕووی چەندێتیو چەشنێتی‌یەوە هەروەها لەڕووی چۆنایەتی کامڵ بوونی کۆمەڵگەو ئەندامەکانیو بەدیهێنانی ئامانجەکانیان لەژیاندا سەبارەت بەئاوەدانکاریو چاکسازی. رەهەندە کۆمەڵیەکەی ئاکاری کۆمەلایەتی مانای پێ لەمل کردنو زۆر کاری نی‌یە سەبارەت بەویستی تاکەکان لەکردەوەو بەکاربردنە کۆمەلایەتی یەکانیاندا، بەلکو بەو مانایەیە کەدەبێت سەربەستی لەبەکاربردنو کردەوەو ئاکاری تاك لەنێو کۆمەڵگەدا کۆنترۆڵ بکرێت بەشێوەیەك هەڵسو کەوتو تەواو کاریو بەکارهێنانی لەلایەن تاکەکانەوە رێك بخرێت بەو پێ یەی ویستە چاکخوازیو پێویستییەکانی تاك بهێنێتەدی لەبەر رۆشنایی‌و توانا‌و دەسەلاتەکانی خۆیو کۆمەڵو ئەندامەکانی پێویستیو ئیرادەیاندا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەسەربەستی‌یەکانی تاك لەبواری عەقیدەو فکردا ناتوانێت بگوێزێتەوە بۆ بواری ئەداو ئەنجامدانی کاری کۆمەلایەتیو مەگەر لەسنوری ئامانجە چاکسازی‌یەکاندا کە کۆمەڵەی مرۆیی لەسەری بەندەو، ئەو سنور بەندیو مەرجانەی کەدەبێت لەئاکارو پەیوەندی یەکانی تاکەکاندا هەبێت.

مەبەست لەیاساو مەرج کاریو یاسا گوزاری دامەزراوەو سستمی گشتی لەکۆمەڵدا هێنانەدی ئامانجە چاکخوازیو ئاوەدانکاریەکانی کۆمەڵەکەیە، لەگەڵ دەستە بەرکردنی باشترین بوار بۆ ئەداکردن لەچوار چێوەی ئەو سنورانەدا بەپێی فکرو قەناعەتی خۆیان. سستمی گشتیو پاگیر یەکانی کۆمەڵگەش لەروانگەو بینیەی کۆمەڵەی تاکەکانەوە سەرچاوە دەگرن، ئەگەر سەربەستی لەبیروباوەرو بیرکردنەوەی تاکەکاندا بەپێی قەناعەتی ویژدانو بۆ چوونەکانی نێو

ناخیان بێت ئەوا کردارو هەڵسوکەوتیان ڕاستو دروست نابن مەگەر لەسنوری سیستمە گشتیەکەو بڕیارو پاگیریە کانداین. چونکە ڕەفتاری تاك ڕەوانە لەدەرچەی مافی سەربەستی لەفکرو قەناعەتەوە بێ گوێدانە مەرجە سنورەکانی سیستمی گشتی ئاژاوەو پشێوی لێ دەکەوێتەوە لەژیانی کۆمەڵایەتیدا، کەئەمەش حاڵەتێکە مافو سەربەستیەکان تیایدا ون دەبن،و تیایدا مانایەك بۆ بوونو ژیانی مرۆیی نامێنێت.

سەربەستی ڕەها لەبیروباوەڕدا ئەگەر گرێدراوبێت لەگەڵ پاگیریو ڕێکخستنی سەربەستی لەبەجێ هێنانو نواندنو کردەی مرۆییدا لەسنوری ئامانجە چاکخوازیو ئاوەدانکاری یەکانی کۆمەڵگەدا ڕێکخراوو گونجاو دەردەچێت لەژێر چاودێریو کۆنترۆڵی سیستمی گشتیدا، بەم شێوەیش ئەو سەربەستیە لەبیروباوەڕدا دەبێتە هێزێکی پاڵنەر بۆ بەردەوام بوونی نوێخوازیو چاکسازی لەژیاندا، نەك وزەیەك بۆ تێکدانو پشێوی لەقەوارەی کۆمەڵگەو پەیوەندیو پاڕەوی بزاوتەکەیدا.

چەندە تاك پابەندبێت بەئامانجی چاکسازیو مەرجەکانی ئەو سیستمی گشتی یەی لەویستی کۆمەڵو بڕیاری جەماوەری ئەندامەکانی کەوتۆتەوە کردەو هەڵسو کەوتو بەجێ هێنانی پەسەندو شیاو دەبن. هەروەها ئەندازەی پەسەندێتی بڕیاری جەماعەش بەپێی مەبەستی بڕیارەکەیە سەبارەت بە بەدیهێنانی فطرەی ئامانجە چاکسازیو ئاوەدانکاری یەکەی بوونی مرۆیی لەسەر زەویدا، ئەمەش لەچەمكو پەرەسەندنی ئیسلامیدا بریتییە لەبەجێ هێنانو هەستان بەئەرکی بەرپرسێتی خەلافەت لەئاوەدانکردنەوەو چاکسازی لەسەر زەویدا لەلایەن مرۆڤەوە. ئەگەر کردەی هەر تاکێك سنوری ئەو سیستمە گشتییە ببەزێنێت کە کۆمەڵ دایناوە ئەوا شیاویی خۆی لەدەست دەدات، بەهەمان شێوەش مەرجو کۆتەکانی سیستمەکە شیاویی خۆی لەدەست دەدات ئەگەر بێتو ئامانجی چاودێریو پاراستنی مافی تاکەکان نەبێت لەڕووی سەربەستی بیروباوەڕیانەوە،و سەربەستییان لەدەربڕینی ویستیان لەسنوری کۆنترۆڵکارییە پێویستەکانی سیستمەکەو، هەروەها لەڕووی دەستەبەرکردنی باشترین بوار بۆ تەعبیرکردن لەویستەکانیان لەو سنورانەدا کە ئامارەی پێکرا.

هەموو کردەو ئەدای تاکی موسڵمان، یاسا گوزاریو پێڕەوی گشتی موسڵمان

لەکۆمەڵگـەی موسـڵماندا، پەسـەندێتیو بوارەکانیـان لەئەسـڵی پابـەندێتی ئیرادییانـەوە بەئیسـلامو ئامـانجو مەبەسـتو بنـەماو بـەهاو ئەحکامەکانیـەوە وەردەگـرنو هـەڵ دەگـۆزن. بۆیـە نـابێت یاسـادانەری موسـڵمان لەکۆمەڵگـەی موسـڵماندا سـنوری ئیسـلامو ئامـانجو بـەهاکانی ببـەزێنێت کـاتێك سسـتمو مـەرجو ئـەحکام گـەلێك دادەنێـت کـە ئامانجیـان خسـتنە گـەڕی وزەی مرۆڤـە لەهـەڵگرتنی بەرپرسـیێتیەکەی بـۆ خەلافـەتی سـەرزەویو ئاوادانکردنـەوەی. هـەروەها کـردەو هەڵسوکەوتی موسـڵمانیش نـابێت لەپابـەندێتی بەئیسـلامەوە لابـدات، بـەم جـۆرەش سەربەسـتی لەبیرکردنـەوەو دەربڕینـی پابـەند بەبنـەماو ئامانجـە چاکسـازیو ئاوەدانکاریەکانـەوە دەبێتـە هۆکـارێك بـۆ کـارلێکیو ئاوێتـە بوونـی ڕاو دیـدی نێـو جەماعـە بەئاراسـتەی پەرەسـەندنی سسـتمو سیاسـەتە گشـتی یـەکانی نێـو کۆمەڵگـەدا.

لێرەوە سەربەستی لـەبیروباوەڕدا لەگـەڵ کۆنـترۆڵکردنی کـردەو ئاکـار لەسسـتمی دەوڵـەتی ئیسلامیدا ڕێگە بۆ فکری سەربەست خۆش دەکـەن کـە ببێتـە هۆکـارێکی هەمیشـەیی بـۆ وورد بوونـەوەو داهێنـانو پەرەسـەندن، وە ڕەو ڕەوەی ژیـان ئاراسـتەی ئامانجە خێرو پیرۆزەکـانی دەکـەن، هـەروەها باشـترین بـوار دەرەخسێنن لەبـەردەم کـردەو هـەڵسو کـەوتی مرۆیـیدا لەبـەر ڕۆشـنایی کـۆی مافـەکانی ئەندامـەکانی تـری کۆمەڵگـە لەسەربەسـتیەکانیان لـەبواری بیروبـاوەڕ، لـەپێناوی بەدیـهێنانی ئـەو چەمکانـەش لەسەربەسـتیداو ئامـادەکردنی بوارەکـانی ئیباحـە وەك بناغـەو ڕیشـەیەکی گشـتی لـەنێو ئوسـوڵەکانی پرۆگـرامو سسـتمی ئیسـلامیدا ناسراوەو سنوردار نەکراوە مەگـەر ئـەوەی لەدەقـەکانی سروشـدا بەڕاشـکاویو محکـم بـۆی دانرابـێ بـەپێی ڕێنمـایی زانسـتی بێسـنوری یـەقینی خوایـی، یـاخود ئـەوەی سـونەنی فیطـرە داینـابێتو بـەرژەوەندیو پێداویسـتی بنچینـەیی پێویسـتیان کردبێـت.

بێگومـان چـاك دەرك کـردن بـەواتاو چـەمکی سەربەسـتی لـەبڕیارو ویسـتی مرۆیـی لەئیسـلامداو تـێ گـەیین لـەواتای دەرچـەی یەکتایـەتی لـەواتاو ڕووی ئـەندامێتی مرۆڤـەوە لەکۆمەڵگـەی مرۆییـدا، و واتـای دەرچـەی خەلافـەتو ئامانجـە خێرخوازییەکـەی لـەژیانو بوونـی مرۆڤـدا، و مانـاو مەبەسـتی دەرچـەی بەرپرسـێتی سـەبارەت بـە پەیوەندییـەکانی کۆمەڵگـەو ئـەدای ئـەندامو دامـەزراوەکانی، ئەمانـە

هـەموو بایەخێکی گرنگیان هەیەو بیّ هەست کـردن بـەو بایەخـەو عـەقڵی موسـڵمان نـاتوانیّ خـۆی ڕزگاربکات لەلاسایی کردنەوەی کوێرانـەو توندڕەویو نـەزۆکی فکـریو ژیـاریی کـەدەرك دادەخـەن لـەڕووی هـەموو نوێکاری‌یـەك لـەفکرو هـەموو چارەسـەرییەکی دەردەکـانی نەتـەوەو کـەمو کـوڕی یـەکانی لـەداهێنانو شارسـتانییەتدا.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم دەرچانەوە تیّ دەگـەین لـەواتای چـەمکی فـەرمان بەچاکـەو قـەدەکردنی خراپـە لەئیسـلامدا. کـە لـەبواری سەربەسـتی بیروبـاوەڕدا بریتی‌یـە لـەئامۆژگاریو ڕێنمـاییو ئاراسـتەکردن،و لەلایـەنی ئـەدا کۆمەڵایەتی‌یـە کەیشـیدا جیـهادو ئاکـارو سـەرف کـردنو هـێز دەگرێتـەوە لـەپێناو پاراستنی کەمـەڵکاکانیو قـەوارەی سیسـتمە گشـتی‌یەکەیدا بـۆ ئـەوەی کەشـتیەکەی نوقـم نـەبێت،و بونیادەکـەی شـەق نـەباتو پشـێویو فەسـاد بڵاونەبێتـەوە، کەدەبنـە هـۆی ئـەوەی ئامانجـەکانی ژیـانو کۆمەڵگـە لـەبواری چاکسـازیو ئاوادانکردنـەوەدا بپوکێنـەوەو بفـەوتێن.

### د. هەموایەتی لە تەوەککول دا:

ئەمـەش چـەمکی چوارەمـە لـەنێو چەمکـە بنچینەییـەکانی پرۆگرامگـەرایی ئیسـلامیدا.

تـەوەککول پشـت بەسـتنو متمانـەی بـاوەڕدارە بـەخوای پـەروەردگار، قـەبولّ کردنـی قـەزاو قـەدەری خوایـە سـەبارەت بەهـەموو شـتێك پـەیوەندی بەژیانـەوە هـەبێتو ئـەوەش مرۆڤ تووشـی دەبێـتو چارەنوسـیەتی.

تـەوەککول بریتی‌یـە لـەو بـاوەڕەی لەدڵدایـە سـەبارەت بـەتواناو دانایـەتیو دادگـەری خـواو گەڕانـەوەی هـەموو کـارێك بـۆ خـواو تەنـها لـەوەوە.

تـەوەککولی دڵـی خـاوەن بـاوەڕ لـەباوەڕی غـەیبو هەموایەتیـەکانی جیـهانی غەیبیـەوە سـەرچاوە دەگـریّ کـە پـەروەردگاری ئاسمانـەکانو زەوی دەبیـات بـەڕێوەو حوکمـی دەکاتو عیلمـی پـیّی هەیـە بەتەنـهاو بـیّ هاوبـەش.

تـەوەککولی موسـڵمانیش بریتی‌یـە لـەتیّ گەیشـتنو دەرکو هەسـتێکی فیطریـی ئیمـانی بەپـەرۆش کـە یەکێکـە لـەگرنگترین سـەرچاوەکانی هـێزی موسـڵمانو وزە دەرونیـە لـەبن نەهاتوەکـەی کـە کانیـاوی ئـارام گرتـنو جیـهادو موجاهـەدەو ڕەزابوونو بەختـەوەری لیّ هـەڵ دەقوڵێـت.

هۆی ئەوەش کە تەوەککولی موسڵمان بەسەر چاوەیەك لەسەرچاوەکانی هێزی لەقەڵەم دەدرێت بریتی‌یە لەوەی کە ئەو تەوەککولە هۆکاریەتی بۆ دەرککردن و مامەڵەکردنی لەگەڵ هەموایەتیە ڕەببانیەکان لەبوونەرو ژیاندا، لەدەرچەی متمانەو دڵنیایی یەوە، چونکە موسڵمان لەڕێی باوەڕو فیطرەکەیەوە ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە کۆشش و هەوڵەکەی وابەستەیە بە بەجێ هێنانی ئەرکەکانیەوە لەخەلافەتەکەیدا بۆ جیهانی دیار(شهادە)، هەروەها ئەوەش دەزانێت کە کۆشش و هەوڵەکەی بریتی‌یە لەوەی کەڕۆڵی شیاوی خۆی بگێڕێت و بەرپرسیێتی یەکەی بەجێ بێنێت لەدەرچەی ئەو هۆکارو سوونەنانەی خوای پەروەردگار بەبوونەوەریانی سپاردوە،و عەقڵی مرۆڤیشی دارشتوە کەبیبان زانێت و رامیان بکات و مامەڵەیان لەگەڵ بکات، وە بشزانێت کە لۆژیك و عەقڵەکەی پەی بەکۆی هۆیەکان و سیرەی بونەوەریان و هەموایەتییان لەکارلێك کردندا نابات، بەڵکو ئەوە تەنها لەتوانای خوای پەروەردگاردا هەیەو پێویستە سەردانەوێنێت بۆ ئەو ڕێسایە.

﴿ قل ان الأمر كلــه لله ﴾ آل عمــران: ١٥٤.

﴿ الا له الخلق والأمر ﴾ الاعــــراف: ٥٤.

﴿ وما أوتيتم من العلم الا قليـــلا ﴾ الاســراء: ٨٥.

﴿ ولا يحيطون بشيء من علمه الا بما شـــاء ﴾ البقــرة: ٢٥٥.

﴿ ربنا وسعت كل شيء رحمة وعلمـــا ﴾ غــافر: ٧.

موسڵمانیش لەڕوانگەی متمانەوە بەخوای پەروەردگارو ڕازی بوونی بەقەزاو قەدەر خۆی دەداتە دەست خوای گەورە بەوەی کۆتایی و ئەنجامی هەموو کارێك بەویست و قەدەری خوابێت. وە پوختەی باوەڕی موسڵمان و پرۆگرامی عەقڵییەتیشی سەبارەت بە هەموایەتیەکانی لەم ژیان و بوونەدا ئەوەیە کە هەمووی بە خێرو پیرۆز بزانێت لەکۆتاییەکەیدا، ئەگەر سوپاس دەکەیت لەسەر بەخشش و نیعمەتی خوایی هەر خێرو پیرۆزە، خۆڕاگری و ئارامی لەبەرانبەر بەڵاو تاقیکردنەوەدا هەر خێرو پیرۆزە، هەروەها سەرکەوتوبێت لەژیانداو قەبوڵی هیدایەتت وە پاداشتی خێر وەرگرتن لەڕۆژی دواییدا هەموو ئەمانە خێرو پیرۆزن.
باوەڕی موسڵمان سەبارەت بەهەموایەتی‌یە ڕەببانیەکان لەم ژیان و بوونەدا بریتی‌یە لەباوەڕ بوون بەپاشە ڕۆژێکی خۆش و پڕ لەخێر بۆ کۆشش و هەوڵی

مرۆڤی موسڵمان هەرچەندە ژیانی دونیای تاڵو بێ سەمەر بوبێتو بەڵای زۆری تووش هاتبێ، باوەڕ بوونە بەسەرکەوتنی حەقو ڕاستیو کۆمەڵی حەقو، جیهادی ئەهلی حەقو چارەنوسی پڕ لە بەختیارییان، وە باوەڕە بەدۆڕاویی ناحەقو بەتاڵو ئەهلی بەتاڵ لەتەواوی ڕوو بەڕوو بوونەوەکانیدا بەدرێژایی مێژوو، و لەو ڕۆژەشدا کەهەموان لەبەردەم خوای جیهانیاندا ڕاوەستاون.

﴿ ولنبلونكم حتى نعلم المجاهدين منكم والصابرين ونبلــو اخبـاركم ﴾ محمــد: ٣١.

﴿ ونبلوكم بالشر والخير فتنة والينا ترجعـــون ﴾ الانبيــاء ٣٥.

﴿ والذين جاهدوا فينا لنهدينهم ســبلنا ﴾ العنكبــوت: ٦٩.

﴿ وجاهدوا في الله حق جــهاده ﴾ الحــج: ٧٨.

﴿ ياايها الذين آمنوا ان تنصروا الله ينصركم ويثبــت أقدامكــم ﴾ محمــد: ٧.

﴿ ان أُريد إلاّ الاصلاح مااستطعت وما توفيقـــي الا بـالله عليــه توكلــت واليــه انيب ﴾ هــود:٨٨.

﴿ نعِمَ أجر العاملين * الذين صبروا وعلى ربهــم يتوكلــون ﴾ العنكبــوت:٥٩.

﴿ وما عند الله خير وابقى للذين آمنوا وعلى ربهــم يتوكلــون ﴾ الشــورى:٣٦.

﴿ واليه يرجع الامر كله فاعبده وتوكل عليــــه ﴾ هــود: ١٢٣.

تەوەککول مانای(تەواکول) واتە پاڵ لێ دانەوەو بێ باکی نییە، بەڵکو متمانەو تسلیم بوونی موسڵمانە بەخوای گەورە لەکاری هەموایەتیە ڕەببانیەکاندا کە تەنها خوای پەروەردگار ئاگادارە لێیو دەیبات بەڕێوە، تەوەککول مانای ئەو هێزو بەرخۆدانو دڵنیاییو ڕەزامەندییەیە کە بەژیانی موسڵمانەوە جۆش دراونو بەرەو سەرکەوتنو سەرفرازیو عاقیبەت خێری دەیبەن.

بەڵام(تەواکول) واتە پاڵ لێ دانەوەو تەمبەڵی، واتاو دەرەنجامی لێکەوتەییو کەم تەرخەمیو کەمو کورییە سەبارەت بەو کارانەی پەیوەستن بەژیانی دونیاو پێداویستیەکانی هەوڵ دانەوە بەپێی سونەنو ڕێسا گەلێك کەخوای پەروەردگار ژێردەستی مرۆڤەکانی خستوە لەم ژیانەدا، وە لێپرسراوێتی مرۆڤی لەخەلافەتی سەرزەویدا بەستوە بەئەندازەی کۆششو هەوڵیەوە لەم ژیانەدا، بەڵام کاتێك مرۆڤ پاڵی لێ بداتەوەو تەمبەڵی بیگرێ مانای ئەوەیە کەم تەرخەمی کردووە لەبەجێ هێنانی هەوڵو کۆششو ڕێکخستنی کاروباردا، بەم پێ یەش تەواکول

یاخی بوون دەگەیەنێت لەفەرمانی خوای گەورەو سەرپێچی یە بۆ ڕێساکانی فیطرەی بێ گەردی مرۆڤ کە هەوڵدان لەڕێی هۆکارەوە بەئەرك و پێویستی دەزانێت بۆ بەدیهێنانی سوودو چاکسازی و ئاوەدانکاری. وە هەرگیز کەم تەرخەمی لەو هەوڵدانەی لەڕووی کارو گەڕان بەدوای ئامرازو شوێنکەوتنی ڕێساو نوسوڵەوە دەدرێن ئەم کەمتەرخەمی یە واتا نابێت بۆ تەوەککول، کە ئەمەش کرۆکی بەرپرسێتی ئادەمیزادە لەم ژیانەدا، و وێسگەی تاقیکردنەوەی ویست و بوونیشیەتی.

بێگومان تەواکول مانای تێکچون لەباوەڕداو گومڕایی و ون بونە لەکۆششدا، بۆیە مصطفی(ﷺ) وەلامی ئەو ئەعرابیەی کە تەوەککولی لەتەواکول جیانەکردەوە لە پرسیارەکەیدا بەم شێوەیە دایەوە(اعقلها وتوكل)[1] واتە: ولاخەکەت ببەستەوە ئینجا تەوەککولت هەبێ، لەهەمان دەرچەو هەمان چەمك و هەمان پرۆگرام، خەلیفەی دووەم عمری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێت) وەلامی ئەوکەسەی دایەوە کەپێی وابوو خۆپاراستن لەوەبای ڕشانەوە(تاعون)و بەجێ هێشتنی ئەو جێ یەی دەردەکەی تیا بلاوبۆتەوە ڕاکردن و خۆشاردنەوەیە لەقەدەری خوا، وەگومانی وابوو کەزۆر گەڕان بەشوێن هۆکارداو هەولدان بەپێی ڕێساکانی ژیان و سونەنی خوایی لەبوونەوەردا ئەمانە هەمووتەنها بە تەوەککول بەخواو بێ گرتنەبەری یاساکانیان دێنەدی، بۆیە خەلیفەش ئەم وەلامە ئاشکراو پڕ مانای دایەوە کە ووتی:(افر من قدر الله الى قدر الله)، واتە لەقەدەرێکی خواوە بەرەو قەدەرێکی تری خوا هەلدێم ڕێساو سروشتی نەخۆش کەوتن و تووش بوون قەدەرێکی خوایە، و ڕێساو سروشتی خۆ پارێزیش لەو تووشبوونە هەر قەدەری خوایە، کەواتە هەموو فەرمان و کارەکە هەر قەدەری خوایەو کۆششیش بەگرتنەبەری(ئەسباب) هۆیەکان و ڕێساکان بەشێکە لەبڕیارو قەزای خواو فەرمانبەرداریتی ی، نەك لێ یاخی بوون و پشت بێ نەبەستنی. بەم شێوەیە تەوەککول و تەواکول لێك جیا دەکرێنەوەو مانای هەریەکەیان بەڕوونی لێك دەدرێتەوە بەپێی فیطرەی بێ گەردی ئادەمیزادو ئەو سپاردەیەی خوای پەروەردگار سەبارەت بەخەلافەتی مرۆڤ بۆ سەرزەوی و بەڕێوەبردنی و سەرپەرشتی کردنی و، هەروەها بەرپرسێتیشی لەکۆششکردن بۆ چاکسازی و

(١) رواه الترمذي في سننه وابن حبان في صحيحه.

ئاوەدانکردنەوەی پێی سپاردووەو پێی ڕێزدارو بەرپرس کردووە،(تەواکول) پاڵ لێدانەوە فیطرەی بێگەردی مرۆیی لێی بێبەرییەو پەیوەندی بەئیسلامو واتای تەوەککولی ئیسلامیشەوە نییە، لەگەڵ عەقیدەو بڕوای سەلەفی چاکی ئەم ئوممەتەشدا سەبارەت بەقەزاو قەدەر یەك ناگرێتەوە زۆریش دوورە لەسیرەو ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانیو دوریشە لەجیهادیانو ئەو کۆششەیان کە بەپێی ڕێساو گرتنە بەری هۆیەکان پێی هەڵدەستانو بیرکردنەوەیانو هەموو ئەو ڕووداوانەی ڕوو بەڕوو دەبوەوە.

## ٥. سەبەبییەت لەبەجێهێنانی کردەی مرۆییدا:

سەبەبییەت چەمکێکی بنچینەیی یە لەژیانی مرۆڤی موسڵمانو پێك هێنانی عەقڵییەتو بنیاتنانی پرۆگرامی هزریدا. فیطرەو باوەڕی موسڵمان ئەوەی بۆ ڕوون دەکەنەوە کە خوای پەروەردگار بوونەوەریانی بەدی هێناوە سوننەنو ڕێسای بۆ داناون،و فەرمانو کاری بەڕێوەبردنو ژێردەستیانی بەئادەمیزاد سپاردووە بۆ ئەوەی کۆششو هەوڵی خۆی بخاتە گەڕ بۆ چاکسازیو ئاوەدانکاری لەم بوونەوەرەدا، بۆ ئەم مەبەستەش هەر خوای میهرەبان توانای بە ئادەمیزاد داوە بۆ هەستانی بەکاری بەرپرسیەکانیو دەربڕینی ویستو تواناکانی بەگرتنە بەری هۆیەکانو پێداویستیەکانی کارکردن لەپەیوەندی یەکانی سوننەنو ڕێساکان. کەواتە بەبێ(سەبەبییەت) واتە: گرتنە بەری هۆیەکان نەعەقڵی موسڵمانو نەفیطرەی مرۆیی هیچ بوارو ڕێیەکیان لەبەردەمدا نییە کەبیکەنە هۆکار بۆ بەجێهێنانی بەرپرسێتییە کانیان لەخەلافەتو بەڕێوەبردنی بوونەوەرياندا جگە لەهۆیەکانو بەکارهێنانیان بەو پەڕی لێبڕاوییەوە لەهەموو کاروبارێکی ژیاندا. وە ئەگەر مرۆڤ بەگرتنەبەری هۆیەکان دەستی بەکۆشش کردوو لەڕێی ئەوانەوە سوننەنو ڕێساکانی ژێر بار کرد بۆ دەربڕینی ویستو بەجێ هێنانی ئەرکەکانی لەخەلافەتیدا بۆ سەرزەوی ئەوا ئەرکی سەرشانی بەجێ هێناوەو وەڵامی فیطرەکەی داوەتەوە، وە لەمامەڵەیدا لەگەڵ سستمی ژیانو بوونەوەردا چووەتە ژێر باری لێپرسراوی، بەڵام نابێت پێگەی کۆششو هەوڵی لەسەر نەخشەی هەموایەتیە ڕەببانیەکاندا دیاری بکات چونکە ئەوە کاری ئەونییەو لەسنووری دەسەڵاتو لێپرسراوێتیو عیلمو دەرکی ئەودا نییە.

سەبارەت بەو واتاو چەمكانەش كە باسكران ئەم ئايەتە پيرۆزانەی خوارەوە دێنينەوە:

﴿ الذى له ملك السموات والارض ولم يتخذ ولدا ولم يكن لـه شـريك فى الملك وخلق كل شىء فقدره تقديـرا ﴾ الفرقـان: ٢.

﴿ سبح اسم ربك الاعلـى * الـذى خلـق فسـوى * والـذى قـدر فـهدى ﴾ الاعلـى: ١-٣.

﴿ صنع الله الذى اتقن كل شىء انه خبير بما تفعلـون ﴾ النمـل: ٨٨.

﴿ فطرة الله التى فطر الناس عليها لاتبديل لخلـق الله ﴾ الـروم: ٣٠.

﴿ وخلق الله السموات والارض بالحق ولتجزى كـل نفـس بمـا كسـبت وهـم لايظلمون ﴾ الجاثيـة: ٢٢.

﴿ قدخلت من قبلكـم سـنن فسـيروا فى الارض فـانظروا كيـف كـان عاقبـة المكذبين﴾ آل عمـران: ١٣٧.

﴿ انا مكنا له فى الارض وآتيناه من كل شىء سـببا ﴾ الكـهف: ٨٤.

﴿ الا تـزر وازرة وزر اخـرى * وان ليـس للانسـان الا ماسـعى * وان سـعيه سوف يرى * ثم يجزاه الجـزاء الاوفى ﴾ النجـم: ٣٨-٤١.

﴿ وسخر لكم مافى السموات وما فى الارض جميعا منه ان فى ذالـك لآيـات لقـوم يتفكرون ﴾ الجاثيـة: ١٣.

﴿ ولله ما فى السموات وما فى الارض ليجزى الذين أسـاؤوا بمـا عملـوا ويجـزى الذين أحسنوا بالحسنى ﴾ النجـم: ٣١.

﴿ الذى خلق الموت والحياة ليبلوكم ايكم احسـن عمـلا ﴾ الملـك: ٢.

﴿ ويستخلفكم فى الارض فينظر كيف تعملـون ﴾ الاعـراف: ١٢٩.

﴿ وما خلقنا السماء والارض وما بينهما لاعبـين ﴾ الانبيـاء: ١٦.

ئەم دەرك كردنە بەواتاو مەبەست لەبوونی مرۆڤ لەم ژيانەدا، هەروەها ئەوەش كەفيطرەكەی ئەيكات لەڕێنمايی كردن سەبارەت بە پەيوەندييەكانی بە بوونەوەرييانەوە ئەوە دەسەلمێنن كەهۆكارو ئەنجامی بەرپرسێتی يەكەی لەم ژيانەدا وابەستەن بەهۆيەكانو چۆنيەتی بەڕێوەبردنو بەكارهێنانی ئەو سونەنو ڕێسايانەی خوای پەروەردگار دەستە بەری كردوون لەدەروونەكانو هەموو

بونـەوەریاندا. دەورەکەشی هـەر لـەڕێی ئـەم هـۆو سـونەنانەوە بەرجەسـتە دەبێت.
وە لەسـەر بنچینـەی ئـەو سـونەنو هۆیانـەش عـەقلو ئیـدراكو لۆژیکیشـی
بینادەکرێتو بێ ئەوانیش بەرپرسێتی مـرۆڤ نەخشـەیەکی نـابێت، ئـەدای نـامێنێت،
عـەقلیش لێ دەکـەوێت،و هەستو ئیدراکیشـی لەدەسـت دەدات، ئـەم ئیـدراكو فامەیـە
کـە پرۆگـرامو بەرنامـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)و هـاوەڵانیو جیـهادو تـێ کۆشـانو
کۆشـشو کـار چاکیو گرتنـە بـەری هۆیـەکانو بـەدوای سـونەنو ڕێسـاگەڕانیان بـەڵێ
بـڕاویو متمانـەو دڵنیاییـەوە ڕاڤـە دەکـاتو لێـك دەداتـەوە بۆمـان. سـەبەبییەت
چـەمکێکی بنچینـەیی ئـەداو بـەجێ هێنانـە لەعەقڵییـەتی ئیسـلامیدا هـەروەها
لەبونیادی پرۆگرامگـەرایی ئیسلامیشدا. بواریـش لەبـەردەم کـردەو ئـەدای ئیسـلامیدا
نییە بێ تێ گەیینو حساب بۆ کردنی پێگـەی سـەبەبییەت لـەو بـوارەدا، هـەروەها
بنیاتنـانی کـردووەو ویسـتی ئیسـلامیانەش لەسـەر چـەمکی هـەمان سـەبەبییەتو
بەجددی گرتنی لەکردەوەو دیدو فامدا.
چـەندەش تـەوەککول لـەباوەڕو ئیمـانی مرسـڵماندا جـێ گـیرو جـێ متمانـەبێتو
توانـای بـەرەنگاری کۆسـپو تەحـەددییاتی تیـابێت؛ چـەندەش لـەکردەوەو هـەوڵدا
موسـڵمان جـددی بێـت لەگرتنەبـەرو ژێـر بـارکردنی هۆیـەکانو سـونەن، ئـەوەندەش
بەهێزدەبێت، توانـای دەبێت، داهێنـانو بەخششـی دەبێـت، ئیـتر شـایانی پاڵپشـتیو
سەرخسـتن دەبێـت لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە بـەپێی ئـەو بەڵێنـەی
بـەئیمانداراني داوە لەیارمـەتیو پشـتگیری چونکـە وەك موسـڵمان ئـەرکو
بەرپرسێتی خۆی لەهاوڕێکردنی کردەوەی چاك لەگەڵ ئیماندا جێ بەجێ کـردووە.
کـە تێبینی ژیاننامـەی پێغەمبەر(ﷺ)و سـەلەفی ئوممـەت دەکـەین سـەبارەت بـەڵێ
بـڕاویو جددییـەت لەکارسـازیو بیرکردنـەوەیاندا، هـەروەها لەگرتنەبـەرو
ئامادەکردنی هـۆو هۆکارەکـان لەگـەڵ جورئـەتو چوونـە پێشـەوەدا، دەزانـین ئـەوە
بەرو بوومی ئەم تێگەیشتنو ئـەم پرۆگرامەیە. بۆیـە کـەناویان دەبرێـت هـێزو توانـاو
سەرکەوتن دێتە یادو بەرجەستە دەبێت.
ئـەمڕۆش ئەگـەر موسڵمان بیـەوێت شـوێن پـێی ئـەو پێشـینانە هـەڵگرێتو ببێتـە
خـاوەنی ئـەو توانـاو بەرهەمانـە وەك ئـەوان دەبێـت بەجددییـەتو لێبڕانـەوە بچێتـە
ژێـر بـاری بەرپرسـێتیو بیرکردنـەوەو تـێڕوانینو توێژینـەوەو کۆشـش کـردن لـەڕێی
هۆیـەکانو، پێداویسـتیەکانی سـونەنی مـەخلوقات لـەبوارە جـۆراو جۆرەکـای

کۆمەڵیەتی و سروشتی و بەجێ هێنان و تەقەنیدا، لەهەمان کاتیشدا دەست لەکاروبارەکانی هەموایەتییە ڕەببانیەکان وەرنەدات چونکە ئەوانە تایبەتن بە پەروەردگاردەوو بەپێی دەریای ڕەحمەت و زانستی بێ پایانی خۆی هەڵیان دەسوڕێنێت.

کاتێك عەقڵ و پرۆگرامی موسڵمان پاڵی لێ دەدەنەوەو بەدوای هۆیەکاندا ناگەڕێن، کەم و کوڕی و کەمتەرخەمی دەکەن لەوەی لێیان داواکراوەو پێویستە پێی هەڵسن لەچوونە ژێر باری بەرپرسێتی و بەڵکو لەجیاتی ئەوە خۆخەریك دەکەن بەباس و خواسی هەموایەتی و کاروبارەکانی تایبەت بەپەروەردگارەوە. ئاوات و خۆزگەی لەسەر کەڵەکە دەکەن، لەبەڵێنی سەرخستن و چەسپاندن و دەسەڵات پێدان، هیچ لەمانە لەگەڵ فیطرەی خەڵك و عەقیدەی ئیسلامدا یەك ناکەون و ناگونجێن، ئەنجامیشیان نیە جگە لەدواکەوتن و بەدبەختی و داماوی.

کەواتە پێویستە زاناو شارەزایانمان لەکارو کارگەکاندا، مامۆستایان لەخوێندنگاو قوتابخانەکانیاندا، توێژی کارگەر لەکارگەو پیشەسازییەکاندا، سەربازەکانمان لەسەربازگەو چادرەکانیاندا لەسەر ئەو پرۆگرام و بنەمایە پەروەردەبن و مەشقی لەسەربکەن، ئەوکاتەش ویژدانمان ئاسودە دەبێت بەوەی توانیومانە بەهەموانەوە ڕۆڵی پێویست ببینین و شایانی خەلافەتی زەوی و، هیدایەت و پشتگیری خوای پەروەردگار دەبین.

﴿ وعد الله حقا ومن اصدق من الله قيلا ﴾ النساء: ١٢٢.

لەم باسەوە دەگوێزینەوە بۆ مەسەلەی بوارو گۆڕەپانی کاری هزرو فکری موسڵمان، کە لەژێر کاریگەری دواکەوتویی و دابڕانی سەرکردایەتی هزری و واتاو چەمکی ئاین لەبەر ڕۆشنایی ئەزموونی ڕۆژئاوادا، بوارو ڕووبەڕووی کاری هزری موسڵمان و پەیڕەو پرۆگرامگەرایی هزری موسڵمان لەگەڵ درێژبوونەوەی ژیان و هۆکارەکانیدا درێژ دەبێتەوەو هاوڕێی دەبێت وەك لەمەودوا باسی لێوە دەکەین.

**٥. تایبەتمەندێتییەکانی پرۆگرامگەرایی هزری: گشتگیری لە پرۆگرام و لەهۆکاردا:**

پرۆگرامگەرایی هزری ئیسلامی ــ بەهۆی گشتگیری یەوە لەڕووی بواردا ــ بەهەمان شێوە لەبواری هۆکاریشدا هەر گشتگیرە، ژیانیش بە هەموو گیاندارو بوونەوەریان و پێکهاتەکانیەوە بوارو گۆڕەپانێکە بۆ بەئەنجام دان و پیادەکردنی

هەولی موسلمان، لەبەر ئەوە موسلمان دەبێت کۆشش بکات بەهەر هۆکارو شێوازێك کە لەوزەو توانای دایە بۆ وەرگرتنی زانستو زانین دەربارەی کاروباری ژیانو بوونەوەریان، هەروەك بەر پرسیشە لەوەی بە هەموو جیددییەتو توانایەکی دامێنانەوە کۆشش بکات لەگشت ڕێیەکەوە تا ئامرازو هۆکاری پێویست بۆ ژێر بار خستنو ڕام هێنانی ژینو بونەوەریانو چاودێریو بەڕێوەبردنو ڕێکخستنی کاروباریشیان بەدەست بێنیت.

هەموو ئامرازێکی گونجاو لەئامرازەکانی توێژینەوەی زانستیو گەڕان بەدوای زانیندا لەبارن بۆ بەکارهێنان کە پێویستە لەسەر عەقلی موسلمان لەبەرهەم هێنانی زانیاریو توانادا سوودی لێ بینێت، ئەو ئامرازانە ماددی بن یان مەعنەوی، ئامرازی چۆنایەتی بن یان چەندایەتی، هەروەها ئامرازی لێ هەلێنجانو زانستیو ئەزمونیو تیۆریو شیکاریش بۆ ئەم مەبەستە چون یەکن. مەرجی هەریەك لەو ئامرازانە تەنها پوختیو چاکخوازییەتی، لەپێگەو بەکارهێنانیدا کۆمەكو پشتە بۆ ئادەمیزاد کەسەر کەوتوبێت لەکاری خەلافەتیدا لەسەر زەوی، هیچ ئامرازێکی زانستی یان مەعریفیو هیچ دەرەنجامێکی کۆششی دروستو ڕاست دژ بەئامانجەکانی فیطرەی بێ گەردی ئادەمیزاد ناوەستن لەچاکسازیو ئاوەدانکردنەوەو خەلافەتی سەرزەویدا، وەمرۆڤ بەرەو هەلدێری دەست تێ وەردانی کاروباری جیهانی غەیبو نادیار نایەن کە ئەوەکاری مرۆڤ نییەو بەدەرە لەتوانای عەقلی مرۆیی، ئەوندەنەبێت لەڕێی سروشەوە بەپێی پێویستی خۆی بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی سەرشانیو ئامانجی بوونەکەی لەم ژیانو زەویەدا دەتوانێتو دەکرێت بیزانێتو دەرکی بکات.

کەواتە بواری کاری عەقلی موسلمان لەسنوری جیهانی دیاردایە(علم الشهادة)، لەم ڕووبەرەدا پێویستە چاکسازیو ئاوەدانکاری ئەنجام بدات، بەلام کاروباری جیهانی نادیار(عالم الغیب) پێگەو گۆڕەپانی هەولو کاری ئەونیە، بەلکو خۆ هاویشتنە ئەو بازنەیە وێرانبوونی چاوگی هێزیەتیو دورکەوتنەوەیەتی لەئەرکی تایبەتی خۆی. تێگەیشتنو کارکردن لەسەر ئەو شێوازو بنەمایانەبوو کەبوە هۆی سەرکەوتنو بالادەستی موسلمانانی سەرەتای ئیسلام، بەلام تەمو مژی سەردیدی موسلمانانی دوایی‌تر بوە هۆی سەر لێ شێواویی فرەی عەقلی موسلمانو بەهەدەر چوونی کۆششەکانیو پووکانەوەی وزەی هەلمەتو لێ ڕانی،

کاتێك سەری کردە وتەی بێ کردەو گومانو دووبەرەکیو بەشێوەیەك گیرۆدەی بوورە مەگەر لای لێ نەکاتەوەو بەوشیارییەوە پابەندی عەقیدەو چوارچێوەی هزرو فکرە ڕاستەکەی ئیسلام ببێتەوە، وزەو تواناکانیشی بخاتەوە گەڕ لەچوار چێوەی کارە چاکسازییەکاندا لەجیهانی دیاراو بەمەبەستی خەلافەتی سەر زەوی بەو پێ یەی خوای پەروەردگار بۆی دیاری کردووە لەم جیهانەدا.

ئەگەر دەرکمان بەچەمکی گشت گیرییەکەی فکرو پرۆگرامگەرایی ئیسلامی کرد، بۆمان دەردەکەوێت کە بونیادی زانستو مەعریفەو هزرو کولتوری موسڵمان پێویستە بچێتە نێو واقعی ژیانی تاكو کۆمەڵان، بەڵکو گەلانو ئوممەتی ئیسلامو نەتەوە مرۆییەکانی تر، بیان ناسێت بەشێوەیەکی دروست لەڕووی پێداویستیو خواستو تواناو پەیوەندیەکانیەوە، وە هەربونیادێکی زانستیو مەعریفی ئەو مەبەستانەی تیانەیەتەدی بە بونیادو پرۆگرامێکی ئیسلامی دروست نازانرێتو، لەتەرازووی پەیامی ئیسلامو خەلافەتی ئادەمیزاددا کێشی نییە.

هەروەها لەهەر بنیاتنانێکی زانستو مەعریفەو هزرو کولتوری موسڵماندا ئەو توانایە بۆ عەقڵی موسڵمان دەستەبەر نەکرێت تیایدا وردی لەسەرنجو فامو سەلامەتی لەهەستکردنو ڕێكو پێکی لەئەنجامداندا بێنەدی، ئەوا ئەو بونیادە لاوازەو بە پرۆگرامێکی ئیسلامی لەقەڵەم نادرێت سەبارەت بە مەعریفەو فکرو ژیانی ئیسلامییانە.

ئەگەر پرۆگرام گشتگیرنەبێت لەڕووی بوارو ئامرازەوە، ئەوا بوارنە ڕەخسارە بۆ جێ گەیاندنی ئەمانەتو پێ ڕاگەیاندنی پەیامو دامەزراندنی خەلافەت لەڕووی چەندێتیو چۆنێتیو، هێزو تواناوە بەو شێوەیەی لەسەرەتارە دەستی پێ کردەو خواش بۆی دیاری کردبوو لەپەی ڕێنمایی ئایینەوە:

﴿ كنتم خير أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله ﴾ آل عمران: ١١٠.

جا ئەگەر تێ گەیشتنی باشی خەلافەی ڕاشیدینو گشت گیری پرۆگرامەکەی — لەگەڵ نزیکی ئەو سەردەمە لەسەردەمی پەیامەوە، لەگەڵ سەرقاڵی زۆریان بەڕوو بەڕوو بونەوەکانی سەردەمەوە، لەگەڵ تێنشووی کەمو پێشینەی کەم سەبارەت بەدامەزراوەو دامو دەزگاکانی بنیات نانو ژیار — بوبێتە هۆی ئەوەی

دەروازەی ئیجتیهادی بۆ خرابێتە سەرپشت لەسیاسەتو سستەمو بونیادا بەگەواهی مێژوو زۆری کتێبو نوسراو، ئەوا دەبێت لەپرۆگرامی سەردەمی سەرەتای ئیسلامو دەرچەکانی لەکارکردندا تێ بگەینو سەرچاوەی وزەو تواناکانی لەئەداو داهێنانو ئیجتیهاددا بزانینو دەرك بەشێوازەکانی لەپەرەپێدانی سیاسەتو دامو دەزگاکاندا بکەین لەگەڵ هۆیەکانی سەرکەوتنی لەبەدیهێنانی مەبەستو ئامانجەکاندا.

چینەکانی باو باپیرانی ڕابوردوو لەتابعینو، ئەوانەش دوای ئەوان هاتن لەپیاوانی فکرو دەعوەی ئیسلامیو زانست ــ لەگەڵ دابڕاوییشیان ــ توانیان دەقەکانی سروشو پەیام بپارێزنو لەدەستی تێکدانو گۆڕینو وون بوون ڕزگاریان بکەن، شایەتی ئەمەش ئەو توێژینەوە شەرعییانەن لەسەر زانستەکانی قورئانو سوننەت کراون.

لەبەرانبەر ئەمەشەوە زانستەکانی ئیجتیهادو سیاسەتی شەرعی لەبواری سیاسەتو ئابوریو کۆمەڵناسیو پەروەردەو زانستو هونەرو... هتد، لەنێو توێژینەوەکانی تایبەت بەفکری ئیسلامیدا کە دواتر ئەنجام دران پشکیان نەبوو، بەهۆی دارمانی پابەندێتی دەوڵەت بە سیاسەتی ڕاشیدەی ئیسلامیەوە، هەروەها بەهۆی دابڕانی خاوەن فکرو هزرەکانو زاڵ بوونی تەماعکاریەکانی پاشماوەی دەمارگیرێتیو نەفامێتیو ژیارو میللەتی نا ئیسلامی بە مەبەستی حوکمڕانی کردن. لەبەر ئەوە تائەمڕۆش بەپێی واتایەکی زانستیانەی دروست زانستو توێژینەوە سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیەکان لەسەر پێ ڕانەوەستان لەبازنەی فکری ئیسلامیداو لەسەر بنچینەی دیدو ڕوانگەی ئیسلامی، هەروەها هزرو مەعریفەی ئیسلامیش نەیتوانیوە پەرە بەکەرەستەو ئامێرە مەنهەجییە تەواو کارەکانی بدات کەبۆ بەدیهێنانی فامی واقعو ڕوانینە ژیان پێویستن بەو شێوەیەی کە بگونجێت لەگەڵ ئامانجو مەبەستە ئیسلامییەکاندا.

هزری ئیسلامی تا ئەمڕۆش لەمەیدانی پرۆگرامگەرایی زانستیانەی پێویست بۆ ئەو مەبەستانەی باسکران زیاد لەتۆمارکردنی ئەساسو بنەماو پرۆگرامگەراییە گەورەکان نەڕۆیشتوە، ئەوانەی کەموسڵمانانی سەرەتای ئیسلام بەڕێنماییە کانیان ڕێیان دەرکرد لەدیدو تێ ڕامانو ئیجتیهادو پێك هێنانی سیاسەتو دامو دەزگاکانیان، کە ئەمڕۆ بەبنەماو ئوسوڵە پلە دووەکان دەناسرێن وەك(المصلحە

المرسـله) و زيـان دورخسـتنەوەو عـورف‌و(الاستحسـان) و (الاسـتصحاب) هـەوڵ‌و كۆششـی هـزری ئیسـلامیش لەسـەر دەسـتی چینی‌یـە كـەم لـەزانایانی(سـەلەف) پێشوو تەنها لەسـەر كـاركردن لـەبوارو سـاحەی دەق‌و بایـەخ دان بـەدەق‌و وەسـف‌و ڕێكخستن‌و چەسپاندن‌و بنیاتنانی زانستە پێویسـتەكان بـۆی ڕاوەسـتاو مایـەوە. كـە زانستەكانی قورئان‌و تەفسیرو فـەرموودەو ڕیوایـەت‌و فیقـهو ئـەحكام‌و زمـان‌و ئـاداب بـوون، وەزانسـتی فیقـهو ئـەحكامی شـەرعی كەئـەم زانسـتە سـاحەی بەشـداربوونی زانایـان بـوو بـەتێ ڕامـان‌و ئیجتیـهادە تاكیـە خودیـەكانیان لـەدۆخی گونجـاو‌و شـارەزاییە خودیـەكانداو بـەبێ ئـەوەی شـیاوێتی پرۆگرامانـەیان لـەم بوارانـەدا بەدەست هێنـابێت.

لـەپێناو بەدیـهێنانی گشـت گیریـەتی هـزرو پرۆگرامـی ئیسـلامی بـۆ ئـەوەی بەروبومـەكانی ببەخشـێت بەهـەموو ژیـانی مرۆیـی، دەبێـت چـاو بگێڕینـەوە بەتێكەیشـتنماندا بەپرۆگرامگـەرایی یەكـەی زانسـتەكان‌و ئامرازەكـانی ئـەو پرۆگـرام گەرایی‌یـە، وە سـەرچاوە مەعریفیـەكان لـەئامرازەكانی‌و بوارەكـانی دیـدی مـەعریفی جیابكەینـەوە.

هـەروەها لەسـەر بیریـارە موسڵمانەكانیشـە كـە پرۆگرامـی تایبـەت بـۆ هـەربوارو هـەر زانسـتێك لەوزانسـتە زیندەیی‌یـە كۆمەڵایەتیانـە داڕێـژن، بـۆ مەبەسـتی ئـەوەی هـزری ئیسـلامی بتوانێـت ڕۆڵـی خـۆی لەداڕشتنی ئـەو زانسـتانەدا ببینـێ‌و توێژینـەوەو تـێ ڕامانـەكانی لەسـەر بنچینـەی زانسـتی ڕێكخـراو ئـەنجام بـدات بەشـێوەیەك ئـەو بنچینانـە ژێـر بـار بخرێن‌و چارەسـەری سستم‌و جێگرەوەیـان لێوە بەرهـەم بێـت.

دامـەزراوەی زانسـتی ئیسـلامی‌و زانكـۆ ئیسـلامیەكان نـاكرێ تەنـها لـەچوار چێوەی زانسـتی دەقـەكاندا بمێننـەوەو دابڕاوبـن لـەبوارەكانی زانسـتی كۆمەڵناسـی‌و تەقـەنی مرۆیـی، لـەكاتێكدا ئـەم بـوارە جـۆراو جۆرانـە هەریـەك لەلایـەنێكی جیـای ژیـان‌و چـالاكی ئـادەمیزاد دەدوێـن، هەمووشـیان سـاحەو بـواری ئاراسـتەكانی ئیسـلام‌و ئامـانج‌و مەبەسـتەكانیان.

دەرچـەی بنچینـەیی پرۆگرامگـەرایی ئیسـلامی بـۆ مەعریفـە لەلایـەن زانـا موسڵمانەكانی بـواری مرۆڤایەتی‌یـەوە ڕاسـت دەكرێتـەوە لـەڕێی بـەخۆدا چوونـەوەو زانینـی پێگـەی سـروش‌و ڕێنماییـە هەموایەتیەكـەی وەك سـەرچاوەیەكی مەعریفـەو ئاراسـتەكردن لـەبواری توێژینـەوەكانیاندا، هـەروەها پێویسـتە زانایـانی توێژینـەوە

لـەبواری سروشـی ئیسـلامیدا پێگـەو شـوێنی عـەقڵو فیطـرەت لەئاسـتی توێژینـەوەکاندا بزانـن لەگـەڵ ئـەو سـونەنو ڕێسـایانەی کـەخوا لەعـەقڵو فیطـرەدا جـێی بـۆ داناونو سـەرەکین بـۆ فـامی واتـای سـروشو بوارەکـانی، وەدانـانی لەشوێنی شیاوی خۆی لـەژیانی مرۆڤدا، بەم جۆرەش پێویستە لەسـەر ئـەم زانایانـە ئـامرازو هۆکارەکـانی توێژینـەوەی زانسـتیی مەنهـەجی چ شـیکاری چ ئـەزمونی کـەزانایانی بـواری مرۆڤایـەتیو تەقـەنیات بـەرەو پێشخسـتن بردویانـەو نیشـانەی ڕێـکو پێکـیو وردیو واقعییـەتو شـیکاری پێـوە دیـارە، بـەکاری بێنـن لـەبواری توێژینـەوە لەسـروشو تێگەیشـتن لەمەبەسـتو واتاکـانیو پەیوەندییـەکانی بـەفیطرەو واقعـەوە، بەوشـێوەو ئەندازەیـەی کـەدەگونجێن لەگـەڵ ئـەو بـوارە مەعریفییـەدا، بەمـەش سـەرچاوەکانی مەعریفـەی ئیسـلامی لەسـروشو عـەقڵو فیطـرەو بوونـەوەردا تـێرو تەواو دابێت، ئـەوەش ڕێگەیـەکی عەمەلییـەبۆ بنیاتنـانی پرۆگرامگەراییـەکی زانسـتیانەی ئیسـلامیو هاتنـە ئـارای مەعریفـەو زانسـت گـەلێکی ئیسلامی ئـاوازە.

لـەپێناو دانانی پێشـەکیە بنچینەییـە ئیسـلامیەکان لـەبوارە جـۆراو جۆرەکـانی توێژینـەوەو زانسـتە مرۆییـیو تەقەنیـەکان کـەڕەنگ دانـەوەو نمـایندەی مەبەسـتو ئامـانجو بۆچوونـە بـەهاو ئەحکامـە ئیسـلامیەکانن، پێویسـتە بیریـاری ئیسـلامی دەقـە ئیسـلامیەکان پۆلـێن بکـات هـەر لـەقورئانی پیرۆزو سـوننەو فـەرمودەی شـیرینی پێغەمبـەر (ﷺ)، هـەروەها کولتـورە ئـاوازە باشـەکانیش کـە بـەهۆی دروسـتی ئـەنجامیانو قووڵیـی بینیـەیان بـە سـامانێکی بـاش دادەنرێـن، دور بخرێنـەوەو پـاکژ بکرێنـەوە لـەو کردارانـەی لەسـەر ئەساسـی چـاوتێ برینـو تـەماعی سیاسـەتەوە دامەزراون، هـەروەها پـاکژیش بکرێنـەوە لەکاریگـەری خورافـاتو ئەندێشـەو ئـەوهامو ئیسـرائیلیاتانەی دزەیـان کردوەتـە نـاو زۆریـەی بەرهەمـە کولتوریەکانـەوە لەچاخەکانیئـەم دواییـەدا. ئـەم پۆلێـن کردنـەش دەبێـت لەسـەر ئـەو بنەمایـەبێت کەدیدی ئیسـلامی هاوچەرخ دەیسـەپێنێت لـەبوارەکانی ژیـانو زانسـتیدا.

ئـەم پۆلێنـەش پێویسـتە تـاکوو توێژەرەوانو پسـپۆڕەکانی نێـو بریـارو ڕۆشـنبیرە موسڵمانەکان بە ئاگـابن لەدەقـە کولتوریـەکانو لەوانـەوە هەموایەتیـەکانی ئیسـلامو ئامـانجو مەبەسـتو بـەهاو بنـەماکانی بدۆزنـەوەو بناسـن، وە لەبـەر ڕۆشـناییەکانیەوە بتوانـن کـاری داهێنەرانـە ئـەنجام بـدەن لـەبوارە جـۆراو جۆرەکانیـاندا بـەپێی

پێداویستیەکانی واقعو ڕوو بەڕووبوونەوە هاوچەرخەکان لەو بوارانەدا.

بێگومان بنچینەو پێشەکیە ئیسلامیەکان لەبوارە جۆراو جۆرو زانستو هونەرەکانی مەعریفەدا دیدو بۆچوونی ئیسلامیو، بنکەی بەخششو تایبەتێتی ئیسلامی دەنوێنن، پێویستیشە لەسەر بڕیارە موسڵمانەکان ئەم پێشەکیو بنچینانە بینابکەن، بۆئەوەی بەرەنگاری ئەو تەحەددایە ببنەوە کەبەرەو ڕوویان بوەتەوە بەو پەڕی ئازاییەوە.

بیرو هزری ئیسلامی مانای پابەندییە بەو ئامانجو مەبەستو بەها ئیسلامییانەوە کە لەچاوگی سروشو پەیامی خواییەوە وەرگیراون. موسڵمانیش باوەڕی هەیەو شانازیو هەست بەنرخی ئەو دیدو چەمکو مەبەستو بەها ئیسلامییانە دەکات.

بەڵام واقعو جیهانی ژیاری ئیسلامیو مێژووی ئەم دواییانەی بوونەتە هۆی تەنگە نەفەسیو تەنگە تاوی بۆی، نەلەفکرو نەلەواقعی توێژینەوەو زانستە ئیسلامییەکانیشدا دڵخۆشکارییەکی ئەو تۆی نییە، بەڵکو لەوانەشە لەم حاڵە فیکریەی هزری ئیسلامیشدا کە سنوردار کراوە داڕووخاوەو لەپاشەکشێ دایە سەرگەردانیو تەنگە تاویو لەت لەتبوونی زیاتر چاوەڕێ بکات، لەنێوان دیدێکی گشتیی تەماوی کە باوەڕی پێ یەتیو چارەیەکی لەلانیە بۆیو، لەنێوان ماددەو هزرێکی تێکەڵو پێکەڵی بێگیانی لێکەوتووی ئەوتۆ هیچ ئامرازو وەسیلەیەکی نیە جگە لەلاساییو هەڵبەستنو خۆهەڵواسینو بوون بەبار بەسەر هزرو بەرهەمی کەسانی ترەوە.

لەسەر زانایانو بیریارە موسڵمانەکان پێویستە بڕواننە دەقە ئیسلامیەکان، بەتایبەت دەقەکانی سوننەتو فەرموودەو، ئەوانەی کە فەرموودەی ڕاستن چ لەڕووی ڕواڵەتو چ لەڕووی بابەتیشەوە لەسەر بناغەیەکی ئاسان پۆلینو ڕێکی بخەنو پێشکەشی بکەنەوە، بە شێوەیەك توێژەر بەهاو نرخی ئەو ڕاستیەتە بزانێت کاتێ دەیخوێنێتەوە،و بۆئەوەی دووربێت لەئیسرائیلیاتو وتەی هەڵبەستراوو لاواز کەنە لەسەر شێوەی قورئانو نە لەڕۆحی ئیسلامو نە لەئەداو پێشکەشکردنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتبێت، هەروەها بۆئەوەی پارێزراوبێت لەباسو خواستە مەتەڵاویەکانی توێژینەوە ئەکادیمیەکانو بازنە بۆشەکانی، کە دەقەکان لەبەر دەستی توێژەراندا ــ جگە لەپسپۆڕە وردەکان ـ وەك ماددە

جیۆبییەکانی لێ دێت کەلووسەو لەدەستا خۆی ناگرێت و شوێنەوارێکی نامێنێتەوە جگە لەهەستکردن بەتێشکان و لێ کەوتەیی و کەم تێشوویی.

لەگەڵ نمایش و خستنە بەرچاوی دەقەکان بەشێوەیەکی گشت گیرانەو پۆلێن کراوی و پوختەکراوی لەسەر بناغەیەکی پرۆگرامی کە روونی بەریوایەت کردن و رواڵەت و بابەتیانەوە دیارە، لەهەمان کاتدا پێویستیشە لەرێی پێشکەشکردنی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بابەتییەوە سەبارەت بەسەردەمی هاتنە خوارەوەی پەیامی خوایی و ئەو بارودۆخە بابەتی و کۆمەڵایەتی و ژیارییەی کە سروشتی تیا دابەزیوەو سەردەمی سەرەتای ئیسلام مامەڵەی لەگەڵ کراوەو ئەو ئەنجامانەی کۆششیان لەپێناودا کردووەو بەدەستیان هێناوە نمایش و خستنەرووی دەقەکان شێوازێکی ئاسانی پێوەدیاربێت.

روونی و گشت گیرێتی و رێکخراوی و گەیشتن لەخەلفییەتی مێژوویی سەبارەت بەدەقە ئیسلامیەکان، بەتایبەت دەقەکانی سوننەو ژیاننامەی موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام، هەموو ئامرازوهۆکاری پێویستن بۆ تێ گەیینی دەقەکان و مەبەست و بە دەستهاتەکانیان وە بۆ رێ بەستن لەرووی هەڵەکانی فامی کەم و کورو هەوەسکاری و نەزانین زانستی پێویست بۆ راڤەو لێکدانەوەیان. ئەم پۆلێن کردن و ئاسانکردن و رێکخستنە هەنگاو گەلێکی پێویستن بۆ دەرك کردن بە بنەماکان و دارشتنی پێشەکیە ئیسلامیەکان لەهەر بوارێکدا، و بۆ عەقڵی موسڵمان دەست بداتە بەجێ هێنان و داهێنان و بنیاتنانی ژیاری ئیسلامی تاك و ئامانجەکانی پەیامی ئیسلام بێنەدی.

لەمرۆدا ناتوانین کە - ئەمە حاڵی مەعریفەو هزری ئیسلامی هاوچەرخ بێت - لۆمەی ئەو چاودێرانە بکەین کە بەهۆی ئەو تەم مژو نەزانینەی لەسەر ئەزمونی ئیسلامی کەڵەکەبوە، کارەکە لایان تێکەڵ بووە بەشێوەیەك ئەزموونی ئیسلامی و ئەزمونە پڕ لەخورافەو کرچ و کاڵە رۆژئاواییەکان وەك یەك هەڵدەسەنگێنن، لەکاتێکدا قەشەگەرێتی و مەفاسدو خراپەکارییەك لەئەزمونە رۆژئاواییەکە کەوتۆتەوە کە هیچ بوارێکی بۆ خاوەن عەقڵ و مافەکان نەهێشتۆتەوە، ئەوانیش ناچار بەهەڵە تێ دەگەن و هۆیەکان نادۆزنەوەو ناپێکن و رێ وون دەکەن و بەئەنجام ناگەن.

ئەوانەی کە بەئاگادەبن لەڕۆشنبیرانی موسڵمان‌و غەیری ئەوانیش ـ جگە لەخاوەن پیشەو شارەزایانی کاروباری دەقەکان ـ ناوەڕۆکی زۆربەی ئەو کتێبانەی لەبەردەستابن‌و مامەڵە لەگەڵ دەقەکان دەکەن، بەلایەوە سەیرنیە ئەگەر تێشووی پێویست‌و ئاڕاستەی پەسەندیان تیا بەدی ناکات، لەبەر ئەوە جێی سەرسوڕمان نیە کە کۆمەڵێ ڕۆشنبیرانی موسڵمانی دڵ گەرم دەستەوستان بن لەئاستی بەخششی زانستی‌و هێزی گرنگی دامێنەیدا، وە نەتوانن دیدو بەدیلی ڕەسەنی پێشرەو پێشکەش بکەن بۆ بەهانا چوونی ئوممەو ڕزگارکردن‌و سەرخستنی لەڕووی ژیاری‌و شارستانی پێویستەوە.

ئەگەر بشمانەوێت گشت گیرێتی ئیسلامی بەدی بێنین پێویستە زاناو بیریارو ڕۆشنبیرانی موسڵمان دەست بەکاربن بۆ ئامادەکردنێکی بێ گەرد تاکوو پێشەکیە ئیسلامیە زانستیە مەنهەجیەکان دابەزێننە نێو هەموو زانست‌و بوارێك، هەروەها بەوردی‌و بەشێوەی پشکنەرانە بچینەوە بەو زانست‌و مەعریفانەی لەبەردەستماندان بۆئەوەی ئەوانەی لێ هەڵاوێرین کە ڕاست‌و دروستن‌و سوودی مرۆڤیان تیایە بەمەش دەتوانین کۆششەکانمان بەتەواوو سەرکەوتوو بەخشندەو ڕەسەن لەقەڵەم بدەین بە پشتی خوا.

ئەوانەی لەنێو بازنەی زانستی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ دان خۆیان‌و شوێنکەوتوانیان لەموسڵمانی عەلمانی ئیسلام‌و ئاینەکانی تریان لەیەك تەرازوودا داناوەو بەیەك ئاواز دەیان دوێنن، بەو مانایەی کە هەموو ئاینەکان بەئیسلامیشەوە نابێت پەیوەندییان بە سیستەم‌و ڕێساکانی ژیان‌و کۆمەڵگەو سیاسەتی بەڕێوەبردنیانەوە هەبێت، بەو بیانوەی کەئاینەکان زادەی هزرێکی مێژوویی‌و وتەی ئەفسانەیین، پەیوەندییان بەسەردەمەکانی تیا پەیدابوونیانەوە هەیە، وەدەبێت ئاین لەسنوری پەرستگەو هەستی تاکە کەسی‌و دروشمە کە هنوتیەکاندا پیادەبکرێت‌و بمێنێتەوە.

خۆ ئەگەر ئەم بۆچوون‌و ئاوازە بۆ ئاینەکانی تر گونجاو ڕاست بێت بەهۆی ئەوەی کەڕەنگە بیروڕای ئەفسانەیین خورافی‌و دەستکاری‌کراو لەبەن‌و کتێبەکانیاندا تۆمارکرابێت‌و تێی خنرابێت‌و ڕاستێتی بۆچوونی ڕەخنەگرانی عەلمانی لەوبارەوە بسەلمێنێت، ئەمە بۆ ئاینی ئیسلام‌و بەرانبەر بەئیسلام وەك بلقی سەرئاوو بەسەریدا ناسەپێنرێت، لێرەدا گرنگە ئەوە بڵێین کە شێوازی

کادیرانی ئیسلام لەخستنە ڕووی دۆزەکەیاندا کەمو کوڕەو بەس نیە بۆ هەڵثانو ڕێنمایی کردنی دائیرەی زانتسیی هاوچەرخ تالە حەقیقەتو ناخی ئیسلام بگەنو پێگە جیاوازەکانی نێوان ئیسلامو ئاینەکانی تر بزانن، وەتەنها جەخت کردن لەسەر باوەڕ بەپەیامی ئیسلامو تایبەتمەندێتیو بڵندییەکەی بەس نیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئاسۆو ڕوانگەو دروستکردنی قەناعەت بە بەرهەموو بەخششەکانی ئیسلام. ئەم ئامانجە پیرۆزە تەنها لەڕێی هەوڵێکی زانستیانەی مەنهەجی بۆ بنیاتنانی مەعریفەی ئیسلامی بەدی دەهێنرێت، لەگەڵ پوختەکردنی کتێبی دەقەکانو دووبارە داڕشتنەوەی ناوەڕۆکەکانیان بە شێوەیەکی گشت گیرانەو ڕوون، وە ڕێکخستنی مێژووییانەو لەبواری زمانەوانیشدا بۆ ئاسانکردنی لێ تێ گەیشتن یان تاکوو توێژەر بتوانێت پوختەی پێشەکیو سەرەتا عەقیدەییو هزرەکان وەربگرێت لەبوارە جۆراو جۆرەکانی زانستو مەعریفەو ژیاندا. پاشان خستنەڕووی ئەو دەقو پێشەکیانە بە مەبەستی پشکنینو تاقیکردنەوەو بەراورد کردن توێژەر تەیاردەکات بە ئامرازی پێویست بۆ گۆڕینی هزر لەبواری تیۆریەوە بۆ واقعێکی زانستیانەو چارەنوس سازانەی کاریگەر کە بوونو ڕێزی خۆی بەسەر عەقڵو سیستەمە کۆمەڵایەتیو ژیاریەکاندا دەسەپێنێت، بەم شێوەیەش ئەدای داهێنەرانەی ئیسلامی - نەك تەنها سۆزێکی کاتی - دەبێتە وشەی یەکلاکەرەوەو بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا:

﴿ یاأیها الذین آمنوا استجیبوا لله وللرسول اذا دعاکم لما یحییکم ﴾ الانفال: ٢٤.

﴿ ونزلنا علیك الکتاب تبیانا لکل شيء وهدی ورحمة وبشری للمسلمین﴾ النحل: ٨٩.

﴿ افمن یمشي مکبا علی وجهه اهدی أمّن یمشي سویا علی صراط مستقیم ﴾ الملك: ٢٢.

﴿ هو الذي ارسل رسوله بالهدی ودین الحق لیظهره علی الدین کله ﴾ الصف: ٩.

﴿ ومن أحسن قولا ممن دعا الی الله وعمل صالحا وقال انني من المسلمین﴾ فصلت: ٣٣.

## بەشی چوارەم

# پرۆگرامی ئیسلامی و

# پێداویستییەکانی بنیاتنانی زانستەکانی ژیاری ئیسلامی

# پرۆگرامی ئیسلامی‌و
# پێداویستی‌یەکانی بنیاتنانی زانستەکانی ژیاری ئیسلامی

لەم بەشەدا هەندێك ڕووکاری گرنگ نیشان دەدەین کەپێویست بۆ دەستە بەرکردنی پێداویستی‌یە بنەڕەتی‌یەکان لە پێناو بنیاتنانی زانستەکانی ژیاری‌و بینا سازی‌و ئاوەدان کاری ئیسلامی، لەگەڵ ئەو قۆناغ‌و هەنگاوانەی کە پێویستە ڕەچاو بکرێت..

لێرە مەبەست لە زانستەکان هەموو ڕووەکانی زانست‌و مەعریفەیە، کە هەموو زانستە جیاجیاکان دەگرێتەوە، ئەوانەی کە پەیوەندی'ن بە کۆمەڵ بوون‌و کۆمەڵگەی مرۆیی‌یەوە هەیە، کە ئەمڕۆ بەزانستە کۆمەڵایەتی‌و مرۆیی‌یەکان دەناسرێ؛ هەروەها مەبەستمان لێی هەموو زانستە تەکنیکی‌یەکانە، ئەوانەی کە پەیوەستن بە هۆیەکانی ژیان‌و ژیاری مرۆیی‌یەوە، وە هەموو زانستە سروشتی‌و کردەیی‌و تەکنیکی‌یەکان دەگرێتەوە.

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە مەنهەجی ئیسلامی بناغەکانی تێڕوانینی بۆ لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیان گرتووەتە خۆی، بەمەش هەموو پێش بینی‌و بنچینەکانی بینا زانستی‌یەکانی پرۆگرامی کە هەموو گۆڕەپانەکانی دیراسەکردنی ژیان دەگرێتەوە. بەڵام بەداخ‌و کەسەرێکی زۆرەوە کە بنەما گشتی‌یەکان لە مەنهەجیەتی ڕەسەنیەتی ئیسلامی پەیوەندیدار بەلایەنی ئیجتیهادو بیروڕاوە، هەروەها دەرچەکانی تێڕوانینی ژیری لە دۆزو حاڵەتەکانی مرۆڤ لەبەر تیشکی شەریعەتدا،وەك خۆیان ماونەتەوەو تەنها بنەماو بناغەی گشتین، بەشێوەیەك بەرەو پێش نەچووە کە ببێتە چەند زانستێکی دیاری‌کراو.

ئەم پێشبینی‌و تروسکەو بنەما گشتی‌یانە بە شێوەیەك فراوان نەبوون کە ڕەنگ بدەنەوە لە پلانی مەنهەجی‌داو، لە شێوازو دەستورو هۆکارە زانستی‌یە دیاری کراوەکاندا، کە تێڕوانینی زانستی لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا بکرێتەوە، بە تایبەت لایەنە کۆمەڵایەتی‌و مرۆیی‌یەکان، وە ئەوەی کە پەیوەندی پێیانەوە هەیە لە داخوازی دەروونی‌و فیترەت‌و سروشتەکانی، وە ئەوەی کە لەسەری دادە ڕێژرێ لە پەیوەندی‌و سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان، وە لەچارەسەرو بەدیل‌و

لێپێچینەوە کە توانای هەیە لە ڕێکخستنی زانستو زانیاریدا بەو شێوەیە کە ڕۆڵی خەلافەتی ئیسلامی لە شارەزایی‌و کارامەییدا پێویستی‌یەتی. ئەوەی ڕوون‌و ئاشکرایشە گونجاو نیە کە تەنها کۆمەڵێك بنەمای گشتی‌و حوکمی فیقهی یاسایی بە کافی بزانین، کە بەرهەمی فیکری‌و زانستی‌و ماددەی زانستی پێویست دابین ناکەن، بۆ بنیاتنانی سیستەمەکان‌و چارەسەرو جێگرەوەو سیاسەت‌و ڕامیاریەکان، وە ناتوانێ عەقڵی موسڵمان بەرەو نوێبوونەوەو داهێنان. ڕێنمایی بکات، وە ناشتوانێ پێوانەی زانستی‌و دیاریکردنی هۆیەکان‌و کەرەستەکانەو، لێپرسراویەتیەکانی بۆ دەست نیشان بکات، بۆ هەر لایەنێکی ژیانی بەوەی کە لەگەڵیدا دەگونجێ.

ئەم ووتەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە لەسەرەتاوە هێمامان بۆ کرد لە پێویستی بوونی چەسپاندنی توێژینەوەو زانستە کۆمەڵایەتی‌و مرۆییەکان‌و چەسپاندنی مەنهەجیەتی ئیسلامی لەبواری زانستە سروشتی‌و تەکنیکی‌یەکاندا.

بەشێوەیەك کە تەواو کاربێت لەگەڵ زانستە وەرگیراوەکانداو، زانیاریەکی ڕێبەر بۆ مرۆڤی موسڵمان دەستە بەربکات، لەبەر ڕۆشنایی وەحی لەلایەك‌و شیاویش بێت بەهۆی هێزی عەقڵ‌و سوننەتەکانی فیترەتەوە لەلایەکی ترەوە.

لێرەدا هەوڵ دەدەین کە لەم توێژینەوەدا هەنگاو بنێین بۆ چەسپاندنی زانستەکانی ژیان لە فیکری ئیسلامی‌داو، وە بگەڕێین لە پلانی مەبدەئی پێویست بۆ ئیسلامیەتی ئەم زانستانەو داخوازیەکانیان.

### ١ـ پۆلێن کردنی دەقە ئیسلامی‌یەکان:

ئیسلامی بوونی مەعریفەو ئیسلامی بوونی زانستە کۆمەڵایەتی‌یەکان، بەدی نایەن، مەگەر تەنها کاتێك کە دەقە ئیسلامی‌یەکان بەشێوەیەکی باش‌و ئاسان دابین بکرێن، کە لێکۆڵەوەرە موسڵمانەکان لێی تێبگەن‌و بتوانن بەجوانی مامەڵەی زانستی لەگەڵدا بکەن.

پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە مەسەلەی پۆلین کردنی دەقەکان بەتایبەت دەقەکانی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)پێویست دەکات بەشێوەیەك بخرێنەوە بەرچاوی گشتی زانایان‌و ڕۆشنبیران لە ڕووی مەنهەج‌و شێوازە کە ئاسان بتوانن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، دوور لەهەموو هێماکاری‌و تەکنیکات‌و گرنگی پێدانی

ئـەكاديمى تايبـەت بەوانـەى كـە مێژوويى‌يانـە كاريـان لـەبوارى سـوننەتدا كـردووە، ئەمـەش تـاوەكو كـۆى گشـتى لێكۆڵـەرەوەو ڕۆشـنبيران بتوانـن مامەڵـەى لەگـەڵدا بكـەن‌و سـوودى لىَ وەربگـرن‌و، شـارەزاى چۆنيـەتى بـەكارهێنانى بـن‌و، دەركـى ئاستى بە بەڵگە بوونى بەن.

هـەروەها تێگەيشـتن لـە دەقـە ئيسـلامى‌يەكان‌و جـوان بـەكارهێنانيان دەخوازێـت كە ئـەو ڕاڤە مێژوويـى‌و زمانەوانيانـە دەسـتە بـەربكرێت كـە دەق لەشـێوەى تـەواوى خۆيدا دادەنـێ‌و وە خەلفيەتەكەيشـى ڕوون دەكاتـەوە، كـە وادەكـات لـە لێكۆڵـەرەوە بتوانێـت شـارەزاى خواسـت‌و مەبەسـتەكانى بێـت‌و، دەركـى بنـەماو چـەمك‌و ئـەو بەهايانـە بكـات كـە پەيوەنديـەكانى بـە دەروون‌و كۆبوونـەوەى مرۆيى‌يـەوە لـەخۆ دەگرێت.. لـە شێوەى وێنـەو مامەڵـەكردنى ژياريانـەى جيـاواز لـەڕووى چـاخى كـاتى‌و شوێنى‌يەوە كـە دەقـەكان لـەكاتى دەرچوونيـاندا چارەسـەريان كـردووە.

بـەم شـێوەيە لـە زەمينـە سـازى زانسـتيانە بـۆ دەقـە ئيسـلاميەكان، دەگونجـێ دەقـەكان بگـۆڕىَ بـۆ وێنـەى زينـدوو واتـاو بەڵگـەو كاريگـەرى ڕوون‌و ئاشـكرابێت، وە ئيتر وەكـو تروسكەيەكى مێژوويى پـەرش‌و بـڵاو نەمێنێتـەوە، نـەتوانىَ تـا ئـەندازەى پێويسـت تەمسـيل بكـات‌و دەركـى شـتەكان بكـات، هـەر وەك پێويستيشـە ئـەم لێكۆڵينەوانـە بەشـێوەيەكى زانسـتى‌و مەنهـەجى متمانـە پىَكـراو بهێنرێتـە پێـش، بەشێوەيەك كـە ڕاڤـەكان تێكـەڵ بەدەقـەكان نـەبن، وە پـىَ لەسـەر شـتێك دانـەگيرىَ كـە توانـاى پىَداگرتنـى زانستى يـاخود مێژوويـى يـاخود زمانـەوانى متمانـە پىَكـراوى بـۆ دەسـتە بـەر بكرێـت. بـەم شـێوازە زانسـتى‌يە دەقـەكان‌و ماناكانيـان ڕوون دەبێتـەوە، وە ئـەوەش كـە نـەتوانرىَ بـە تـەواوى ڕوون بكرێتـەوە ئـەوا بـەجىَ دەهێڵرێت بۆ تێگەيشتنى گشتى لـە وێنـەى گـەورەى ژيـانى پێغەمبـەر(ﷺ)مێـژووى سـەردەمى يەكـەمى موسـڵمانان، وە بـۆ تيكـراى مەبەسـتەكانى پـەيامى ئيسـلامى‌و خواسـتەكانى.

دەبـىَ ئـەم دەقـە بـەش بەشـكراوو متمانـە پێكراوانـە لـە دەزگـا گـەلێكى زانسـتى جيـددى بـە توانـاوە دەرچـن، وە دەبـىَ لـە زانايـانى خـاوەن زانسـتى وە هـادەرچن بتوانن ئـەو كارە گرنگـەى كـە لـە ئەستۆيان دايە ئـەنجامى بدەن بەشـێوەيەك تـەواوى مەرجـە زانستى‌يەكانى تێدا بێـت.

و لەڕووی زانستی‌یەوە بیّ کەمو کوڕی تەواو بێت هەروەك پێویستە لەسەر زانایانو لێکۆڵەرەوان کە هەستی بەتینیان هەبێتو هەڵوێستی ئیجابی‌و باشیان هەبێ لەو لێکۆڵینەوانەدا، بەگرنگی دابنێنو خۆیانی لێنەبورێن لە ڕەخنەگرتنو هەڵسەنگاندنو سەرنجو تێبینی‌یەکانیاندا.

کە بەهۆیەوە ئوممەت سەرچاوەی بنەڕەت ئاسانکراوی دەست بکەویّ بۆ دەقە ئیسلامی‌یەکان.

هەروەها پێویستە ئەم کارە لەلایەن دامو دەزگا ئیسلامی‌یە زانستی‌یەکانەوە ئەولەویاتی پێویستی پیّبدرێت لەپێناو تەواوکردنیداو، لەڕێیەوە فیکری ئیسلامی دەوڵەمەند بکریّ، وە پێویستە پەلە بکرێت لە بەکارهێنانی تەکنیکاتی نوێو گەشەکردنو بەرەو پێش چوونی ئامرازەکانی لەپێناو خزمەت کردنی مەبەستەکانی ئاماری دەقە ئیلامی‌یەکانو پۆلین کردنیان، سەرەڕای دوپات کردنەوە پێڕستی هەمووکتێبە کە لەبوریە باشەکان، بەمەبەستی سود وەرگرتن لە هەوڵو کۆششی باوباپیرانو ئەزموونەکانیان، وە لەپێناو قووڵ بوونەوەی ڕەگو ریشەی فیکرو پێناسی ئەم ئوممەتە، بەهۆی ئاگاداربوون بەسەر فیکری باوباپیرانو سوود وەرگرتن لە بەرهەمی عەقڵیان.

پەیمانگای جیهانی بۆ فیکری ئیسلامی ئەم مەسەلەیە لەم ساتەوەختەدا بە ئەولەویاتی خۆی سەیردەکاتو، هەوڵدەدات بەشداری بکات لە بەئەنجام گەیاندنی‌دا، وە هیوادارە کە هەموو موسڵمانان هاوکاری بکەن، بە تاكو کۆوو، هەموو دامو دەزگاکان، لەوانەی خاوەنی سەرپەرشتی‌و گرنگی پێدانو تایبەتمەندین لەم بارەیەوە..

## ٢- گشتگیری دیدی شارستانیانە:

کاتێك موسڵمانان دەیانەوێت ڕۆڵێکی هاوکاری‌و بەشداری کارانەیان هەبێت لە بازنەی مەعریفەی کۆمەلایەتی‌دا، وە هاوبەشی بونیادی شارستانی بکەن لەم چاخانەدا، ئەوا بە مایەیەکی پڕو هەگبەیەکی دەوڵەمەندەوە دێنە کایەوە، چونکە ئەوان لەبەخشینی شارستانیەتدا مێژوویەکی خاوەن شانازیان هەیە، هەروەها ئەوان ـــ لە کاتێکدا گەلانی دەورو پشتیان لەم بوارەدا پێشیان کەوتن ـــ وایان لێهاتووە ئەم پێشبڕکیّ شارستانیەتی‌یە بە تەحەدایەکی بوونی ئیسلامی دەزانن لەم سەردەمەدا..

وە موسڵمانان کاتێك ئەم تەحەدایان بۆ دەرکەوت، دەستیان دایە شارەزابوون لە هەوڵو کۆششی شارستانیانەی گەلانیترو، پەیوەندیان گرێدا لەگەڵیاندا، کە لەپشتی ئەم پەیوەندیانەوە بە هیوابوون بگەنەوە بەوەی لە کیسیان چووە، بەڵام بەداخەوە زۆریان دەست نەکەوت لەوەی بەهیوای بوون، لەبەر ئەوە بەردەوام هێشتا ئەو بۆشاییە گەورە ژیاریەی نێوان خۆیانو گەلانیتر زیاددەکاتو لە فراوان بووندایە، ئەگەر چی هەوڵەکانو بەخشینەکان زۆر گەورەن لەبەشداری کردن لە پێشبڕکێی شارستانیەتو توانایی لەم سەردەمەدا..

شتێکی ڕوونو ئاشکرایە کە زۆر بوونی هەوڵو کۆششەکانی وەرگێڕانی زانستیو ئەدەبی لە کارەکانی شارستانیەتەکانیتر، یاخود زۆر بوونی ناردنی ستافی زانستی بۆ دەرەوەو زۆر بوونی پەیمانگاو زانکۆکان،ناتوانێت بەداخەوە ئەو وێنە بگۆڕێ کە لەم سەردەمەدا موسڵمانانی تیا دەژین — وە هیچ هۆکارێك نامێنێتەوە بۆ ئەم دەردە، جگە لەوە نەبێت کە عەقڵیەتی ئیسلامیو مەنهەجیەتی ئیسلامی تووشی بەدوادا چوونو بەش بەشیو لاواز بوونی گیانی دەست پێشخەریو پوکانەوەی حەماسی دەروونیو عەقیدەیی بووە..

سەرەڕای ئەوەی کە لەپێشدا پێشنیارکرا لە چاکسازی مەنهەجیانە بۆ عەقڵیەتی ئیسلامی بەفیکری ڕۆژئاواییەوە ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر بۆ فیکرو ژیاری هاوەرخو مێژووی ئەو ژیارە بۆ عەقڵو بۆ موسڵمانێك ئەو لێکۆڵینەوەیە بکات، فەراهەم بهێنرێو پەختەی بەهاکانیو مەبەستەکانیو، ئەو پەیوەندی تەواو کاریو ئەندامیەتیەی لەنێوان ئەم مێژووەو ئەو ڕەوشتو بەهاو مەبەستانەو ئەو بەخششە ژیاریەی کە هەیە دابین بکرێ.

بەمەش ڕۆشنبیرانمان دەتوانن خۆیان ڕزگار بکەن لە وون بوونو ڕمانو توانەوە لە گۆڕەپانی تێکچڕانی فیکری ڕۆژئاوادا، وە دەتوانین مامەڵەی سەر بەخۆو بێلایەن ئەنجام بدەن لەگەڵ ئەو بیرەداو دەرکی تایبەتمەندیەکانی بکەن، ئەمەش ئەو ڕێگەیەیە کە بیری ئیسلامی دەتوانێ سوودی لێببینێ لە ئەزموونەکانی گەلانیتر، بێ سوکایەتی کردن بەو بناغەو بەخشینانەی(معگیات)کە ناوازەنو بیری ئیسلامی لەسەر دەوەستێتو تواناو بەخشینی بۆ دەرەخسێنێ..

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە، جیاوازی بکەین لەنێوان شکستی ژیاریو فیکریو ئەوەی هەڵیدەگرێت لە نیشانەو سیفاتەکانی بەجێمانو تەمەڵیو شوێن

کـەوتنی کوێرانـە، وە لـەنێوان هـەڵبژاردنو لێوەرگرتنـی فیکـریو ژیـاری بـــە ئاگـــاو بەسـوود..

لـە حاڵـەتی هـەڵبژاردنی ئاگایانـەدا، مەسـەلەی عـەقیدەو کێشـەی پێنـاسو پێگـەو دەسپێکەکانو مەبەستەکانو هەمەکیەکان(کلیات)، جێگەی سەودا لـە سـەرکردنو سستی نواندنو لە سنوور دەرچوون نین، بەڵکو بریتی‌یە لە کێشەی هەڵبژاردنو دەست نیشانکردن لە پێکهاتووەکان(مکونات)و ئامرازە (مکونات)و ئامرازە ژیاریو زانستی‌یە دابین کراوەکـان، لەوەی کە بەسوودە بۆ ئەوەی لە جێگەی شیاوو ڕاستی خۆی لـە داواکاریو پێداویستی‌یە ژیاریەکانی گـەلدا، دابـنرێت.. بەمـەش خـۆی لێکدانەوەیـەکی دیراسـەکراوو سـازدراودا دەنوێنـێ، ئەمـەش حاڵـەتی هـەموو پێوەنـد بوونێـك(تلامـح)و پـەیوەندی کردنێکـــی شارستانیانەی سەرکەوتووە لەنێوان گەلاندا بەدرێژایی مێژوو.. ئەم مەنهەجەیە لە شـێوازی ئاڕاستەکردنی پێغەمبـەردا(ﷺ)بۆ هاوڕێکـانیو کۆمەڵگەکـەی هەسـتی‌پێ دەکـەین، لـە بەیەککەیشتنی فیکریو ژیاریاندا لەگەڵ خاوەنی کتێبـە ئاسمانیـەکدا.. ئـەو شـێوازەیە کـە هـەموو گەلـە تـازە پێگەیشـتووەکان، لەوانـە گـەلانی ڕۆژئـاوا گرتوویانـە تەبـەر لـــە پـەیوەندی‌کردنیان بـە ئوممـەتی ئیسلامیو شارسـتانیەتە ڕابردووەکـەی، بەمـەش گـەلانی ڕۆژئـاوا پێناسـی خۆیـانو عـەقیدەو بـۆ چوونـە بنەڕەتی‌یـەکانیان نـەگۆڕیوە، بـەڵکو بەربـەرەکانی هـەموو کاریگەریـەکی عـەقیدەی ئیسـلامی‌کردووەو بـە هـەموو شـێوازەکانی پڕوپاگەندەو ڕێگرتنو چاودێری، دژی وەستاوەتەوە، تاوەکو لـەوەش درێغیـان نـەکردووە ـــبە تایبـەت دامـەزراوە کەنیسـەیی‌یەکان ـــ لـە داتاشـینی درۆو دژ بـە ئیسـلامو پێغەمبەرەکەیو پیاوانی ئیسلام. ئەم جۆرە بە یەککەیشتنەش لە وەرگرتنی ژیاری لەنێوان گەلاندا، ئەوەیـە کـە تێبینـی دەکـەین لـە هـەوڵی پێگەیشتن(تلاحـق)ی گـەلانو کۆمەڵگـە پێشکەوتووە نوێیـەکاندا، وەك یابـانو چینو ڕوسیا، نـەك هـەر ئەمـە بـەڵکو گـەلانی ڕۆژئـاوایش کـە نەخشـەو پـلانو سیاسـەتو کۆسـپو بەربەسـت بەشێوەی ڕاسـتەو خـۆو ناڕاسـتەوخۆ دادەنێـن بـۆ پاراسـتنی گەلـەکانیانو بـۆ پاراسـتنی بـیروڕا عـەقیدەیی‌و فیکریەکانیانو پارێزگـاری‌کردنی تـاوەکو وەکـو خۆیـان بمێننـەوە، لەگـەڵ ئـەوەی کـە زۆر سوورن لەسـەر هـەڵبژاردنی تواناکـانی گـەلانی‌تری بێگانـەوە بەدەست هـاتووە(الانجازات) ژیاریەکانیان، ئەوەندەی کە بگونجێ لەگـەڵ پێویستی‌و حاڵـەتی گـەلو دەزگـاو دەستورو ڕژێمەکانیاندا..

لەبەر ئەوە تێگەیشتنی گشت گیریانەی ڕاست بۆ ژیاری هاوچەرخ و کرانەوەیەکی سازدراوانە بە ڕوویدا، کارێکی زەروری و هەنووکەیی یە بۆ ئالوگۆڕی ژیاری دروست و ڕەوا، چونکە ئەم تێگەیشتنەیە هەڵبژاردن و سوود وەرگرتنی زانستی و هونەری ڕاست و دروستمان بۆ دەگونجێنێ، بێ دەستێوەردان لە بەهاو عەقیدەو بنەماو پێناس .. بەڵکو بەو هێزو توانایەی کە لەگەڵ دەیداتێ کاردەکات لەسەر پشتگیری کردنی و یارمەتیدانی هۆکارو ئامرازە دروستەکان، بۆ بەدیهاتنی خواست و مەبەستەکانی.

لەبەر ئەوە وریایی و ئاگاداری پێویستە لەتێگەیشتنی کرانەوەو لێوەرگرتنی ژیاری، بەوەی کە بانگەوازە بۆ کرانەوەو شوێنکەوتنی ڕەها، یاخود بریتیبێ لە توانەوەو بەدوادا چوونی بێ سنوورو هیچ کاریگەری نەبێت لەسەر بونیادو پایەکانی بوونی گەل لەبەر ئەوە ئەوانە وانەکانی مێژوو واقیعی پەیوەندی گەلان نیە.

مەبەست بە پێوەیندبوونی ژیاری ڕاست و دروست و سوود وەرگرتنی ژیاری لەو دەسکەوت و داهێنانکاریانەی کە گەلان پێی گەیشتون،بریتییە لە لێکدانەوەو مامەڵە لەگەڵ کردنێکی پڕ لە ئاگایی و سەربەخۆیانە. لە وێنەی مامەڵەی کەسی هاوبەش و سەرکردە، نەک مامەڵەی شوێن کەوتەو پەککەوتەو دەست کورتەکان.

پەیمانگای جیهانی بۆ فیکری ئیسلامی ئەم هەنگاوەی ناوە، نەک بەزۆر کردنی وەرگێڕان بۆ کارە ژیاریە بیانیەکان، بەڵکو بە هەوڵدان بۆ بەهێزکردنی عەقڵی موسڵمان بە چەند لێکۆڵینەوەیەکی هەمەکی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژئاواو ڕەگو ریشەی ئەو ژیارەی کە هەیەتی، تا بتوانێ لەم ژیارە تێبگات و مامەڵەی بە ئاگایانەو سەربەخۆی لەگەڵ بکات. خوازیارین ئەم لێکۆڵینەوانە لە پەرتوکێکی گشتگیردا سەبارەت بە ژیاری ڕۆژئاواو ئامانج و خواست و مەبەست و مێژووی هاتنی و تایبەتمەندی و دەسکەوتەکانی و ڕووەکانی بەهێزی و ڕووەکانی ناتەواوی، تەواو ببێت و، بەمەیش پەیمانگا دەرگایەك لە دەرگاکانی کەم و کورتی فیکری ئیسلامی هاوچەرخ دادەخات و بێ دەسەڵاتێکی مەنهاجی لەم فیکرەدا بە ویستی خوا نامێڵێ..

هەروەها پەیمانگە هیواخوازە لەم بوارەدا یارمەتی بدرێ لەلایەن خاوەن فیکرو ڕۆشنبیرانی موسڵمانەوەو هاوکاری بکەن لەپێناو بە ئەنجام گەیاندنی ئەم پرۆژە گەورەو گرنگەدا،و لەکۆکردنەوەو دابینکردنی ووزەو توانا پێویستیەکاندا بۆتەواوکردنی هێنانە بوونی.

## ٢- پێشەکی‌یەکانی زانستە کۆمەڵایەتی‌یەکان:

ئەگەر مەبەست بە زانستە کۆمەڵایەتی‌و مرۆیی‌یەکان بریتی بێ لە تێڕوانینێکی مەنهەجیانە لە مۆرک‌و پەیوەندیەکان بۆ دەروون‌و بوونەوەریان، بۆ ناسینی واقیع‌و ئەو ئیمکانیات‌و دژایەتیانەی کە ڕوودەکەنە ئەتەوە، وە بۆ گەیشتن بەو ئیجتیهادە فیکریانەی کە یاساو بیرو بۆ چوون‌و لێپێچینەوەو سیاسەت‌و بەدیلی ئیسلامی پێویستیان لێدەکەوێتەوە بۆ ژیانی گەل، ئایا پەیوەندی لەنێوان پەیام‌و وەحی‌و ئەوانەی دەیگرێتەوەولە خواست‌و مەبەست وە لەنێوان ئەم بوارە کۆمەڵایەتیانەو زانست‌و مەنهەجەکانیدا، بە ئامانجی تێڕوانین‌و ووردیاری(تدقیق)و خوێندنەوە(استقراء)و ناسینی فیترەت‌و حەقیقەت‌و واقیعی گونجاوو خواستراو، لەژێر ڕۆشنایی مەبەستەکان‌و خواستەکانی وەحی‌و ئەحکامەکانیدا چۆن دەبێت!

شێوازی پێکەوە گرێدان‌و پێکەوە بەستن وا بۆمان دەردەکەوێت کە یەکەمین جار لەم بوارەدا پۆلین کردنی پێشەکی‌یەکان‌و بناغە ئیسلامی‌یەکان دەستپێدەکات، بۆ ئەوەی چوار دەورەکەی دیاری بکات‌و خواست‌و مەبەستەکانی ڕوون بکاتەوە، ئەگەر نا ئەوا ئەم لێکۆڵینەوەو زانستانە دەبنە ژمارەو خشتەو تێبینی‌و شیتەڵکاری ڕووت‌و ئاڕاستەو مەبەستەکانی جگە لەئیسلام‌و جگە لە مەبەستی گەل‌و قەناعەتە بنەڕەتی‌یەکانیەوە وەردەگرێ.

پێشەکی‌یە ئیسلامی‌یە دواکراوەکان بۆ انستەکان لە دوو جۆرن، جۆری یەکەمیان چەند پێشەکی‌یەکی گشتی‌یە، پەیوەندی بە بنەما گشتی‌یەکان‌و خواستە سەرەکیەکانی ئیسلام لەژیان‌و ڕژێمە مرۆیی‌یەکانیدا هەیە.. هەروەها پەیوەندی هەیە بە چوارچێوەی فیکری ئیسلامی مەنهەجی‌و پەیوەندیە بنچینەیی‌یەکانی‌و سەرچاوەکانی ئەم فیکرەو ئامرازو هۆیەکانی‌و سروشتی ئەو سەرچاوانەو هۆیەکان‌و ئەوەی لەنێوانیاندایە لە تەواوکاری‌و هاوکاری، بۆ هێنانەدی‌و دەستەبەر بوونی خواست‌و مەبەستەکانی. ئەوە جۆرێکە لە پێشەکی‌یەکان کە بەها بنەڕەتی‌یەکان‌و ئەولەویاتە هەرە گەورەکانی ژیانی ئیسلامی‌و ڕژێم‌و کەسایەتی ئیسلامی‌و بەخشینی ئیسلامی دیاری دەکات.. هەروەها بنچینەکان‌و دەسپێکەکان‌و ئەو ئامرازو هۆکارە بنەڕەتیانە دیاری دەکات کە پێویستە ئاگادارین بەسەریداو سەرپەرشتی بکەین، لەپێناو ئاڕاستەکردنی هەوڵی زانستی ئیسلامی‌و بە دواداچوونی‌و لەبەر چاوگرتنی کاریگەری‌و

شـوێنەواری.. وە جـۆری دووەم لـە پێشـەکیە ئیسـلامی‌یەکان لـەبواری زانسـتی ژیانی‌دا ئەمانە دەگرێتـەوە:

١. پێشـەکیەکان‌و بناغـەکان بـۆ هـەموو زانسـتێک‌و بـۆ هـەموو بوارێـک لـە بوارەکانی مەعریفەو زانستە کۆمەڵایـەتی‌و نـا کۆمەڵایەتی‌یـەکانیش.

٢. ئـەوەی کـە دەیگرێتـەوە لـە حاڵەتـەکانی فیـترەت‌و واقیـع‌و ئیمکانـات‌و پەیوەندی‌یەکان، لەوەی کە تایبەتە بەهەر بوارێکەوە بـەجیا..

٣. ئـەوەی دەیگرێتـە خـۆی لەخواسـت‌و بـەهاو ئاڕاسـتەکردنەکان‌و دسـپلینی (ظوابط) مەنهەجی ئیسلامی تایبـەت، کە ئـەو بوارەی پـێ جیا دەکرێتـەوە.

٤. تـاوتوێ کردنـی ئـەو بـوارەی کـە مەبەسـتە، لـەژێر تیشـکی ئـەم بنـەماو خواسـت‌و بـەهاو بناغـەو دسپلین‌و هۆکارو ئامرازە مەنهەجیـە ئیسـلامیانەدا.

٥. دروشمـەکانی زانسـت‌و کێشـە سـەرەکیەکانی کـە دیـدی ئیسـلامی لـەبواری خۆیـدا ڕوون دەکاتـەوە، بـە بـەراوردکردن بـە دیدەکـان‌و مەبەسـتەکان‌و بەخشـینە(عگـاوات) نـا ئیسـلامی‌یەکان‌و ئـەو شـوێنەوارە کۆمەڵایـەتی‌و مرۆیی‌یانـەی کە لەهـەموو حاڵـەتێکدا لەسـەریان دەوەستێت‌و بە دوایاندا دێـت..

ئـەم پێشـەکی‌و بناغانـە هەرچـەندە لـە ڕەگ‌و ڕیشـەو دەسـت پێ‌کردنیانـەوە پشت بەدەقـەکانی پەیامەکەو مێژووی ئیسـلام‌و دیـدی ئیسلام‌و خواسـت‌و مەبەستە گشـتی‌یەکانی دەبەسـتن، کـەچی لەسـەر هـەموو حاڵەتەکانـەوە بریتی‌یـە لـەدیدو ئیجتیـهاداتێک کـە تەمسـیلی تـێڕوانینی عـەقڵی‌و وەڵامدانـەوەی دۆخـی ئیسـلامی دەکات، بۆ هـەموورووەکانی دژایـەتی‌کردنی ژیـاری‌و بارودۆخـەکانی‌و شـوێنی‌یەکانی.

لەبەر ئەوە لە بەشێکی گەورەیدا، فیکرێکـی ئیسـلامی زینـدوو گەشـە سـەندووەو دەچێتـە ژێـر مشـتومڕ لەسـەر کـردن‌و ڕەخنـەگرتن‌و کـەم‌و زیـادکردن‌و ڕاسـت کردنـەوە، لـەواقیع‌و گۆڕانکاریـەکانی‌و، لـە فیـترەت‌و نهێنیـەکانی‌و تواناکـانی وەڵامدانـەوەی، بـە مەبەسـتی بـەرەو ڕوو بوونـەوەی دژایەتیـەکان‌و بـەجێ‌هاتنی ئیمکانیەتـەکان‌و وەڵامدانـەوەی پێداویسـتی‌یەکان. بـە تێپـەڕبوونی کـات‌و قـووڵ بوونـەوەی تـێڕوانینی ئیسـلامی‌و دابـین بوونـی زانیاریـەکان، ئـەم پێشـەکیانە پێ‌دەگـەن‌و پاشـان تێکـەڵاو بـە بونیـادی زانسـت‌و زانیاریـەکان‌و گرنگـی پێدانـەکانیان دەبـێ‌و کاریگـەری‌و جۆری بەخشینی لە هـەموو لایـەک لـەلاکانی بـەجێ دەهێڵـێ، وە هـەموو ئەولەویـەتێکیش لـە ئەولەویەتـەکانی شـێوازو بابـەتی‌و چۆنی‌یـەتی‌و

چەندیەتیەکەی بەمە بەرهەمی زانستە کۆمەڵایەتی یەکان و ناکۆمەڵایەتیەکانیش لە تێڕوانینی ئیسلامی خۆیاندا گەشەدەکەن و پێدەگەن. ئەو کاتە وەرگرتنی ئیسلامی لەدیدو بەخشینەکانی لەم بوارانەدا ئاوازە دەبێت و بەشداری کردنی ئیسلامی کاریگەری و شوێنەواری ئاوەدان کاری خێرخوازی دیاری خۆی بەسەر ڕووی مێژووی ژیاری مرۆڤایەتی یەوە بە ویستی خوا بەجێ دەهێڵێ.

گرنگ دەرك بەوە بکەین کە هەردەبێ موسڵمان گۆڕانکاری مەنهەجی ژیاری داواکراو لەفیکری ئیسلامی دا بەر پابکەن و، لەبەش بەشی و وەسف کردن و لە شوێنەواری جەنگە سیاسی یە ڕابردووە کۆنەکانی ڕزگار بکەن، کە چوارچێوەی ئەو فیکرەیان شێواندووەو دیدیان لێڵ کردووەو پێشکەوتنەکانی وەستاندووە.

ووزەکانی سنووردار کرابوو لەسەر بەستنەوەی واقیعی ژیانی و ئەوەی دەیگرێتەوە لە ووزەو تواناکانی فیترەتەکان و ئیمکانیەتەکان و کارلێکیان لەگەڵ بەهاو خواستە ئیسلامی یەکاندا، وە جوڵاندن و هاندانی ئیسلام و بەها ئیسلامی یە کە لە پێکهاتەی ئەم گەلەدا هەبووە لەناو دەبرێت. تاوای لێهات هەستی ژیاری و ڕەهەندی کۆمەڵی لە پێکهاتەکانی کەسایەتی ئیسلامی و بونیادی پێکهاتەی ئەم گەلەدا کوژایەوە.

هەردەبێت موسڵمان بتوانن فیکری ئیسلامی بەرەو دەسپێکەری(منطلقات) مەنهەجی ڕاست و دروست و تەواوکارو بەرەو دیدێکی عەقیدەیی کە ئاراستەکردنەکان و ئەولەویاتەکانی ڕۆشن بن، ببەن و دەرگای ئیجتیهادی ژیانی و زانستی و کۆمەڵایەتی فراوان لە بەردەم عەقڵدا بکەنەوە.

دەبێ موسڵمانان زاڵ ببن بەسەر گیانی شوێن کەوتن و هۆکارەکانی ترس و تۆقاندن و بێدەسەلاتی و کەم و کورتی نەمانی هەستی دەست پێ کردن لە دەروونی ڕۆڵەکانی ئەم گەلەو فیکریانداو زاڵ بن بەسەر شێوازی پەروەردە کردنیان و چۆنیەتی دامەزراندنی دەزگاو دەستورو ڕژێمەکانیاندا، ئەگەر موسڵمانان نەیانتوانی ئەمە ئەنجام بدەن ئەوا حاڵی ئەم گەلە بەردەوام بەرەو ڕمان و تێکشکان دەچێت و ئازارو مەینەتی موسڵمانان و گەلەکانیان لە گەورەبوون و زیادبووندا دەبێت، وە بەشی هەوڵە ئیسلامی و بزوتنەوە ئیسلامی یەکان ـ ئەمە خاویەتی و سادەی عەقلیەت و کەسایەتی ئیسلامی و بەخششی ئیسلامی یە ـ لەوە

کەمتر نابێت لە پەرش و بڵاوی و دوڕاوی هەوڵە ئیسلامییەکان و بزوتنەوەئیسلامییەکانی پێش خۆیان، لە مێژووی ئیسلامی ئەم دواییانەدا..

لێکۆڵینەوەمان لە هەندێك لە بزوتنەوە ئیسلامییەکان کە لەم دواییانەدا سەریان هەڵدا لە بیابانەکانی جیهانی ئیسلامیدا، ئەوەمان بۆ دەردەخات کەهۆی سەرهەڵدان و سەرکەوتنی مەبدەئیان لەو بیابانەدا ئەوەیە کە هاوشێوە لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کە ئیسلام تیایدا دەرکەوت، ئەمە لەڕووە ماددی و وەسفیەکەیەوە.. هەرچەندە ئەو بزوتنەوانە دەستە پاچەن لەڕووی فیکریەوە بتوانن گواستنەوەیەکی(نقلە) فیکری و مەنهەجی ژیاریانەی خواستراو بەرپابکەن.

ئەو بزوتنەوە ئیسلامیانەی کە خاوەنی جەوهەرێکی چاولێکەری و مەنهەجێکی بەشی(جزئی)و تێگەیشتنێکی وەسفی مێژووی ئیسلامی و دەزگاو دەسپێکە ژیاریەکانی بوون، دەبوایە هەر لەبیابانی جیهانی ئیسلامیدا سەریان هەڵدایە، هەتاوەکو پاش گەیشتنیان بەدەسەڵات لەو ژینگە سادەی خۆیاندا. ئیتر لەوێدا هەر دەبوایە بەرەو دارمان و بەزین و توانەوە بچونایە، ئەمەیش لەکاتێکدا فیکرو دەسەڵاتی درێژەی کێشاو گەیشتە شارەکانی جیهانی ئیسلامی و پەیوەندییە ژیاریە گۆڕاوەکانی، لەوێدا ناچاری بەرەو ڕووبوونەوە کرا، بەرەو ڕووی دژایەتیەکانی سەردەم بوویەوە، بەبێ ئەوەی لەڕووی مەنهەجییەوە ئامادەباشی هەبێ بۆ ئەو بەرەو ڕوو بوونەوە، لەبەر ئەوە لەڕووی فیکری و ژیاریەوە دۆڕا، پێش ئەوەی لاپەڕەی بوونی سیاسی و سەربازی بپێچرێتەوە.

بەمەش بزوتنەوەو دەوڵەتانی ئیسلامیش یەك بەدوای یەکدا هاتن، بەبێ ئەوەی لەڕووی مەنهەجی و ژیاریەوە ئامادەبن بۆ گۆڕینی ڕووی جیهانی ئیسلامی و تازەکردنەوەی ووزەو تواناکانی، وە دۆڕان و بەزین لە کارکردنی ئەم ئوممەتەو بەر پاکردنی گواستنەوەیەکی خواستراو بۆ بوونی ئیسلامی لە جیهانی ئەمڕۆدا.. لەوانەیە دیراسەکردنی ئەزموونی بزوتنەوەکانی پیاوانی وەك پێشەوا سنوسی و مەهدی و شاولی‌الله و محمد کوڕی عبدالوهاب شتێکی بە سوودبن لەژێر تیشکی ئەم شیکردنەوەدا..

بۆ ئەوەی بزوتنەوە ئیسلامییە هاوچەرخەکان لە شارە ئیسلامییەکاندا، سەرکەوتن بەدەست بهێنن، پێویستە تازە کردنەوەیەکی ڕیشەیی لە مەنهەجی فیکری ئیسلامی و دیدی ژیاری ئەو فیکرەدا دروست بکەن، بۆ ئەوەی هەوڵەکانی

ئـەم ئوممەتــەو کۆششــەکەی نەبێتــە کۆششــێکی عــەقیدەیی عاتیفانـــەی ڕووت، نـەتوانێت مەنهـەجی فیکـری‌و گۆڕانکـاری ژیـاری خواسـتراو بـەرپابکات بـۆ دابەزینـە مـەیدانی دژایەتیـەکان‌و دەرخسـتنی پێنـاس‌و ڕاسـت کردنـەوەی بونیـادی دەروونـی ئـەم گەلـەو پێگەیشـتنی، وە دووبـارە بونیادنانـەوەی دەسـپێکەکان‌و مەعاریفـەکان‌و دەزگـا ژیـاری‌و کۆمەڵایەتی‌یـە ئیسـلامی‌یەکان. بێ‌گۆڕانکـاری لەمەنهـەجدا هـەوڵی بونیادنانـەوە، هـەوڵێکی عاتیفیانـەی ون دەبێـت، بـێ سـوودو بێ‌بەرهـەم دەبـێ، بەڵکو دەبێتـە هۆی بـەفیڕۆ چوونـی بـەردەوامی ووزەکـان‌و لـەکیس دانـی هەمیشـەیی داهات‌و تواناکـان، وە ئـەو کەلێنـە ژیاریـەی کـە هەیـە لـەنێوان ئوممـەتی ئیسـلامی‌و گـەلانی پێشـکەوتوودا لـەفراوان بووندا دەبێـت‌و زیـانی ئـەم ئوممەتـە بـەش لـەدوای بـەش‌و داهـات لـەدوای داهـات‌و گـەل لـەدوای گـەل‌و کارەسـات لـەدوای کارەسـات بـەردەوام دەبێـت، تـا ئەوکاتــەی ئـەم ئوممەتـە دەسـت بـەهۆکارە ڕاسـتەکانی کـارکردن‌و ئانجـام دان‌و بەخشـین‌و بـەرەو ڕوو بوونـەوەی دژایەتیـەکان دەگرێـت‌و بەکاریان دەهێنـێ.

لەوانەیـە دوای ئـەو هـەموو ڕوون کردنەوەیـە هەسـتمان بەگرنگیـەتی مەنهـەج‌و چاکسـازی فیکـری‌و بـەرپاکردنی ئـەو گواسـتنەوە ژیاریـە خواسـتراوە لـەفیکری ئـەم ئوممەتـەو عەقڵیـەتی ڕۆڵەکانی‌دا کردبـێ.. شـتێکی گرنگـە بـە ئەمانـەت‌و ئاگایی‌یـەوە هەسـت بەوەبکـەین کـە گـیرۆدەبوون‌و ئازارەکـان لـە زۆر بوونـدان، زەمـەنیش لەگەڵماندا نیە، ئەگەر ئاوا بمێنـین - ئەگـەر چـی بەرهـەمی ئـاین‌و مێـژوو. وولاتمـان هـەبێت - لەسەر ئەم بونیادنانە فیکری‌و دەروونی‌و ژیاریە ئیفلیجە ناتـەواوە.

ئەمانـەت داری لـە ڕەخنـەگرتن لـەخۆو بـەرەو ڕوو بوونـەوەی کـەمو کورتیـەکان لـە لە پێکهاتـەو بـەجێ هێنانـەکانی‌دا کـارێکی ئاسـان نیـە، بـەڵکو کـارێکی بـەئازارو تاڵـە، بـەلام ناشـتوانین خۆمـانی لێ دەربازبکـەین، ئـەبێت خۆمـان ئامۆژگـاری خۆمـان بکەین، تا ئەو ئاستەی بتوانین لەڕاستی تێ‌بگـەین‌و زاڵ بـین بەسـەر هەڵچوونـەکانی عاتیفـەمان‌و خایـاڵ‌و پڕوپاگـەندەی تواناکـان‌و کارەکانمـان‌و خـۆ بـەزل زانینمـان‌و هەڵخەڵەتێنـەکانی نـەتوانینمان، تـاکو بتوانـین سـوود وەربگریـن لـە کەلـەپووری ڕابردوومـان‌و لەوانـەکانی، بـۆ قـازانجی داهاتومـان، خەلفـەت‌و جێنشـینی‌و بونێکـی باش‌و چاکەخوازی لە زەوی‌دا، هـەروەك وویسـتی خـوای گـەورە وابـووە لـە دروسـت کردنـی مرۆڤـدا.

لەگەڵ درێژەپێدان بەم چارەسەرە بۆ کێشەکانی مەنهەجیەتی ئیسلامیو ئەو پێشەکیوبناغە گشتییانەی کە پەیوەندیان پێوەی هەیە، سەبارەت بەزانستە جیاوازەکان لە تێڕوانینی ئیسلامییە، شتێکی گونجاوە لەمە توێژینەوەیەدا دەست بکەین بە مشتومڕکردن لەسەر هەندێ لە بناغەکانیئەم پێشەکییانەی کە دیدی ئیسلامی جیادەکەنەوەولەهەر دیدێکی ژیاری هاوچەرخیتر.. ئەم کارە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی سەرەتای هیوای ئەوەی کە بەخشینی زانستی ئوممەتی ئیسلامی بەخشینێکی ڕەسەنو ناوازە بێت، بتوانێت ئەو ناتەواویەی کە هەیە تەیهێڵێتو ڕێڕەوی چەوت ڕاست بکاتەوەو، ئەو مەترسیە کەڵەکەبووانە دووربخاتەوە کەخەریکە مرۆڤ و مرۆڤایەتی لەناو بەرن.. هەروەها ئاگاداری بدات سەبارەت بەو خراپانەی کە بەهەموو لایەکدا بڵاودەبنەوەو بێتوانایە لەبەردەم تەقینەوەدا..

گشتگیری تێگەیشتنی ئیسلامی بۆ سروشتو فیترەتە مرۆییەکانو بەئاگابوونو نابینی لایەنە جیاوازەکانی ئەم سروشتیە. وادەکات کەتێڕوانینیئیسلامی، تێڕوانینێکی زانستیانەی ناوازەی تێرو پڕبێت، یاسایەکی ڕەسەنو دروست بۆ تێڕوانینو دیراسەو شیکردنەوە پێشکەش بکات لەبوارەکانی زانستە ژیانیو کۆمەڵایەتییەکاندا، هیوای بەخشینێکی داهێنەرانەی ڕەسەن ببوژێنێتەوە..

پاشان باسەکەمان سەبارەت بەم پێشەکیانە زیاتر جەخت دەکاتەوە لەسەر مشتومڕو تاوتوێ کردنی ئەو پێشەکییە ئیسلامییە مەنهەجییە گرنگەی کە هەیە، وەکو بنکەیەكو پشتەکێك(مرتکز) بۆ چوونە ناومەنهەجی ئیسلامی، کە لەدەوری ئەم مەسەلانەی خوارەوەدا دەخولێتەوە:

ا. ڕەهەندەکانی بوونی ئیسلامیانە! فرەییەکی تەواوکاری(تعدد متكامل)

ب. خواستو مەبەست لە سیستمی گەردوونو ژیان

ج. بابەتی بوونی حەقو حەقیقەت لەمۆرکی دەروونەکانو لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتییە مرۆییەکاندا.

### ١. ڕەهەندەکانی بوونی ئینسانی ئیسلامیانە: یەکەیەکی هەموانەیی و فردییەکی تەواوکاری:

بوونی مرۆڤ لەتێڕوانینی ئیسلامییەوە بەوە جیادەکرێتەوە کە فردییەکی تەواوکارییە (یەکەیەك و قەوارەیەکی مرۆیی یەکگرتوودا. ئەم ووتەیەو ئەم دەسپێکە تەمسیلی فەرزیەتێکی مەنهەجی گرنگ دەکات، کە کاریگەری و شوێنکارییەکی دوورو درێژ بەسەر دیراسەکردنەکانی سلوکی مرۆڤ و بەسەر تێگەیشتنی مرۆڤ بەگشتی و تێگەیشتنی مرۆڤی موسڵمان و دەروونی و شێوازی جێ بەجێکردنی بەشێوەیەکی تایبەتی، بەجێ دەهێڵێ.

ئاینەکان ((ئایدۆلۆژییەکان)) کە هەریەکەیان تاپادەیەکی زۆر گرنگ، زۆر بەلایەك یاخود لایەکیتر لە لایەنەکانی بوونی مرۆیی دەدەن و ئەوانی تریش تاماوەیەکی درێژ پشت گوێ دەخەن. سەرەڕای ئەو سەرکەوتنانەی کە ئەم ئاین و ئایدۆلۆژیانە بە دەستیان هێناوە - کەچی مرۆڤ لەسایەیاندا هەر بە دڵەڕاوکێ و دوودڵی ماوەتەوە و لەبازنەکانی بەربەرەکانی و جەنگی ناوەکی دەرەکیدا تاکی بێ یاخود کۆمەڵی، دەژی، بێ پچڕان.. ئەم ئایدۆلۆژیانەیش هیچ چارەسەرێکیان دەست ناکەوێت بۆی.

ماددەیەکی تاکە کەسیانەی ڕۆژئاوا پشت بە هەستەکان و چێژو ئارەزووەکان دەبینێت و بوونە پەرستراوو دەسەڵات بەدەستی ئەو تاکانە، سەرەڕای ئەو هەموو پێش کەوتوویەی کە شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەخۆیەوە دەبینێ لە دابین کردنی چێژە ماددیەکاندا.. کەچی تائێستا لەسایەی ئەو شارستانیەتەدا تاك هەر لەئازارو دووبەرەکی و ململانێی دەروونی و کۆمەڵایەتی و بژشایی گیانیدا ماوەتەوەو گلەیی و گازندە لەسەر ئەو شارستانیە و شوێنکارەکانی کەڵەکە دەبێت و دیراسەو عەیادەکانیش دەستەوسانن لەبەرەو ڕوو بوونەوەدا.

هەروەها ماتریالیستی کۆمەڵ گەرای ستەم خوازانەی مارکسیش، ئەمیش دیسان پشت بەپێداویستیە ماددی و ئابووریەکان دەبەستێ و هەوڵی خۆی بۆ دابین کردنیان و ڕزگارکردنی مرۆڤ لەو پێویستیانە دەکاتە مەبەستی بوونی مرۆڤ و هەوڵدانی لەژیاندا. لەگەڵ ئەوەیشدا مرۆڤ لەسایەی ئەم ئایدۆلۆژیایەیشدا باری ژیانی خۆشترو باشتر نەبوو لەبارەی دوودڵی و دڵەڕاوکێوە لە بەرامبەرەکەی کە ئایدۆلۆژیای ڕۆژئاوایە..

ئـەمیش سـەرنەكەوت، هـەر وەك چـۆن ئایدۆلۆژیـای ڕۆژئـاوایی سـەرنەكەوت لـەدابین كردنـی ئاسایشـی دەروونـیو كۆمەڵایـەتی بـۆ تاكـەكانو ئـەو كۆمەڵگایانـەی كە سەركردایەتیان دەكاتو دەسـەڵاتی بەسـەر تواناكـانیدا هەیـە.

بـەڵام ئاینـەكانی ڕۆژهـەڵاتی دوور كـە ڕقـی لـەژیانو قـەوارەی مرۆڤـە، بەهەسـتەكانو ئارەزووەكـانو پێداویسـتیەكانی، لـە مەسـیحیەتی دەسـت كـاریكراو زۆر توندتـرە، دواخـوازی پیٚـنرخ كـردنو بەسـووك سـەیركردنی جەسـتەو داواكـاریو پێداویستیـیە ماددیەكانیـەتی، لـەپێناو دەربـازبوونی گیـانیو هـەوڵدانێكی زوویـی بـۆ چـوون بـەرەو خۆشـیـیە گیانیـیـەكان، بەمـە شـوێن كـەوتوانی بـەرەو ئـەو دوا كەوتوویـیـەو نەخۆشـیـیە لـەبارەی دەروونـیو بـاری كۆمـەڵگاكانیان دەبـات، كـە ئێستا پـیٚی گەیشـتون، هـەر ئەمـەیش وایكـرد هـەندێ لـە گەلـەكانیان وەكـو چـین لـەپێناو خـۆ دەربـازكردن لـەو نەخۆشـیانە كـە تیـایدا دەژیـان، پـەنا ببەنـە بـەر وەرگرتنـی ئایدۆلۆژیای مـاددیو سیسـتمە زۆردارو خـۆ سـەپێنەكان.

ئەمـەیش بـۆ كەسـێك سـەرنج بـدات، كەمتەرخـەمیو ناتـەواوی دەردەخـاتو تەفسـیری پشـت لێكردنـی دەروونـەكان لـەو ئاینانـەو لـەو ژیانـە تـاڵو شـێوێندراوەی كە شـوێن كـەوتووانی هـەوڵی هەڵوەشـاندنەوەی مەبەسـتو پرۆگرامـەكانی دەدەن.

بەڵام ئـاینی ئیسـلام هـەر وەك دەقـەكانی وەحـی بڕیـاری لەسـەر دەداتو بـەوە جیـا دەكرێتـەوە كـە بـەو شـێوەیە مامەڵـە لەگـەڵ مرۆڤـدا دەكـات، كـە خـاوەنی فیـترەتو قـەوارەو پێداویسـتیـیە..

ئیسـلام دان بەغـەریزەو ئارەزووەكـانیو چێژەكـانیدا دەنێـت.. وەبـە بەخشیشـێكی خوایی دەزانـێ لەسـەر مـرۆڤ، وە مەبەسـتی گرنـگو بونیـات نەرانـەیان تێدایـە ئەگـەر بـەڕێكو پێكی بەكار ببرێتو بـەجوانی ئاڕاسـتە بكرێـن بـۆ ئـەنجامدانی كارەكـەیان، وەكـو چێـژو جوانـیو تازەكردنـەوەی ووزەو تازەكردنـەوەی ژیـان. ئـاینی ئیسـلام دان دەنێـت بەپێداویسـتی مـاددیو ئابووریـیـەكانی مرۆڤـداو بەهۆیـەك لەهۆیـەكانی بـوونو، بـۆ ڕاپـەڕاندنو داهێنانكـاریو بـۆ چەسـپاندنی حـەقو داد پـەروەریو چاكـەی دەزانـێ لـەژیانو لـە كۆمـەڵگاكاندا..

ئیسـلام مـرۆڤ دانابـەزێنێ بـۆ ئاسـتی نزمـی شمـەكو ڕابواردنـە ماددیـەكانو، ناشـیرینو قـێزەوونو سـووكیش ناكـات بـەوەی كـە بـەرەو ژیـانو هـەنگاوی گیـانی ڕووی پـێ وەردەگـێڕێو بیكاتـە خولیـا بـۆی، مـرۆڤ وەك ئیسـلام

بڕیاریداوەوفیترەتی ساغو دروستیش ڕێنمونی کردووە، گیانو ماددەیە، مرۆڤ بوونێکی زەمەنیو مەبەستێکی بەرزو پیرۆزە، مرۆڤ قەوارەیەکی ماددیەو مەبەستی خوایی و ڕەهەندی هەمیشەیی هەیە، هەموو کارو مەبەستو ئەنجام دانو داهێنانێکی ماددی لەژیانی مرۆڤدا لەتێڕوانینی ئیسلامیەوە بریتییە لە شێوەو دەربڕینی ماددی بۆ بەجێ گەیاندنی مەبەستە گیانییە بەرزو پیرۆزەکان، کە بەهۆیانەوە واتای بوونی خۆی دەهێنێتەدی، وە بەهۆی ئەویشەوە دەتوانێ تاقیکردنەوەی وویستی خۆی لەم ژیانەدا ببڕێ..

مرۆڤ لەتێڕوانینی ئیسلامدا قەوارەو بوونو ماددەیە، مەیلی هەیەو ئارەزوو دەکات، قەوارەو بوونێکە پێویستی بە ژیانو مانەوە هەیەو هەوڵی بۆ دەداتو خوازیاریەتی بەلام لەگەڵچ ئەوەیشدا گیانو مەبەستو وویستیشە کە کۆشش دەکات بۆ گیان بەرزیو خواستی چاکەو چاکە خوازیو چاکسازی.

لەبەر ئەوە هەتا وەکو یادکردنەوە(ژکر)و دروشمەکانیش(شعائر)وە هەرچی بە بەندایەتی کردن ناسراوە لە ئیسلامدا هەمووی ئاسانەو لەپاڵ سوودە ڕۆحیەکانیدا کۆمەڵێ سوودی بەر جەستە لەژیانداو لەسستمی ژیاندا دەهێنێتەدی.

وەك پاكو خاوێنی لە دەست نوێژداو دەستورو ڕێكوپێكی لە نوێژداو،ئارامیو خۆڕاگری لە ڕۆژووداو، بەخشین لەزەكاتداو، یەكسانی لەحەجدا، مەبەستیش لەمەدا ئامادەكردنی دەروونە بۆ ئەنجام دانی كاری چاكو گەیاندنی ڕاسپاردەو هەڵسان بە داخوازیەكانی جێنشینیو هەوڵدان لەسەر زەوی بەچاك سازیو ئاوەدان كردنەوە..

﴿ وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي يعظكم لعلكم تذكرون ﴾ النحل: ٩٠

﴿ ارأيت الذي يكذب بالدين * فذلك الذي يدع اليتيم * ولا يحض على طعام المسكين ﴾ الماعون ١ ــ ٣

﴿ من عمل صالحا فلنفسه ومن أساء فعليها ثم الى ربكم ترجعون ﴾ الجاثية: ١٥

﴿ الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملا ﴾ الملك: ٢

﴿ فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره * ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره ﴾ الزلزلة: ٧ــ٨

((والكلمة الطيبة صدقة)) رواه الطبراني بنحوه.

((وفي بضع احدكم صدقة)) رواة البخـــاري.

((وامرأة دخلت النار في هرة ربطتها)) رواه مســـلم واحمـــد.

((ورجل سقى كلبا اشتد به العطش فشكر الله له فغفرله)) رواه البخاري.

((في كل كبد رطبة أجر)) رواه البخـــاري.

لـــه بـــيروبۆچوونی ئیســـلامی‌دا مـــرۆڤ کـــاتێك کـــه لایه‌نـــه‌کانی بوونـــی‌و پێداویستی‌یه‌کانی‌و که‌سایه‌تی فـره جـۆر ده‌بـێ، هـه‌ر هـه‌مان کاتیشـدایه‌ك قـه‌واره‌ی ته‌واوکاریه‌و ڕه‌هـه‌ندی مـادی‌و گیـانی خـۆی هه‌یـه، کـه جیانابنـه‌وه‌و دژ بـه یـه‌کیش نـابن، وه هیـچ بوارێـك بـۆ به‌دیـهاتنی ئاسـووده‌یی‌و به‌ختـه‌وه‌ری‌و هاوسـه‌نگی مـرۆڤ لـه‌م دونیایـه‌دا نامێنێتـه‌وه ئه‌گـه‌ر هـاتوو لایـه‌ك لـه‌لاکانی پشـت گـوێ خـران یـاخود به‌خراپی بـه‌کار هێـنران.

بـه‌پێی ئـه‌م بـیرو بـۆ چـوون‌و تێڕوانینـه، ئـه‌وا ژیـانی دونیـای سـنووورداری کـات دیـاری کـراوی مـرۆڤ، ڕه‌هـه‌ندێکی ئه‌به‌دی فراوانـی ده‌بێـت .. مردنیـش کۆتـایی بـوون نی‌یـه، ژیـانی مرۆڤیـش کـه هێنراوه‌تـه سـه‌ر شـانۆی بـوون لـه‌م گه‌ردوونـه‌دا بـۆ خواسـت‌و مه‌به‌سـتێکه، وویسـتی مـرۆڤ لـه‌م ژیانـه‌دا جێگـه‌ی تاقی‌کردنه‌وه‌یـه، دوای مردنیـش جگـه لـه بـه‌ره‌نجامی جۆریـه‌تی بوونـی دونیـای شـتێکی‌تر نیـه، جێگـــه‌ی مرۆڤیـش لـه ئه‌بـه‌دی‌داو لـه‌ژیانێکی‌تردا جـۆری ژیانه‌کـه‌ی‌و مه‌به‌سـته‌که‌ی‌و کـانزای ویسـته‌که‌ی لـه‌م ژیـانی دونیایـه‌دا بـۆی دیـاری ده‌کـات‌و ئـه‌وی بـه‌پێی ئێره‌یـه‌تی.. ئـه‌م بـۆ چـوون‌و بیرکردنه‌وه‌یـه بـۆ ژیـان ئه‌وه‌یـه کـه له‌گـه‌ڵ ژیـانی مرۆڤـدا ده‌گونجـێ‌و ئاوێنـه‌ی حه‌قیقـه‌تی پێکهاتـه‌و ڕێـڕه‌و و قـه‌واره‌ی فیتره‌تـه تیـایدا.. نـه هاوسـه‌نگی‌و نـه‌ئارامی‌و نـه ئاشـتی ئاسایشـی ده‌روونـی پـه‌یدا نـابن ئه‌گـه‌ر ژیـانی مـرۆڤ ته‌نـها ئـه‌نجام دان‌و بـه دیـهاتنی هه‌ڵپـه‌و ئـاره‌زووه دونیایی‌یـه‌کان بهێنێتـه‌دی، کـه بـه‌وه‌یش ده‌بێتـه ئـاژه‌ڵێکی کێـوی‌و هـه‌وڵی پاراسـتنی ژیـانێکی کـاتی‌و بـڕاوه ده‌دات، کـه به‌ڕاسـتی نـازانێ ئـه‌و ژیانـه چـۆن هـاتووه‌و وه نـازانێت بۆچـی هـاتووه‌و، وه نـازانێت بـۆ کـوێ ده‌چـێ‌و چـۆن کۆتـایی پـێ‌دێـت.. ئـه‌و ته‌نـها ئـه‌وه‌نده هه‌سـت پـێ‌ده‌کـات کـه ئـه‌و ژیانـه دێـت‌و ده‌چێـت، بـه‌ڵام عـه‌قڵی سـنووورداری لـه کارکـه‌وتووی نـاتوانێت بـه ڕاسـتی بزانێـت ئـه‌و مه‌به‌سـته چی‌یـه لـه‌پێناوی‌دا هـه‌وڵی بـۆ ده‌دات، وه ئـه‌و خواسـته چی‌یه کـه لـه‌بوونی‌دا هه‌یـه لـه‌م سـه‌ر زه‌وی‌یـه‌دا.

ژیانی مرۆیی دونیای‌دونیایی تاکە کەسی بە هەموو ئەو ڕووداوو دەردوبەڵاو هەڵگێڕو داگێڕکەوتن‌و تاقی‌کردنەوە بەچاکەو خراپەو خۆشی‌و ناخۆشی ناگونجێت جێی ڕەزای بێت‌و قەناعەتی پێبکات‌و دامەزرێت، ئەگەر ڕەهەندێکی لەپاش خۆی بۆ نەبێت کە ڕاستی کاتەوەو ڕێکی‌بخات‌و پاداشت یاخود تۆڵەی لەسەر وەربگرێ، ئەگەر نا ئەوە چ جۆرە ژیانێکی مرۆیی‌یە، بێگومان ژیانی ئاژەڵ باشتروبەختەوەرتر دەبێت لەو، چونکە ئاژەڵ هەست‌و ویژدانی نیە بەهۆیانەوە بگەڕێ بۆ واتاکانی دادپەروەری‌و ئینساف لەم ژیانەدا.

بۆ چوونی ئیسلامی بۆ ڕەهەندی قیامەتی ژیانی مرۆڤایەتی، بۆ چوونێکی گرنگە لە هاوسەنگ بوونی‌دا وە لەدارشتن‌و چەسپاندنی پایەکانی چاکەو ڕاستی‌و بەختیاری دەروونی‌دا، وە لە بەرگری‌کردنی ستەم‌و زۆرداری‌و گەندەڵی‌دا.

ژیانی موسڵمانێتی ڕاستەقینەی هەمووی ڕەزامەندی‌و ڕازی بوون‌و قایل بوون‌و بێ گلەیی‌و دامەزراوی‌یە، بەهۆی یەکپارچەیی‌و تەواوکاری‌و ڕەهەندە قیامەتی‌یەکەیەوە، ژیانی دونیایی مرۆڤ بەهەموو لایەکانیەوە مەبەستی خێری تێدایە، وە ئەو کۆسپانەش کەهەن ڕەهەندی خێریان هەیە بەپێی خواست‌و ئاڕاستەکردنەکەیان، وە کۆشش‌وماندووبوونەکەی هەرگیز وون نابێ، ئارام‌و سوپاسگوزاری لەدونیادا، پاداشت وەرگرتنەوەش لەقیامەت‌و ژیانەکەی‌تردا، متمانەو بڕواو پشت بەستنی تەواو بەخواو بەداد پەروەری خواو بەکار بەجێی خوا، ئەمە توێشوو هەگبەی موسڵمانی ڕاستەقینەیە لە کاروانی ژیاندا.

وە لە بەرەو ڕووبوونەوەی تەنگانەکانی‌و کۆسپەکانی‌و تاقی کردنەوەکانیدا.. ئەوە موسڵمانە خاوەنی دەروونێکی ڕازی‌و قایل‌و سوپاس گوزارەو لەهەموو حاڵ‌و بارێکدا ئیشی خۆی دەکات، ئەمەش چەنکە ژیانی دونیایی کە لایەنی یەکتر تەواوکەری هەیەو مەبەستی خێری تیایە، هەروەك چۆن ڕەهەندی ئەبەدی‌و قیامەتی‌و هیوا پێبەستووی هەیە.

شتێکی گران نی‌یە، لەو تەواوی‌و پێچ لێدان‌و دواکەوتن‌و ڕووخان‌و ناڕەحەتیانە بگەین کە کار لەو کەسایەتی‌یەو لە سلوك‌و لە تەندروستی دەروونی‌و کۆمەڵایەتی تاك‌و کۆمەڵگای موسڵمان دەکات، ئەگەر هاتوو فیکری یاخود سلوکی‌و قەوارەکەی تووشی ئەو شتانە هاتن کە کاریگەرییان لەسەر

بیروبۆچوونی کرد، سەبارەت بە ڕەهەندی قیامەتی و پەیوەندی پێوەی شوێنی ئەو لە تێگەیشتنی دا بەو قیامەتە.

ئەم ڕەهەندە قیامەتی یە، تەنها مەسەلەیەکی ناوەندی و سادەنیە، بەڵکو زۆر قووڵەو کاریگەری و شوێنکاری دەروونی و ماددی و ژیاری بەسەر تاکو بەسەر کۆمەڵگای موسڵمانەوە هەیە.

ئیسلام لە چەمکی یەکیەتی و یەکبووندا لەقەوارەی مرۆڤدا، هیچ ناکۆکیەك لەنێوان ڕەهەندی تاکی و ڕەهەندی کۆمەڵی لەژیانی مرۆڤدا نابینێ، هەردووکیان ڕاستی یەکن لەقەوارەو پێداویستی کانیدا، هەر یەکێکیان ڕۆڵو کاریگەری خۆی هەیە، ئەو دوو ڕەهەندیش لەژیانی ئەو کەسەدا ڕستیەکی ماددی و مەعنەویشن. کۆمەڵی مرۆیی لەڕووی واتاو ماددەو بەپێی تاکەکانی بوونی نابێت، بەهەمان شێوە تاکیش بەبێ کۆمەڵی مرۆیی بوونی نابێت.. بوونی مرۆیی لەڕووی ماددی و مەعنەوی یەوە بریتی یە لە بەرەنجامی ئەم دوو ڕەهەندە، مرۆڤیش بوویە کە بەوشتانە جیا دەبێتەوە کە بریتین لەبەرهەمی ئەو فیترەتو عەقڵو هەست پێکردن و وویژدان و وویستەی کە خوا پێی بەخشیوە، لەگەڵ ئەو سنووورداری و لاوازی و پێداویستیانەی کە هەیەتی ـــ لەڕێگەی چاودێری و سەرپەرشتی کۆمەڵی مرۆیی یەوە بۆ پێداویستی یە ماددی و مەعنەویەکانی تاکو بەوەی پێشکەشی دەکات لەفێرکردن و ڕاهێنان و چاودێری، تاك پێدەگاتو گەشەدەکاتو دەگاتە پێویستی یەکانی و پایەکانی بوونی و بەردەوام بوونی و، بەرهەمی کۆششو ماندووبوونی خۆی دەچنێتەوە. بەڵام دوای هەموو ئەمانەش بەویستو ویژدان و لێپرسراویەتی خۆیەوە وەکو تاکێك دەمێنێتەوە بەتەنها خۆی و وویستو وویژدانی هەڵگری لێپرسراویەتی بوون و جۆری ئەو بوون و کاریگەری ئەو ببوونەی دەبن لەژیان و کۆمەڵگادا لەبەر ئەوەی تێگەیشتنی ئیسلامی بریتی نی یە لەململانێ، بەڵکو تێ گەیشتنی فیترەتێکە کە قەوارەو هۆکاری مانەوەی خۆی هەیە. هەروەها تێگەیشتنی کۆمەڵە پێداویستی یەکە کە تەرتیباتو ئەحکامی خۆیان هەیە بۆ ئەوەی ژیانیان پێوە دامەزرێت لەسەر چاکەو خێرو چاکسازی، دژ بەلایەن و گەندەڵی، کە پێویستە بەرگری بگرێتو کاریگەریان نەهێڵرێو لەناوببرێ، لە هەرکاتێکدا کە لایەك لەلاکانی ژیانی مرۆڤ تووشی بکات.

ڕەت کردنەوەی چەمکی ململانێ، وەکو بناغەیەك بۆ سیستەمی گەردوون، لەبەرامبەر تێڕوانین بۆ ژیان لە دەسپێکەی یەکبوون و تەواو کاریەوە، بەواتای ئەوە نیە کە ستەم و زۆرداری یاخود گەندەڵی سیستەمی کۆمەڵایەتی قەبوڵ بکرێ.. بەڵکو واتای بونیادنانەوەی ژیان لەسەر بناغەی جێنشینی و چاکە و داد پەروەری دەگەیەنێ.

هەروەها واتای پێویستی نەهێشتنی گەندەڵی و بەرگری لەلادان و بەرپەرچ دانەوەیان دەگەیەنی.

ئەوەی پێویستە تێبینی بکرێت لەکارەکانی ڕاست کردنەوەو بەرگری لە گەندەڵی بریتی‌یە لە جیاوازیکردن لەنێوان ئەوەی کە فەرمانی خوایەو گشتی و بێ پێچ و پەناو جێگیرە، وە ئەوەیش کە ڕاو لێکدانەوەو ئیجتیهادە، ئەوەی لێکدانەوەو ڕاو ئیجتیهادە، بڕیاری کۆتایی لەسەری و دسپلینەکانی(ضوابط) سیستەمی گشتی دەگەڕێنەوە بۆ کۆی ئوممەت(جمهور الامە)و بڕیار بەدەستەکانی و بۆ(اهل الحل والعقد) تیایدا.. ئەویش بەگوێرەی ئەو سیستەمە سیاسی و تەشریعی‌یە دەیخوازێت و خواستەکانی شەریعەت(مقاصد الشریعە) دەست نیشانی دەکات.. ئەمەیش هەروەك هەموو کارێکی‌تر لە کاروبارەکانی سیاسەتی ئوممەت و سیستەمی گشتی و کردارە کۆمەڵیەکانی کە هیچ شتێك و هیچ هەنگاوێك دروست نی‌یە تیایدا بەگوێرەی بڕیارەکانی(شوری)ی ئوممەت نەبێت، وە بەو هۆکارو ئامرازو لێپێچینەوە سیاسی‌یە گونجاوانە نەبێت کە گرنگی دەدات بە ڕەهەندەکانی مەسەلە هەنووکەیی‌یەکان و کاریگەریان و کارەکان بەڕێوەویان و ڕاکان دەردەکات و بەشێوەیەکی گشتگیری پێگەیشتوانەی دانایانە پرس و ڕادەکات و تەعبیر لە قەناعەتی ئوممەت دەکات و دەبێتە جێگەی بەدوادا چوونی و یارمەتی‌دان و پشتگیری لێکردنی..

## ب. خواست و مەبەست لەسیستەمی گەردوون و ژیان:

پێشتر باسی دەسپێکەکانی مەنهەجیەتی ئیسلامیمان کرد سەبارەت بە مەبەستی‌یەتی بوون، وەك دەسپێکێك لە دەسپێکەکانی ئەو مەنهەجیەتە، کە بەرچاو ڕۆشن کەرەوەیە بۆ هەوڵەکانی توێژینەوەی زانستی ئیسلامی لەڕووەکانی زانست و مەعریفەوە بەگشتی، وە دەبێتە فەرزیەتێکی بنەڕەتی لە فەرزیەتەکانی ئەو مەنهەجیەتەو پێکهێنەکانی عەقلیەتی ئیسلامی. بەشێوەیەك بتوانرێت

پارێزگـاری لـەتێڕوانینی زانسـتی ئیسـلامی بکرێـت لەخەڵـەتاندنی تـێڕوانین و کـەمی زانین و لادانی ڕووگە، ئەو کاتـە تـێڕوانینی زانستی ئیسـلامی هەمیشـە بنیـادەبێت بـە فیـترەت و ڕووەو مەبەسـتی ژیـان و بـەنیادنانی سیسـتمی گـەردوون و لـە خـێرو چاکسـازی و ئاوەدانکاری دەچێـت، کـە هیـچ بوارێـك بـۆ گـەندەڵی و لادان و بـەڕەڵایی و ئەفسـانەو بیٚباوەڕی و گومـڕای نەمێنێتـەوە.

﴿ ربنا ما خلقت هذا باطلا سـبحانك ﴾ آل عمـران ١٩١

## ج. بابەتی بوونی حەق و حەقیقەت لە مۆرکی دەروونەکان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتی یە مرۆیی یەکاندا:

فیکـری ئیسـلامی بـە دەسـپێکەکانی و چەمکـە مەنهەجیـەکان لـە یەکتاپەرسـتی و بـڕوا بـەخواو بەخێریـەتی بـوون، پێویسـتی بـە پێشـەکیەکی بنـەڕەتی لـەتێڕوانینی زانسـتی لەهـەر باخچەیـەك لەباخچـەکانی مەعریفـەو زانسـت هەیـە، ئـەم پێشـەکی یە بنەڕەتی یە گشتی یە بریتی یـە لـە دڵنیـابوون لـەوەی کـە حـەق و حەقیقـەت و ڕاسـت و هەڵەو خێرو شەڕ، چەند حەقیقەتێکی بابـەتین و پێویسـتە بزانرێن و هـەوڵ بدرێـت بـۆ ناسینیان لـەژێر تیشکی ئـەوەدا کـە خـوای گـەورە بـە بەدیـهێنراوەکان و بوونـەوەرانی بەخشـیوە لـەمۆرك و سـوننەت و فیـترەت، و بـەپێی ئـەوەش کـە خـوای گـەورە بـەوەحی ناردوویـەتی بـۆ مـرۆڤ و ڕێنمونـی کـردووە بـۆی لـە مەبەسـتەکان و پێوانـە و ئـەندازەکان کـە پەیامـەکانی پێدابـەزیوەو پێغەمبەرایـەتی پێ نـێردراوە.

لـەم ڕوانگەیـەوە عـەقڵی موسـڵمان عـەقڵێکی زانسـتیانەیەو دەکۆشـێ بـۆ زانـین و زانیـاری بـەپێی مەرجـەکانی، وە بـەپێی بەخشـینە بابەتیـەکانی، نـەك لەسـەر بناغـەکانی ئارەزوو و بیٚسەرەو بەرەیی و گومڕایی.. هـەر بۆیـە ڕەنجی بەزایـە نـاچێ و ڕێگەیشی لێوون نـابێ..

﴿ ولـو اتبـع الحـق اهواءهـم لفسـدت السـموات والارض ومـن فيـهن ﴾ المؤمنـون: ٧٦

﴿ ومن اضل ممن اتبع هواه بغير هدى مـن الله ﴾ القصـص: ٥٠

﴿ افرأيت من اتخذ الهه هواه واضله الله علـى علـم ﴾ الجاثيـه: ٢٣

ئەگـەر بەشـە کەمـەکانی توێژینـەوە لەزانسـتە سروشـتی و تەکنیکیـەکان عـەقڵی مـاددی و هاوچـەرخ ناچـار بکـەن پەیوەسـت بـێ بەهـەندێ لایـەنی زانسـتی و

بابەتی‌یەوە لە مەیدانی زانستانەدا، ئەوا ئەم عەقڵە لە مەیدانی زانستە مرۆیی‌و کۆمەڵایەتی‌یەکاندا وون دەبیٚ‌و زۆرکات دەگۆڕێت بۆ شەیتانێکی تا ئەو پەڕ گەندەڵ‌و خراپ. ناگەڕێت بەشوێن حەقیقەتی بابەتی‌و حەقی بابەتی‌دا لەقەوارەی مرۆڤ‌و فیترەت‌و پەیوەندی‌یەکانی‌و مەبەستەکانی سیستەمە کۆمەڵایەتی‌یەکەی‌و ئەوەی حەق‌و حەقیقەتی بابەتی لەم پەیوەندیەدا دەیخوازێت ـــ بەڵکو لەدەسپێکی هەواو ئارەزوو هەڵپەو نەناسینی خواست‌و مەبەستەوە هەنگاو دەنێت‌و لەوێوە تاماشا دەکات‌و شتەکان هەڵدەبژێری‌و بیانوو دەدۆزێتەوەو گومڕا دەبێت هەوڵدەدات بەناوی زانست‌و بەناوی توێژینەوەی زانستی‌یەوە بیانوو بۆ لادانەکانی بهێنێتەوە، هەر بۆیە دەبینین چەندان قوتابخانە ئاشکرا دەکرێت‌و چەندانی‌تریش دەڕووخێن‌و دەکەون، چەندان بیردۆزە ڕادەگەیەنریٚ‌و چەندانی‌تریش لەکار دەکەون، کۆمەڵگاش لەواق‌و وڕمان‌و خەفەت‌و پەل کوتان‌و دڵە ڕاوکیٚ‌دایە، هیچ دەرفەتێک‌و دەرگایەک نابینیٚ بۆ ڕزگار بوون لە دەرگاکانی ژیانی‌و پچڕان‌و درانی بەرگی مانەوەی بۆ نەهێشتنی بلاوبوونەوەی تاوان‌و خراپەو نەخۆشی‌یەکانی‌و هیچ وەڵامێکی چارە سازو قەناعەت پیٚکەریشی چنگ ناکەوێت.

توێژینەوەی زانستی کۆمەڵایەتی ماددی کە لەڕێنمونی‌و ئاراستەکردنی خواییدا هیچ بەشی نی‌یە، دەبینین کە لەباتی ئەوەی دان بنیٚ بەوەدا کە لەگرنگترین هۆیەکانی نەتوانین‌و کەم‌و کوڕی خۆی ئەوەیە کە بەڵگەی کاری هەمەکی(العمل الکلی) ڕاست‌و ڕووکردنی ساغ وون کردووەو بەلۆژیکێکی شکاو هەستێکی کەم‌و بۆ شەوەو لەدەسپێکی هەواو ئارەزوو حەزە کوێرەکانیەوە هەنگاو هەڵدەهێنیٚ ـ لەبەر ئەوە دەبینین ئاڕەزایە بەرامبەر دیراسە کۆمەڵایەتیەکان‌و بەقورسی دەزانیٚ‌و بەلایەوە وایە کە بوارەکانی ئاڵۆزەو ئەو فاکتەرانەی وەریان دەگریٚ فرە جۆرن، ئەمەیش وەکو تەنها بیانویەک بۆ هیچی‌و ڕوخاوی توێژینەوەکەی‌و گومڕابوونی هەوڵەکانی‌و، ژێر کەوتنی مەنهەجی دیراسەکردنی‌و شیبوونەوەی پۆشاکی کۆمەڵگاکانی.

لە ڕاستی‌دا قورسی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی لە هەڵاوسان دەبێت‌و هەوڵەکانی کەم دەبنەوەو، بەرهەمەکانی گەندەڵ دەبن، ئەگەر هاتوو ڕووگەکەی گومڕو مەبەستەکەی هەڵەبوو، دسپلینەکانی جەرەکەت کردن‌و ڕێگە بڕینی وون کردبوو. لەم حاڵەتەدا هەر دەبیٚ لە کۆمەڵگاکانیدا ماددیەت تەشەنە بکات‌و

گەلاکانی وەکو گەلانی ڕابردووبن کەگومڕابوون و شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتن و لادان و گەندەڵی بەشێوەیەکی گشتی تیایاندا بڵاوبوویەوە.

ئەو زانستە کۆمەڵایەتی یەی کە بەتەنها پشت بەعەقڵی مرۆڤ دەبەستێت وەکو سەرچاوەیەك بۆ مەعریفەو ئاراستەکەر بۆ توێژینەوە، هەر دەبێت گومڕابێت و لابدات، چونکە ئەو بەتەنها ناتوانێت دەرکی حەقیقەتی بابەتی تیۆرەتەسەل و مەبەستی بابەتی خواستراو لە دەروون و مۆرکە مرۆیی یەکاندا بکات. هەروەها ناتوانێت دەرکی هەستی فیترەتی ساغ بکات سەبارەت بەو کاروبارانەی کە هەمەکیە خواوەندیەکان(کلیات ربانیە)ن و لەتایبەتمەندی جیهانی نادیارن.

ڕێنمونی وەحی و پەیامە خوایی یەکان بۆ تەواو کردنی ئامرازەکانی عەقڵی مرۆڤ و لۆژیکی سنوورداری و دەرك کردن بە بچووك و کەمی، کارێکی زەروریە، تاوەکو بتوانێت توێشوو تفاقی خۆی پێ تەواو بکات، شتە پاك و پیرۆزەکان حەرام نەکات و شتە پیسەکانیش حەلاڵ نەکات و خواستی خراپەی نەبێت و هەوڵی گەندەڵی نەدات.

خەلفیەتی مەعریفەی ڕۆژئاوایی کە هیچ پشتگیریەکی لەزانستی خوایی نی یە،بەهۆی ئەو دەستکاری و شێواندنەی کە تووشی ئاین و بەرنامەکانیان هات و متمانەیان پێیان نەما. ئەمانە هەموو تەفسیری ئەم بارە زانستی یە گومڕایە کەمو کرچەمان بۆ دەکەن کە لەبوارەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی دا هەیە، وە تەفسیری بەرەو دوا گەڕانەوەی(ارهاصات)ی فیترەتی ساغمان بۆ دەکات کە لەڕۆژ ئاواو لەسەردەمی ڕێنیسانس()دا بەناوی قوتابخانەی یاسای سروشتی ناسرابوو..

ئەم خەلفیەتە مەعریفیە چەمکەکانی فیترە لە بابەتیەتی حەقیقەت و بابەتیەتی خواست و مەبەست لەژیان و کۆمەڵگادا وەرگرت، بەڵام لەگەشەکردندا وەستاو بەرەو دوا گەڕایەوە، ئەمەیش کاتێك هیچ پاڵپشتێکی زەروری بۆ گەشەکردنی خۆی دەست نەکەوت لەسەرچاوەی زانستی هەمەکی کە بریتی یە لەپەیامی خوایی ڕاست و دروست و متمانە پێکراوەکان.

ئەویش لەبەرئەوەی کە ئەو پەیامە خوایی یانە کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی لەسەر وەستاوە، دەستکاری کراوەو پاك و بێگەردی و باوەڕپێکردنی لەباربراوە - لەزۆر لایەنەوەگۆڕاوە بۆ کۆسپ و تەگەرەو سەرچاوەی ئەفسانەو گومڕایی یە، لەجیاتی ئەوەی سەرچاوەی هیدایەت و ڕێنمونی بێت..

لەگەڵ ئەو لەخۆبایی بوونەی کە تووشی ڕۆژئاواو ژیاری هاوچەرخ بووە لەئەنجامی ئەو سەرکەوتنانەی کە بەدەستی هێناون، بەهۆی وەرگرتنی ئەو مەعریفەو مەنهەج و دسپلینە ئەخلاقی و خێزانیانەی کە لەکانیاوی ژیاری ئیسلامی یەوە بۆی هاتووەو پاشان پاشی سەرکەوتن لێی دوور کەوتونەتەوە..

توێژینەوەی زانستی کۆمەڵایەتی ئیسلامی بە متمانەوە هەنگاو دەنێت بەرەو تێڕوانین لەژیان و بەدیهێنراوەکان و بوونەوەران و فیترەتەکان و مۆرکەکان و لەهەموو شتێك، بەشوێن حەقیقەتی بابەتی دا دەگەڕێ، لەژێر ڕێنمونی وەحی و خواست و مەبەست و بەهاو هەمەکی یە کانیەوە، دەکۆشێ بۆ دۆزینەوەی شوێنەواری ئەو حەقیقەتە . بەمەیش هەوڵەکانی مرۆڤ گومڕانابن و بەرەو لادان ناچن و ناخزێن بەرەو هەواو ئارەزوو گومڕایی یەکان، بەناوی شوێن کەوتن و ئازادی و پێشکەوتن و جگە لەمانە لە ووشەی بۆشی بریقەدار، کە خەڵکی تەنها ساختەکردن و بەنج کردن و گومڕاکردنیان تیایاندا دەست دەکەوێ.

کەواتە جێی سەر سوڕمان نیە کە ژیاری ماددی هاوچەرخ نەیتوانیوە اە کێلگەی مرۆیی و کۆمەڵایەتی دا وەکو کێلگەی تەکنیکی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ.. وە جێی سەر سوڕمانیش نیە کە بەرامبەر ئەو پێشکەوتن و دەسکەوتە تەکنیکیانەدا سەرنەکەوتن و نەتوانایی هەبێ لەبونیادنانی ژیان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و خێزانی یە مرۆیی یەکانداو، کۆمەڵگاکانی ئەو ژیارە لە دەریای ترس و دڵە ڕاوکێ و ململانێ و پەل کوتانێکدا نەقم ببن کە هەڕەشە لەقەوارەی بکات، ئەمیش بەهۆی دەستەوسانی زانستەکان و فەلسەفەکانی ڕۆژئاوا لەوەی بتوانن بچن بەرەو مەبەست و حەقیقەتی هەمەکی بابەتیانە لەقەوارەی مرۆڤ و مۆرکی کەسەکان، هەروەك ئەوەی کەخوا ئەیەوێت وابێت، فاکتەری هیدایەت دان و چاکسازی و ڕێنمونی بێت نەك فاکتەری خۆ بەزل زانی و گەندەڵی و گومڕایی..

بابەتی بوونی حەق و حەقیقەت، چەمکێکی حەرەکی زیندووە، وادەکات لەڕەگەزەکان و پەیوەندیەکان کە فیترەت و یاساو مۆرك و بەهاکان حوکمیان بکات، جیاوازی بکات لەنێوان ئەوەی کە ڕاست و حەق و دروستە، لەگەڵ ئەوەی کە گەندەڵ و خراپەو تیاچوونە، بەبێ ئاوڕدانەوە بەلای ئەو خەیاڵە پڕو پووچ و نەزۆك و گومڕایانەی هەندێ عەقڵ نەخۆش، کە بەناوی زانست و توێژینەوەی زانستی یەوە دەنگی بەرزدەکاتەوە ودەیخاتە بواری گفتوگۆ و بەیەکداهەڵگوتنی گومڕاکارانە

بەمەبەستی سووك كردن و هێنانەخوارەوەی پلەی پێوانە بنەڕەتییەكانی ژیان و كۆمەڵگاكان و شارستانییەكان، و لەناوبردنی ئەو پێوانە و پێودانگە پیرۆز و بەهاو بنەما ڕاست و دروستانە تاكو زۆری پێ ناچێت ئەو ژیریانە تووشی پشێوی و قەرەباڵغی وا دێن كەبەرگری بۆ عەقڵی و هێزی بەكاربردنی دەگمەن و نارێك و نموونەكانی لادراوو لادەریان پێناكرێت، ئەو نابەجێیانەش بەهەر ناوو ناوبانگ و بانگەوازێك و هەر شێوە بەكاربردنێكی سەرەتایی‌یانەی كەم و دابڕاو لەتاریكایی دارستانەكان، یان لەسەر لوتكەی چیاكان یان لەنزمایی چاڵاوگەكاندا بن. ناتوانێ ڕێ نیشاندەرێك، یان بەڵگەیەك بدۆزێتەوە لەسەر دەرنەكردنی ڕاست و ڕاستی‌و دروستی و چاكەو لەسەربوونی دەگمەنی‌ی لەڕێ دەرچوو و خراپە و لادان تەنانەت بەقسەش؛ وە گۆڕیین لەناوەكاندا، وەدەستكاری كردن و شێواندن لەرەخنە و سیفاتەكاندا، وەك ئەوەی كەمرۆڤایەتی بكاتە ئاستێك ئەم لادانە دەگمەنانەی لێ ببێتە پێوانە و پێوەر لەهەست و ڕەوشت و لێكدانەوەی، و دەربڕینی زایندەیی مرۆڤ و دیدی شارستانییەكەی، ئەم بیرو پرۆگرامە كوت كوێر و لادراوەهیچی بۆنامێنێتەوە و هیچی دەست ناكەوێ جگە لە خواروخێچی تر و گومڕایی تر و تێكچوون و تاوان و لادان، كە كۆمەڵگاكانی ڕێژئاوا لەقوڵاییەكانیدا مەلە دەكەن، هەرچی پەیوەندی كۆمەڵایەتی و خێزانی‌یە نامێنێ و هەروەها بەها ڕەوشتییە ژیارییەكان كە ئەم كۆمەڵگایانەیان لەسەر دامەزرێنراوە لەئەنجامی كاریگەری وشوێن دەستی زایندەیی و نامە ئاسمانییەكان و ژیاری ئیسلامی نامێنن و تیادەچن.

گرنگترین شت كە لێكۆڵینەوەی زانستی كۆمەڵناسی ئیسلامی لەبەرامبەرە نا ئیسلامییەكەی جیادەكاتەوە، ئەوەیكە لێكۆڵینەوەیەكی بوێرانە و دلێرانەیە لەئاراستەكردن و ئاوات و مەبەستدا، گومڕا نابێ و لاروێرو خواروخێچ و لادراو نابێت، بەكاریگەری وورد و بچووك و كەم بایەخەكان و ئارەزووەكان لەڕێگەی ڕاستی خۆی لانادات و لانادرێت، لەهەموو بارێكدا و هەرچۆنێك بێ، ئەو بۆ مەبەستەكانی خێر و قازانج ئاراستەی شوێنكەوتووانی دەكات، یەكبوون و پێكەوە گرێدان و تەواوكاری و دامەزراندن دێنێتە بوون، لەتوێیەكانی خۆیدا و لەدروستبوونیدا یاسای كاروانەكەی هەڵگرتووە لەگەڵ یاساكانی ئاگاداركردنەوەی پێش كارەسات و ڕووداوەكان، ڕێگەی خۆی دەبڕێ لەمتمانە و بەرچاوڕۆشنی دا

بەبێ هەڵەی زل و زۆر و زەق و بێ هەوڵی نەزۆکانە و بێخێر، بەناوی زانست و زانیاری و تاقیکردنەوەوە تاکو دەستی خەڵکی پێ ببڕێت. ئەوەش کە تێکچوون و بەرەڵایەتی و دەست درێژکاری بێت و ستەم و زیادەڕەوی و خۆبەزل زانین بێت، لەپێوەری بەهاکان و بنەماکان و بارەڕەگاندا لەهەموو بار و کاتێک و سەردەمێکدا هەروا دەمێنێتەوە بەتێکچوویی و دوژمنایەتی و ستەم و زیادەڕەوی و بەساخیبوون و خۆبەزل زانینەوە هەرچەندە کالای نازناوی زانست و درۆ و فێڵی گفتوگۆیانەی لەبەرکرێت یان لەبەرکرابێت.

# لە پێشەکییەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا

ئەگەر پەیڕەوگەرایی یەکی گشتیو پێشەکی یەکی گشتی بۆدیدی ئیسلامی لەبوارەکانی مەعریفەو هەموایەتی مەعریفەدا هەبێت، کۆمەڵایەتی بن یان تەکنەلۆژی، ئەوا بۆ هەریەکە لەو بوارانەش پێشەکیو هەموانەییو دۆزی پەیڕەو گەراییەکی تایبەت بەو بوارنە هەیە. لەسەر توێژەری موسڵمان تایبەتمەندێتی یەکانی هەریەکە لەو بوارانە بزانێتو دەست نیشانیان بکات تنا ئەو بوارە لەبوارەکانی تری مەعریفەجیا بکاتەوەو بەپێی پێویستی یەکانی ئەنجامی بدات، نەبادا ڕۆڵەکان تێکەڵ بنو هەوڵەکان بەفیڕۆ بچێت.

لە سەرەتاوە وا دەبینن کە دەبێت توێژینەوە زانستییە گەشەکردووەکان جیاکەرەوەی تێدابێت، هەروەها مۆتیڤەکانی ئەم لێک جیاکردنەوەیە ڕوون بکرێتەوە تاچەند مەودای بینیەی ئیسلامی لە خۆگرتووە، وە تاچەندێك وەڵامدانەوەی پێویستیە گرنگەکانەو هاوکات لەگەڵ ئەمانەشدا ئەوسوودو بەربوومانەی لەتوێی توێژینەوەکەیدا پێشکەش دەکات. بێ گومان ئەم پۆلین کردنو جیاکردنەوەیەش بەپێی گەشەکردنی باسو توێژینەوە کەشان بەشانی گەشەکردنی کۆمەڵگەو تواناو پێداویستیو ململانێکان گەشەدەکات.

پێویستە بەئاگاو وریا بین سەبارەت بە سروشتی کۆمەڵە بوارێكو پەیڕەو و ئامرازەکانیان، لەنێو چوارچێوەی پرۆگرامگەرایی هەموایەتی مەعریفەدا لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە، ئەو بوارانەش دەقەکانی کتابو سوننەتو پاراستنیان دەگرنەوە، هەروەها بوارەکانی ئامانجو مەبەستو باش حاڵیبوون لەسروشوپەیامی ئیسلامو بواری تێگەیشتن. لەسروشتو فطرەی مرۆییو کۆمەڵایەتیو سەلامەتی مامەڵە لەگەڵ کردنیانو ئاڕاستەکردنیان بەرەو ئامانجە خێرییەکانی، لەگەڵ بوارەکانی سوونەتە گەردونییەکان لەبوونەوەرو ماددەکانداو باش بەکارهێنانو سوود لێوەرگرتنیان.

سروشتی دەبێت کە هەر یەك لەم بوارانە لقێکی لێ بێتەوە لەبارە جیاکانی زانستدا، لەکۆتاییشدا تەواوکەری یەکدی دەبن بۆ ئەوەی زانستەکانی کتابو سوننەتو ئامانجو مەبەستەکانو زانستەکانی تر وەکو توێژینەوەی فیطرەی کۆمەڵایەتیو، زانستەکانی فیطرەی فیزیاییو ماددیو تەکنەلۆژیو، زانستەکانی

ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیو، زانستەکانی هونەرە ماددیو مەعنەویو ئەدەبیو جوان کاری یەکانیان لەسەر بنیات بنرێن.

هەر لەسەرەتای کاروانی مەعریفەی ئیسلامیو هەوڵەکانیەوە بۆ بنیاتنانێکی زانستیانەی گشتگیر، پێویستە یەکەمینیو(اولویە) بایەخی ئەو بوارە ڕوون بکەینەوە کە لەمەعریفەی خۆراوای هاوچەرخدا پێی دەگوترێت (زانستە سلوکی یەکان)، کە زانستی سایکۆلۆجیو کۆمەڵناسیو مرۆڤ ناسی دەگرێتەوە. گرنگە دەست بکەین بە ئیسلامیکردنی ئەو بوارەو دۆزە گرنگەکانی لەڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە پێشکەش بکەین، چونکە ئەم زانستانەن کە لەپرۆگرامی ڕۆشنبیرو توێژەرانی ئەمڕۆدا لەبواری توێژینەوەکانیان سەبارەت بە مۆرکەکانو شتەکانو فطرەی مرۆییو کۆمەڵایەتیو چەمکی مرۆڤو گریمانە[1] بنەڕەتی یەکان لەمەڕ سروشتیو ڕوکارو ئاڕاستەو پێداویستییەکانی ڕەنگیان داوەتەوە ئەم بوارە زانستیو کۆمەڵایەتیو مرۆییو فەلسەفی یانەش دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم گریمانەو ڕوکارانەوە.

ئیسلامی یەتی زانستە کۆمەڵایەتیو مرۆیی یەکان وەك پەروەردەو ڕامیاریو ئابوریو زانستی ئیداری ڕاگەیاندنو فەلسەفەی تێکڕای ئەم زانستانەش، کۆمەڵە بوارێکن لەسەر گریمانەی زانستە سلوکیەکانو ئەنجامی توێژینەوەو چەمکە تایبەتییەکانیان سەبارەت بەسروشتی مرۆڤو واتای بوونیو پێداویستییەکانیو شێوازەکانی ئاکارو هەڵسوکەوتەکانی بنیات نراون. جا ئەگەر بڕیار هەر لەسەرەتاوە لەسەر ئیسلامی یەتی ئەو چەمكو گریمانانەو بنەماکانی ڕوانگەی ئیسلامی نەدرێت تیایاندا ئەوا هیچ ڕێگەیەکی تر نامێنێتەوە بۆ ئیسلامییەتێکی بەجێو ڕاستو دروستی هیچ کام لەو زانستانە،و بێگومان توێژەریش دەکەوێتە ناو دژواریو خلیسکانی واتاو چەمکەکانو کۆسپ دێتە ڕێی ڕاوێژ کردنو چارەسازی یەوە.

هەوڵی ئیسلامیکردنی زانستە کۆمەڵایەتی یە جۆراوجۆرەکان وەك مەرجێکی پێشینە لەسەر سەلامەتی لێکدانەوەی توێژەران دەوەستێتەوە سەبارەت بە فطرەتو سروشتی مرۆڤایەتیو بزاوتنی پەیوەندی یە مرۆیی یەکان، ئەم کردارەش لەبواری زانستە سلوکی یەکاندا خۆی دەبینێتەوە ئیسلامیکردنەکەی هەنگاوێکی سەرەتاییو بنەڕەتی گرنگە بۆ ئیسلامییەتی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تر وەك

(١) گریمانە: الفرضیات

پەروەردەو رامیاری و ئابوری. خۆئەگەر کارکردن بۆ بە ئیسلامی‌کردنی بوارەکانی پەروەردەو ڕێکخستنی سیاسی و ئابوری یەکێك بێت لەکارە یەکەمینەکانی نەتەوە، ئەوا بە ئیسلامی‌کردنی زانستە سلوکی‌یەکان هەنگاوێکە بۆ سەرخستنی ئەو هەولانە. وە(اولويات)ەکانیشی لەسەر ئەو(اولويات) گرنگی‌یانە بەندە.

بۆ گەیشتن بە ئامانج سەبارەت بە ئیسلامی‌کردنی ئەم بوارو زانستانە ئەوا بێگومان پێویستە پرۆگرام و سەنتەرو بەشی تایبەتی بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی ئەم بوارانە دابنرێت تا زاناو بیریارە موسڵمانەکان بینیەیەکی ئیسلامی‌یانەی ڕاست و دروستی تیادا بەرجەستە بکەن.

## ١ـ ئیسلامییەت و زانستی پەروەردە:

لە توێی توێژینەوەو گەڕانمان بەدوای دەرچەو چارەسەردا، پاش ئەوەی کە موسڵمان بەهۆی فروفێڵەوە خەستەو هیلاك بوون،و لەئاستی کێشەی لاوازی و دواکەوتووییاندا دەستەوسان و ناچارمان و کێشەکەش بەشێوەیەکی یاخی مایەوە،و پاش بێ ئومێدبونیان لەزانستخوازی لەبوارەکانی فیزیا، سەربازی، یاساو سیاسەتدا پێشوازییان لەزانستەکانی پەروەردەو ئابوری و کارگێری کردو دواتر پەنایان بۆزانستەکانی ڕاگەیاندنی ئیسلامی (اعلام) برد.

لەئەنجامی ئەو شکست خواردنەی کە بەسەر موسڵماناندا هات لەو هەولّو تێکۆشانەی کە دایان بۆ بە خۆراوایی کردن و نوێ گەری لەڕوانگە یەکی نا ئیسلامی یانەوە کە دەرەنجامەکەی کۆمەڵێك کاردانەوە بوون ڕوویان لە قەوارەی نەتەوە کرد، ئیتر موسڵمانان چاویان برییەوە چەمکی ڕەسەنایەتی و پابەندبوون بە ئیسلامەوە لەژیانی نەتەوەو سستمە کۆمەلایەتی یەکانی‌دا وەك گەڕانێك بۆ خۆ ڕزگار کردن و دۆزینەوەی هێزو توانایەك کە تیایەتی، لەگرنگترین ڕووکارەکانی ئەم ئاڕاستە کردنەش بریتی بوو لەئیسلامی کردنی هەندێ لەزانستە کۆمەلایەتی‌یە کرداری‌یە گرنگەکان وەك ئابوری و ڕاگەیاندن و، هەروەها بنیاتنانی بەشەکان و سەنتەرەکانی توێژینەوەی زانستی کە خزمەت بەو ئامانج و مەبەستە بکە

بێ گومان لەبنەڕەتدا ئامانجی ئەم هەولّو تێکۆشانانە ئامانجێکی ڕاست و دروستە، بەلام گرنگە ئەوەش بزانین کە ئەم دوو بوارە هەردووکیان لە بواری ئامرازو هۆکارەکاندان سەرەڕای ئەوەی کە چاکسازی ئەو دوو بوارەش گرنگە و ژیانی ئیسلامیش لەڕوانگە یەکی ئیسلامیانەوە بەبێ بوونی ئەو دوو بوارە ڕاست و

دروست نابێت، بەڵام هەر هەوڵێك لەو دوو بوارەدا بدرێ ئەوا كۆمەڵگەی موسڵمان بەروبومەكەی نابینێتەوە ئەگەر بەشێوەیەكی سەركەوتوو پەروەردەی تاكی موسڵمان نەكرێتو پێكهاتەی دەروونیشی ڕاست نەكرێتەوە بۆ ئەوەی ڕێكخستنی كۆمەڵگەی موسڵمانو چاكسازی دامو دەزگا سیاسی یەكانی بە شێوەیەكی توندو تۆكمەو كاریگەر بگرێتە دەست لەپێناو ئامانجو ڕێنمایی یەكاندا.

لەبەر ئەوە پێویستە بواری پەروەردەو توێژینەوە پەروەردەیی یەكانو بواری ڕێكخستنی سیاسیش، لەگەڵ توێژینەوە سیاسی یەكاندا ـ سەرەڕای زانستە سلوكی یەكان ـ بایەخێكی زۆریان پێ بدرێ لەلایەن موسڵمانانەوە. ئەو بایەخ پێ دانەش بەوە دێتەدی كە كۆڕو كۆنگرەی زانستیو پرۆگرامو سەنتەری توێژینەوەی زانستیو لێكۆڵینەوەی ئەكادیمیو بەشەكانیان بەر پابكرێت.

وە لەوانەیە ئەوەش بەسوودبێت لەكاتێكدا ئێمە گەیشتوینەتە ئەم قۆناغە چاو ببڕینە ئەو ڕاستی‌یەی كە یەكێ لەگرنگترین سیماو نیشانە دیارەكانی كەسێتی ئیسلامی لەم سەردەمانەی دواییدا ئەو جیاوازیو لەیەك چوونانەیە لەنێوان ئیدیعای كادیرو كارایانی نەتەوەو، ئەو شتانەی كە دێتەدیو دەكەوێتە بەر چاو لەوزەو ئاكارو تواناكانیان.

سەرەڕای ئەوەی موسڵمانان قەناعەتێكی دامەزراویان بە ئیسلام هەیەو قەناعەتیان بەوەش هەیە كە نەتەوەی ئیسلامی هەڵگری پەیامی ئیسلامە بۆ هەموو مرۆڤ، وە بنەماكانی ئیسلامو بەهاو وێنا گشتی یەكانی بەرزو پیرۆزە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەتەوەی ئیسلامی نەیتوانیوە نوێنەرایەتی ئیسلام بكات یان لەژیانی ڕۆژانەو دامو دەزگاكانی‌دا بەشێوەیەكی زۆر باش یان هیچ نەبێ باش ڕەنگ پێ بداتەوە، بەڵكو خەریكە قەوارەكەی لەناو قاڵبێكدا خۆی بخواتەوە، بگرە خەریكە ئیسلام لەژیانی خەڵكەكەیدا ببێتە داستانێكی میسالی كە پیایدا هەڵ دەن،و هەر خەون بەو ڕۆژەوە ببینن كە جارێكی تر خۆرە گەرمو گوڕە ڕوناكو ڕۆشنكەرەوە كەی بەسەر خۆیانو مرۆڤایەتیدا هەڵ بێتو ئاسۆیان بۆ ڕوناك بكاتەوە.

تەنانەت مومارەسەی تاكە كەسیو بەرجەستە كردنی ئامانجو بەهاو خەسڵەتو ئاكاری ئیسلامی ڕاستەقینە بە شێوەیەكی باش بەرجەستە نەبووە كە لەژیانێكی موسڵمانانەی تەواو بچێت. بەڵكو زۆربەی ئەمانە بەشێوازێكی ناتەواوو نادروست لەموسڵماناندا هەیەو، ئەوەش بوەتە هۆی دروستكردنی كۆسپو تێك چوون

لەپێکهاتەو نەزانین لەبەڕێوە بردنی کارو باردا، تا وردە وردە ئەو نمونانەش لەتوانا دەکەون و کاریگەریو بەخششیان نامێنێ. زۆر جاریش نمونەی تێک چووی ناکام لەڕەوشی پێویست بۆ کەسێتی یەکی ئیسلامیانەی سەرکەوتوی بەتواناو بەسوود دەکەوێتەوە

لەوانەیە لەم قۆناغی باسکردنەدا سەبارەت بە پەیڕەو گەرایی و(مقدرات)، جەخت کردن لەسەر هەندێ لەو لایەنە بنەڕتیانە کە هاوبەشی دەکەن لە دیاردەی قەیرانی ئیسلامیو جیایی نێوان ئەصلّو ڕەگەزەکەی لەگەڵ ئیدیعاو واقعەکەیدا بە سوودبێت.

ئەگەر کەسێك دەرکی حاڵەتی فکریو ڕوکەشی بواری پەروەردەیی ئیسلامی لەم چاخانەی دوایدا بکات، دەزانێت کە گرفتەکانی پەروەردە لە کۆمەڵگەی موسڵماناندا، ناکرێت چارەسەر بکرێتو بەقووڵیو جورئەتو بە ئارام گرتنو ماندوو بوونی پێویستەوە ڕوو بەڕووی کێشەو دۆزەکانی بووەستێتەوە، مەگەر تەنها لەڕێی پێگەیشتنی زانستێکی پرۆگرام دارو لێکۆڵینەوە یەکی زانستی ڕێکخراو و بەردەوامەوە، نەك لەڕێی سەرنجی هزری کوێرانەی سنوردارەوە.

هەر چەندە سەرنجەکانی هزری ئیسلامی بۆ دۆزەکانی پەروەردەی ئیسلامی، کە ئیسلام هەوڵی بۆ دەداتو پێویستە لەدەروونەکاندا بچێنرێت، مەبەستی چاكو باشمان دەخەنە پێش چاو، بەڵام تێبینی نەبوونی لێکۆڵینەوە یەکی مەنهەجی زانستی لەمەیدانی زانستی سلوکیو هەروەها مرۆڤایەتیو مۆركو چۆنیەتی پێکهاتنیو گەشەسەندنیو قۆناغەکانی گەشەکردنی دەکەین کە کەمتر نیە لەقۆناغەکانی گەشەکردنی جەستەو گەورە بوونیدا، ئەگەر زیاتر وردترو ئاڵۆزترو زۆرتر پێویستی بە دیراسەو تێگەیشتنو چاودێریو بونیادنانو ڕاگرتنو چەسپاندن نەبێت.

لەبەر ئەم ناتەواویو کەمو کورتیە لەچارەسەرکردنی زانستیانەی ڕێکخراو(منظم) بۆ بواری پەروەردەی ئیسلامی، تێبینی ئەوە دەکەین کە چاندنی بەهاو بنەماو بۆ چوونە ئیسلامیە بنەڕەتیەکان لەدەروونی تازە پێگەیشتواندا، بەشێوازێك نیە کە گونجاو بێت لەگەڵ پێداویستی پێکهاتنی دەروونیانو ئەو قۆناغەی پیایدا تێ پەڕ دەبن، بەڵکو لەسەریەك شێوە تەواو دەبێت، ئەو شێوەیەش ئەگەر شتێکی گونجاوی تیابێت ئەوا بۆ ئەو کەسانەیە کە گەیشتونەتە پلەی پێ گەیشتنو کامڵی لەنمونەی نەوەکانی قەبیلە عەرەبەکان، ئەوانەی کە

بونیادی دەروونییان تەواو بووەو پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی گوتارێکیان ئاراستەبکات، کە دەروونیان پێ بگەیێنێو بەو گوتارە سەر ئەنجامی پشت هەڵکردنو خۆ بەزل زانیو دوورکەوتنەوە لەحەق و ڕاستی بخاتە پێش چاویان، لەوانەش سەرانی قورەیش، کە لەسەر دڵ ڕەقیو مل نەدانو خۆ بەزل زانین پێگەیشتبوونو ڕاهاتبوون، لەگەڵ سەرکەشیو خۆویستیو ئارەزوو پەرستییەك کە بەو هەموو ووشکیو زبری یەی شێوازی ژیانی بیابانو(بداوەی) ئەو سەردەمەبوو، هەر لەبەر ئەمەبوو دەنگی سرووش(وحی)و دەنگی پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕوویاندا بەرز بوویەوەو دایچڵەکاندنو هەڕەشەی لێ دەکردنو لەسەر ئەنجامی خۆ بەزل زانیو خراپەو تاوانو دوژمنایەتیو گەندەڵی ئاگاداری دەکردنەوە. هێزی ئەم گوتارەی پێغەمبەر(ﷺ) دەروونی سەرکەشو توندو تیژیانی ڕێکخستو پێی گەیاندن، هەر بۆیە لەکۆمەڵە قەبیلەیەکی بەدەوی دڕندەو سەرکەشەوە، کە چێژیان لەتوندو تیژیو زبری وەردەگرت، گۆڕان بۆ کۆمەڵە قەبیلەو سوپاو کۆمەڵگا یەکی بەهێزی ڕێکخراوی خاوەن پەیامو خاوەن بەهای ژیاریو گەردوونیی باڵا، جیا لەهەموو قەبیلە شەڕخوازو پەلامار دەرەکانو جیا لەشەپۆلی داگیر کاری بەدەوی بەربەریانە کە بەدرێژایی مێژوو هەبوون، لەنموونەی شەپۆلی قەبیلە مەغۆلیەکانو ئەڵمانەکانو جگە لەوانیش لەنموونەی قەبیلە بەدەویە شەڕخوازەکان. قەبیلە عەرەبەکانی چینی یەکەمی ئیسلام بەوە جیا دەکرانەوە کە هێزێکی ڕزگار کەرو هەڵگری پەیامێکی خواییو هەڵگری ژیارێك بوون کە لەسەر داد پەروەریو چاکسازیو ئاوەدانکردنەوە بونیاد نرابوو.

گرنگە لێرەدا تێبینی ئەوە بکەین شێوازی گوتاری قورئانی پیرۆز کە لەڕێی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئاراستەی قەبیلە عەرەبەکانو پیاوانی قورەیش کراوە، لەنموونەی ئەبولەهەبو ئەبوجەهل دەبینن هەر هەمان شێوازی گوتارە بۆ ئامۆژگاریو پەروەردەکردن، لەلایەن زۆرێك لە پەروەرشیارانو بانگخوازانی ئەم سەردەمەوە، ئاراستەی هەموو خەڵکی دەکرێت، بێ ئەوەی جیاوازی حاڵەتی گوێگران لەبەر چاو بگیرێت، نەك هەر ئەمە بەڵکو بەبێ ئاگایی یەوە لەگوتارو ئاراستە کردنی پێویست بۆ ئەوە تازە پێگەیشتووەکانی موسڵمانانیش، کە بە مەبەستی پەروەردەو فێرکاری ئیسلامی هەمان شێواز پیادە دەکەن، هەر چەندە پێداویستی یەکانی منداڵو تازە پێگەیشتووانو پێکهاتنی دەروونیو زیهنیان جیاوازە لە پێداویستی گەورەو پێگەیشتووەکان.

گوتاری کەسێکی پێگەیشتوو(بالغ) لەکاروباری عەقیدەو ئاراستە کردنو پەروەردە کردندا، بەپلەی یەکەم دواندنی عەقلو هۆشە مەبەستەکان هەڵدەسەنگێنیو تاوتوێیان دەکاتو گەشەیان پێ دەدات، ئیمکانیاتو توانا عەقلیو زیهنیەکان رام دەهێنێ، تاوەکو رۆڵی خۆیان رووەو مەبەستی راستو دروست ببینن، بەلام گوتاری منالو تازە پێگەیشتووەکان بە پلەی یەکەم پێکهێنانو پێگەیاندنی مۆرکو سروشتو وزە دەروونی یەکانە، کە لەتاکدا پاشەرۆژ رەنگ دەداتەوە، هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (فخیارکم فی الجاهلیة خیارکم فی الاسلام اذا فقهوا) رواه البخاری بۆیە ئەگەر منداڵ یان نەوجوانێك بە پێگەیاندنێکی بەهێزو کاریگەرانەو ساغەوە گەشەی کرد، ئەوا ئیتر لەهەموو حاڵەتەکانی ژیانیدا لەسەر ئەوە دەمێنێتەوە، ئیتر هەر شارەزاییو روشدی خۆی دەبنە ئاراستەکەری وزەو توانا دەروونییەکان بەرەو مەبەستی چاكو چاکسازی، نەك بەرەو مەبەستی تر.

گوتاری پەروەردەیی ئاراستە کراو(توجیهی) بۆ منال بەپلەی یەکەم بریتییە لەپرۆسەیەکی بنەرەتی پێکهێنانو بنیاتنانی دەروونی. بەلام گوتاری گەورەو پێگەیشتوان پرۆسەیەکی وەعزیو ئاراستەکاری زیهنیو عەقلیە، لێرەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:(أللهم أعز الاسلام بأحب الرجلین الیك، بعمربن الخطاب أو بأبی جهل بن هشام ) رواه احمد فی مسنده والترمذی فی سننه. لەم دوو پیاوەدا سیفاتی هێزو ئازایەتیو نەبەردی بەدی کرد. پێکهاتنو پەروەردەی دەروونیو مەعدەنو جەوهەری دەروونی بەهێزو باش، شتێکە جیایە لەخواستو مەبەستەکان. ئازایەتیو چوونەپێش‌و(اقدام) جیایە لەو مەبەستەی کەتاك ئەو ئازایەتیو چوونە پێشەی بۆ تەوزیف دەکات. بەهەمان شێوە دڵسۆزیو راستگۆییو ئارام گرتنو هەموو سیفاتو پێکهێنەرە دەروونی یەکان، جیان لەو مەبەستو ئامانجانەی کە کەسەکان ئەو سیفاتو وزە دەرونیانەی بۆ تەوزیف دەکەن، هەر لەبەر ئەوە ئەو پیاوانەی کە خاوەن مەعدەنو پێکهاتنی دەروونی باشن، لەنەفامی دابن یاخود لەئیسلامدا، تەنها لەمەبەستەکاندا جیاوازییان دەبێت. مەبەستە چاكو چاکسازیە کانیان لەئیسلامدا جیایە لە مەبەستەکانیان لەدوژمنکاری بە داوەتی نەفامیو سنووردار بوونی ئاسۆ مرۆییو ژیاری یەکەی. ئەو مەعدەنو وزە بەهێزە دەروونیو زاڵەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاواتە خوازیبوو کاتێك داوای دەکرد لەخوا بەرزیو عیززەت بە ئیسلام ببەخشێت، بە یەکێك لەو

دوو (عومەر)ە پاڵەوانی ئیسلامو جاهلییەت بوون، پاڵەوانی ئیسلام عومەری کوڕی خەتتاب بوو، پاڵەوانی نەفامیش ئەبو جەهل عەمری کوڕی هیشام بوو. بەپێی پێوەرەکانی تواناو ئەنجامدان، پیاوی بەرگریو شەڕکردن، مەرج نییە جیاواز بێت لەپیاوی چەتەو تاڵانکارو ڕێگر، جیاوازی تەنها لەمەبەستەکەدا هەیە. سەرچاوەی ئەم وزە دەروونیو ڕەوشە کەسیانە کە هێزو دڵسۆزیو خۆ بەختکردنی تیادا ڕەنگ دەداتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵو ماندوو بوونە پەروەردەیی یەی کە لەپێناو پێگەیاندنی منداڵاندا دەدرێتو گەلان نەوەکانی خۆیانی لەسەر پەروەردە دەکەن.

شێوازی گوتارو کاریگەریی لەسەر بونیادی دەروونی بۆ قۆناغە یەك لەدوای یەکەکانی منداڵی، و ساڵ لەدوای ساڵ، و هێل لەدوای هێل، بەپێی شێوەی گەشە کردنی جەستەو گەورە بوونی، بریتییە لەگرنگترین کارێك بۆ ئەو پەروەردەیەی کە پێویستە ئێمە دەرکی سروشتو ئاستی کاریگەری بکەین لەبونیاتنانی دەروونی منداڵاندا، دەبێت ئێمە گرنگی بەناسینو شارەزابوون لەسیفاتەکانی ئەم گوتارەو ڕووکاری جیاوازیی لەگەڵ شێوازی گوتاری گەورەو وەعزکردنو ئاراستەکاریو ڕاهێنانیان بدەین.

بێ گومان مێرد منداڵ پێویستی بە ئێمەیە کە گوتارێکی پێشکەش بکەین ببێتە هۆی ئەرەی ئەو سیفاتو وزە دەروونییە ئیجابیانە کە هاندەرن بۆ بڕوا بەخۆ بوونو ئارەزوو مەندیو بەجێهێنانی ئەرکی سەرشان لەژیانداو شانازی پێوەکردنیو ئارە زووی سەرکەوتن تیایداو شارەزا بوونو ناسینی نهێنییەکانیو ئەو ئەرکە لە دەروونیدا، بچێنێتو بنیات بنێت، بەشێوەیەك کەسایەتی ئەو مێرد منداڵە دەرکەوێت لەهێزو بڕوا بەخۆو شانازی بە تواناو چوونە بەرەو هەر ڕەوشێکی تری پێویست کە بۆ سەرکەوتنی نەتەوە لەجێ بەجێ کردنی ئەرکی سەرشانی لە خەلافەتداپێویست بێت.

زۆر گرنگە منداڵ لەقۆناغەکانی پێکهێنانی لایەنی دەروونیدا دوور بخرێتەوە لەگوتاری تۆقێنەرو ترساندن، چونکە ئەو جۆرە گوتارە ئا هەموارانە دەبنە هۆی تێکشکاندنو ڕوخاندنی ئەو وزەو توانا دەروونیانەی کە هەیەتیو پەیوەستن بە ڕەوشی ئازایەتیو بڕوا بەخۆو شانازی بە تواناو چوونە پێشەوە. دەبێت مەنهەجێکی پڕ لەخۆشەویستیو هاندان دابڕێژین لە پەروەردەکردنو وەلامدانەوەی پرسیارە کانیاندا، بە تایبەت لەو شتانەدا کە پەیوەندییان بە

تێگەیشتن و وێنا و پەیوەندی بەخوای حەق و داد پەروەرو بە بەزەیی و بەسۆزو میهرەبانەوە هەیە، بەشێوەیەك ئەو منالە لە پێگەی بە هێزی و ئارام گرتن و ئارەزوو خۆشەویستی یەوە رووبکاتە خواو سەرنجی ژیان بدات و رۆڵی خۆی تیایدا ببینێ و، پاشان خۆشەویستیی بۆ رۆژی دوایی و گەیشتن بە پەروەردگار، هەموو ئەو شتانە قەبوڵ بکات، واتە گەیاندنی بنەماکانی ئاین و بەهاو مەبەست و عەقیدەکانی دەبێت لە قۆناغەکانی پێکهێنانی سەرەتایی دا(التكوين الاولى) ئیجابی بێت و هەستی خۆشەویستی و ئارەزوومەندی و روانین(تطلع)و راپەراندنی گەشە پێ بدات، چونکە کەسێك خۆشەویستی و روانین و شانازی کردنی بۆ شتێك هەبێت، وەری دەگرێت و جێی بەجێی دەکات و لە پێناویدا ئارام دەگرێت و قوربانی بەخۆی دەدات و خۆی لەپێناویدا بەخت دەکات، بەڵام کەسێك بترسێ و بتۆقێ، ئەوە هەر لەسەرەتاوە حەزدەکات لەهەموو شتێك دوورە پەرێز بێت و کەمترین کار لەژێر جۆرەها مل ملانێی دەروونی بەردەوامدا ئەنجام دەدات و بە درێژایی تەمەنی لەکۆڵی نابێتەوە، لەئەنجامی ئەو هەست بەتۆقاندنە کە هەستی دوورە پەرێزی پێدەکات لەهەموو بە دەمەوە چوونێك لەلایەك و لەلایەکی ترەوە پاڵنەرێك دەبێت بۆ مل کەچ کردن و بەزین و سەر شۆڕی بۆی، ئەو کاتە تەمبەڵی و نارێك بوون و کەمتەرخەمی و جیاوازی و نەگونجاوی دەبنە بەشێك لەپێکهاتەی ئەو کەسەو کەمترین ئەرك و بەبێ پەرۆشی و وردەکاری ئەنجام دەدات. ئەمەیە تێبینی دەکەین و بووەتە رەوشی زۆربەی موسڵمانانی ئەم سەردەمانەی دوایی.

ئەگەر بە وردی تەماشای ئەم ئاینە پیرۆزە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە موسڵمان لەلای خوای پەروەردگار چ پلەو پایەیەکی تایبەتی هەیە، لەهەموو حاڵەتێکدا پاشە رۆژی هەر بەهەشتە﴿ من قال لا الـه الا الله دخل الجنة، وان زنى وان سرق ﴾ متفق عليه، لەبەر ئەوە منالی موسڵمان نە بەر پرسەو نە لێپرسینەوەی لەسەرە تا ئەو کاتەی دەگاتە تەمەنی پێگەیشتویی(بالغ)بوون.

کەواتە نابێت کۆڵی قورسی لێ پرسراوی بدەین بەسەر منداڵدا پێش لەوەی پێ بگات، و پێویستە بە گوفتاری شیرین بیدوێنین تا تواناو باوەڕ بەخۆو چوونە پێشەوەی تێدا بروێت، وەك چۆن پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) سەرپەرشتی منداڵانی دەکرد بەو پەڕی خۆشویستن و لەخۆگرتن و لابردنی هۆکارەکانی ترس لە دەروونیاندا، لەو نموونانەش گوفتاری لەگەڵ ئیبن عەباس و خستنە سەرشانی

کچەزاکەی لەسەر مینبەر لەکاتی وتارداندا هەروەها ئارامگرتنی لەسەر ئەوەی کە کچەزاکەی لەکاتی سوجدەی نوێژدا دەچووە سەرپشتی. وە چۆنیەتی ئامۆژگاری بۆ ئەو دەشتەکیەی کە بەتوندو تیژی ڕەفتاری لەگەڵ منداڵەکانی کردبوو.

ئەو گوتارەی لاوی پێگەیوی موسڵمان دەخاتە بەر لێ پرسینەوەو تەکلیفات قۆناغی تایبەتی خۆی هەیە تا کاریگەری ئیجابی ببێت لە پێگەیاندنو کامڵ کردندا، وەك چۆن کاریگەری یەکەی بەرانبەر هاوەڵان دەرکەوت لەکاتی موسڵمان بوونیاندا هەر چەندە لەسەردەمی جاهیلیدا ئەوانە کامڵ بوو بوونو لەریزی پیاواندابوون وەك ئەبوبەکرو عمرو خالدی کوڕی وەلیدو سەعدی ئەبی وەققاصو ئەبو عبیدە عامر بن جراحو زۆری تریش.

کەواتە پەروەردەکردنی ئیسلامیانە لەسەر بنەمایەکی زانستو پرۆگرامو پرنسیپەکانی دەبێت هەنگاو بەرەو تێگەیشتن لە دەروونو مۆرکەکان بنێتو دیراسەو چاودێریان بکات، هەروەها چاودێری ئەو قۆناغە بکات کە دەروونی کەسەکانی پیا تێپەڕ دەبێتو کاریگەریو شوێنەواری ئەو کارلێك(تفاعلات)و پەیوەندیانە شارەزا بێت تووشیان دێتو پیایاندا تێپەڕ دەبێت، بەکارهێنانی شێوازێکی زانستی یانەی سازدراو لەمەیدانی پرۆگرامو پەروەردەی ئیسلامیو شێوازو ئامرازە ڕاستو دروستەکانیدا، بێ گومان دەبێتە هۆی گۆڕینی حاڵەتە پەرتوکاوەکەیو بە ڕاستی دەیکاتە فێرگە یەکی زانستی وەها کە مەبەستو ئامانجو داواکاری ئیسلامی چاکسازی خۆی هەبێت، هەروەها ئەو هۆکارو پرۆگرامە کاریگەرەی دەبێت کە لەواقیعی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئەو ئامانجو نمونەو چینانە دەهێنێتەدی، کە هەوڵی پێگەیاندنو ئامادەکردنیان بۆ دەدات، تاکوو بتوانن بەرەو ڕووی ژیانو بەڕێوە بردنی گەردوونو چاودێری کردنیو ئاوەدان کردنەوەی ببنەوە.

دەروازەی ڕاستو دروست بۆ چوونە ناو پەروەردەی ئیسلامی یانە نابێت لەڕێی بەکارهێنانی شێوازی ترساندنو تۆقاندنو بڵاوکردنەوەی ترسو لەرزەوە بێت، بەڵکو دەبێت لەڕێی شێوازی خۆشەویستیو ئارەزوومەندیەوە بێتو لەخۆشەویستی خوای بەدیهێنەرو حەقو میهرەبانەوە دەست پێبکاتو، هەروەها ئارەزوومەندی بۆ چاکەو حەقو دادپەروەریو خۆشەویستی ژیانو کاری موسڵمان بەو شێوەی کە خوای گەورە دەیەوێت، کە بریتیە لەجێ نشینی یەتی چاكو پڕ لەحەقو دادپەروەریو چاکسازیو حەزکردن بەو کارەی دەبێتە هۆی گەیشتن بەو

پلەیـــە، هـــەروەها لەگـــەڵیدا خۆشویســـتنی جیـــهادو هـــەوڵی دڵســـۆزانە لـــەپێناو ئـــەنجامدانی پەیامەکـــەو شـــانازیکردن پێـــوەیو هـــەروەها ئـــارەزووی بـــۆ گەیشـــتن بەخوای حـــەقو بـــە بـــەزەییو شـــادبوون بـــە دیـــداری لـــەڕۆژی دوایـــیدا، کـــە بریتـییـە لەخانەو جێگەی حەوانـەوەی پـڕ لـەنازو نیعمـەتی خـوا بـۆ ئیمانداران دڵسۆزان.

هـەر کاتێك منـاڵ گەیشـتە تەمـەنێك بتوانـێ چـاكو خـراپو ڕاسـتو ناڕاسـت لێـك جیابکاتـەوەو ڕووەو لاویـەتیو وەرگرتنـی ئـەرکو لێپرسـراویەتی هـەنگاوی نـا، ئـەو کاتـە دەبێـت پەروەرشـیارەکەی دەسـتی بگرێـتو بـە پاشـە ڕۆژی کردارەکـانو بـە لێپرسـراویەتیەکان ئاشـنای بکـات، بـەو شـێوەیە هەسـتی لێپرسـراوێتیو هەسـتی هـەڵسو کـەوت کـردنو خۆگرتـنو چـاك ئـەنجامدانی کـار لـە دەروونـیدا دەچەسـپێو ڕێـز لەمافـەکان دەگرێـتو سـنوری قەدەغـە کراوەکـان دەپـارێزیو هـەوڵی بڵاوکردنـەوەی دادپـەروەریو چاکسـازی دەدات لەسـەر زەویدا. بـەم شـێوەیە واتاکـانی مـژدەدانو وریاکردنـەوە لـە بونیـادی دەروونـی موسـڵمانەکاندا بـە تـەواوکاری دەگـاتو ئـەو کاتـە هـێزێکی خـێردارو ئیـش کـەرو ڕێکخـراو پێـك دێـتو هـەر دوولا یەکتر تـەواو دەکـەن.

گرنگی تەواوێتی مەبەسـتە ئیسلامیەکانو ئاراسـتە کردنـەکانی سروشو مەبەستەکان لەگـەڵ هەواڵـەکانی تـێڕوانینی کردەییو لێ وورد بوونـەوەی عـەقڵی لەمـەیدانی توێژینـەوە کۆمەلایەتیەکان، زیاتر لەهـەر بوارێکـی تـر لـەبواری پـەروەردەدا دەبینێتـەوە، هـەروەها هەوڵەکانیش کە لەپێناو تێگەیشتن لـە فیترەتـەکانو ئـەو مۆرکانـەی کـە خـوای گـەورە لـە دەروونەکاندا دایناوە بەهەمان شێوە.

بـەم شێوەیە توێژینـەوەی زانسـتی فیطرەتـەکانو مـۆرکو پەیوەندیـە مرۆیـی یـەکان دەبێتە فاکتەرێکی کاریگەر بۆ بە ئەنجام گەیاندنی خواستو مەبەستەکانی ئیسلام.

ئـــەزموونی فیکـــری ئیســـلامی لـــەبواری پـــەروەردەی ئیســـلامی یانـــەدا لـــەم سـەردەمانەی دوایـیدا، ئـەوەمان بـۆ دەردەخـات کـە تەنـها مەبەسـتو خواسـتی خـێر بـەس نیە، بـەڵکو دەبێـت هـەموو ئـەو ڕچـەو ڕێبازانـە شـارەزابین کـە پیـایدا تێپـەڕ دەبین بۆ بە ئـەنجام گەیشتنی ئـەو خـێرە.

گرنگـە ئـەوە یـاد بخەینـەوە کـە تەنانـەت لـەدوای نـەمانی سـەردەمی خەلیفـە ڕاشـیدیەکانیش پیـاوانی قوڕەیـش منالـەکانیان دەنـاردە بیابـان تـاوەکو لەسـەر ڕەوشـی لادێ نشـینە عەرەبـەکان پـێ بگـەنو کاریگـەری پـەروەردەی بادیـەو دێهاتنشینیان لەسەر بێت، پێگەیاندنی منـالان لـە بادیـەدا تەنـها لایـەنی جەسـتەیی

نەگرتبویەوە، بەڵکو پەیوەندی بە شوێنەوارە دەروونیەکانیشەوە هەبوو. لەبەر ئەوە مناڵ بە ئازادیو سەربەخۆییو دەروون بەهێزی پێ دەگەیشت، هیچ کۆتو پێوەندێک، هیچ ترساندنو فشارێك نەبوو ڕێگربێ لەبەردەم گەشەکردنی هێزو وزەو تواناو ئەو ئازایەتی یەی کە لەو قۆناغە سەرەتایی یەی پێك هاتنی دەروونی ناسکیدا هەبوو، هەر بۆیە بە دەروونێکی بەهێزو ئازاو ئازادو نەترسەوە پێ دەگەیشتو گەورە دەبوو، بەهەمان شێوەو بەگشتی پاشاکانو میرو سەرکردەکان لەسەردەمەکانی بنیاتنانی دەوڵەتو ژیاری ئیسلامیدا ئەمەیان کردووە، لەپێناوی ئامادەکردنی مناڵەکانیانو پێکهاتنی دەروونییان بۆ ڕاهێنانیان لەسەر وەرگرتنی ئەرکو سەرکردایەتی کردن کە پێویستی بەهێزو ئازایەتیو چوونە پێش هەیە وە کاتێکیش کە بناغەی بونیادی دەروونییان تەواو قایم دەبوو لەسەر ڕەوشە دەروونییە خواستراوەکان، دەیان ناردنە شارەکانو خوێندنگاکانو دەخرانە بەر دەستی مامۆستاو پەروەرشیارو پەروەردەکەران، تاکو جۆرەکانی زانینو زانیاریو شارەزایی دەست بخەنو وانەی ئامۆژگاریو ڕێنمونیو پەروەردەو پێگەیین فێر ببن، بەو شێوەیە پەروەردە کردنیان بە تەواو کاری دەگەیشتو بە بەشێکی فراوان لەتواناو ئازایەتیو عیززەتو زانست خۆیان دەڕازاندەوە.

لەپێشەکی یەکانی زانستی پەروەردەی ئیسلامی یانەدا گرنگە توێژەران پێڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) بکۆڵنەوە، نەك تەنها لەهەموایەتی گشتییەوە فەرموودەو ئاڕاستەکردنەکانی گەلەکەی، بەڵکو لەتێگەیشتنێکی پوختەو دروستەوە بۆ هەموو ووتە یەکیو گشت دەلالەتەکانی ئەو ووتانەوە، وە هەروەها وەرنەگرتنی مەتنی هیچ ووشەیەكو گۆڕینی واتاو دەلالەتە ڕاستەکەی، بەڵکودەبێت توێژەران دیراسەی ئەو پێڕەوە زانستی یەی پێغەمبەر(ﷺ) بکەن کە لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ منالانی خۆیو منالانی موسڵماناندا مومارەسەی کردووە،هەروەها دیراسەی ئەو بەرماوانە بکرێت کە لێی دەگێڕنەوە لە بەکارهێنانی شێوازی خۆشەویستیو بەزەییو ئارام گرتنو نەرمو نیانی لە پەروەردەکردنو مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، کە هەرگیز نەبینراوە پێغەمبەر(ﷺ) لەژیانی خۆیدا ئازاری منالی دابێت یاخود لێی دابێت، بەڵکو لەهەموو حاڵەتێکدا قەدەغەی ئەوەی کردووە لەدەمو چاو بدرێت، چونکە شوێنەوارو کاریگەری خراپ لەسەر پێکهاتنی دەروونیو وزەو توانا دەروونی یەکانیان بەجێ دەهێڵێ.

پیاچوونەوەیەك بە حیسـاباتی شێوازی پرۆگرامی پەروەردەیی ئیسلامیو پابەند بوون پێوەی بە توێژینەوەو ڕێ پێ بردنێکی زانستی، دەبێت لەهەموو بوارە پەروەردەییو فێرکار یەکاندا تێبینی بکەین لەوانە، ئەوەی کە هەڵ دەبژێرین بۆ منداڵانو تازە پێگەیشتوان، هەریەکە بەگوێرەی تواناو قۆناغو ئاستی لەخوێندنەوەو موتاڵاکردن، وە ئەوەی کە پێشکەشی دەکەین لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پاکی پێغەمبەر(ﷺ). دەبێت تێبینی کاریگەری ئەو خوێندنەوەو موتاڵاکردنانو ڕێنمونی یانە بکەینو بە تەنها جەخت لەسەر بەها زمانەوانی، یاخود ئەدەبی، یاخود واتا بەرزەکانیان نەکەین، چونکە سەنگی مەحەکی پەروەردەیی ئەم قۆناغە بریتییە لەو شوێنەوارە دەروونییەی کە بەرەنجامی شێوازی گوتارەکەیە، ئیتر مژدەدان بێت یاخود ترساندن، چارەسەرکردن بێت یاخود تێکشکاندن، تاکوو بتوانین مەبەست لەپەروەردەو ئاراستە کاریەکە لەسەر ئاستی دەروونیو زیهنیو عەقلی هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنی تازەپێگەیشتوان بگەێنینە ئەنجام.

لێرەدا هیچ بوارێك نامێنێ بۆ گومان بردن بە دژایەتی نێوان چەمکی ئیجابیەتو خۆشەویستیو قەناعەت لەپێکهێنانی کیانی دەروونی تازە پێگەیشتوانو چەمکی سازبوون(سازندەیی) لەڕەفتارو پێکهاتنی دەروونییاندا، سازندەییو شێوازێکن بۆ کردەو ڕەفتار، کە منداڵو تازە پێگەیشتوان بە ڕاهێنانو پێشەنگیو بینینی نمونە وەری دەگرن،و پاڵنەرەکانی فیطرەی ئیجابی پشتی دەگرێت لەخواستی جێ بەجێ کردنو سەرکەوتنو ئارەزوو مەندی لەبەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو کەسەی خۆشی دەوێتو ڕێزی لێ دەگرێت، ئەمانەش کۆمەڵە چەمكو فاکتەرێکن دژ بەچەمکی خۆشەویستیو هاندان نین وەك بنەمایەك بۆ پەروەردە کردنی منداڵو دارشتنی هەڵوێستیو دیدی بۆ ژیانو بۆ بوون.

دەبێت بەو شێوەیە لە خۆشەویستی نەگەین کە تێکدانو لاوانەوەیەو، ترسو تۆقاندنیش سازندەییو یاسایە، ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەو شێوازێکی دەستەوسانە، ئەوەی کە پێویستە سووربین لەسەری بریتییە لە خۆشەویستیو(انظباط)پێکەوەو بە شێوازێکی ڕاستو دروست، کە ئەویش بریتییە لە ئارەزوو مەندیو تواناو کیفایەت بەیەکەوە، تاکوو بتوانین وا لەڕۆڵەکانی ئەم گەلە بکەین بە ڕاستی بەختەوەربنو بە گیانی کاری ستافێکی

سەرکەتوو بەو ڕێزو پێزانین و هێزو کیفایەت و هاوکاری و توانەوە و نیزام و ئازادی و پێشڕەوی یەوە خۆیان بڕازێننەوە.

ئەوەی ئەمڕۆ گرنگە بۆ سەرکردەکانی ئەم ئوممەتە ئیسلامییەو زانایان و پەروەرشیاران و ئەوانەی گرنگی بە کارو بارەکانی دەدەن، ئەوەیە بزانن کاری چاکسازی و پەروەردەیی، کە ئەوان، بەرەو ڕووی ئەنجامدانی دەبنەوە، لەهەندێ ڕوویەوە جیاوازە لەو کارە چاکسازی و پەروەردەیی یەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامدا بەرەو ڕووی دەبوو یەوە، ئەو کەسانەی ئەو گوتاری بۆ دەدان، کەسانێکی بە دەمارو بەهێز بوون، بەڵام دەردەکەیان ئەوەبوو کە دڵ ڕەق و بێ بەزەیی و توندڕەو بوون و دەمار گیرو نەفام بوون، بەڵام ئوممەتی ئەمڕۆ حاڵی نەوەکانی و ئەو ڕەوشانەی هەیانە جیاوازە، ئوممەتێکە تووشی نەخۆشییەکانی لاوازی و نەمانی وزەو توانا دەروونییەکان و بڵاو بوونەوەی ڕەوشی سەر کزی و کزۆڵی و متمانە بەخۆ نەمان و لەدەستدانی گیانی دەست پێشخەری و بەرەو ڕوو بوونەوەی ژیان و ئەرکی جێ نشینی بوەتەوە هەر وەکو حاڵەتی جولەکەکانیان لێ بەسەر هاتووە، کاتێك لەسەر دەستی فیرعەونەکاندا کرانە بەندەو سەر کزکران، بۆیە پێویستیان بە پەیامی موسا پێغەمبەر هەبوو بۆ چاکسازی دەروونیان و ئازادکردنی، لەڕێی پێگەیاندنی نەوەیەکی ئازاد لە بادیەی(سینا)دا تاکوو بە سیمای ئازایەتی و تواناوە بچێتە زەوی پیرۆزو کۆمەڵگەی ئیسلام و یەکتا پەرستی و بەرنامەو پەیام دابمەزرێنێ.

هەروەها گرنگە تێبینی ئەوەیش بکەین کە ئەم گەلە تووشی نەخۆشی شێوە خوازی(شکلیە) و بێ توانایی و دەستە پاچەیی بووە، ناتوانێ دەرکی کرۆك بکات و پەیوەست بووە بە ڕووکارو ڕوخسارەکانەوە، بێ گومان ئەمەیش بەهۆی لاوازی هزرو بێ توانایی پاش دابڕان لە بە دوادا چوونی واقیع و تێگەیشتن لێی و کۆنترۆڵ کردنی ڕوو بەڕوو بوونەوەکان و پێشکەشکردنی بەدیل بۆ مامەڵەکردنی ڕاست لەگەڵیدا، هەر وەکو چۆن نەوەی ئیسرائیل و ئەحبارەکانیان تووشی بوو بوون. ئەوان کاتێ نەبوویەك و هەزارێك دزی بکردایە تۆڵەیان لێدەسەند، بەڵام ئەگەر دەوڵەمەندبوایە وازیان لێ دەهێنا، هەر لەبەر ئەوە پەیامی عیسا پێغەمبەر بۆیان ئەوەبوو بگەڕێنەوە بۆ سەرنج لەکرۆك و کەڵکەکانی خۆشەویستی و سەرپەرشتی و چاودێری یەکی دڵسۆزانە لەبنیاتنانی دەروونەکاندا، تاکوو مرۆڤ بتوانێت بە

راستی ڕۆڵی خۆی لەجێ نشینی‌و چاودێری کردنی بوونەوەر یان‌و ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی‌دا ببینێت.

کاری چاکسازی پەروەردەیی لەمرۆدا بریتی نیە لەڕاهێنانی گەلانی بەهێزو پێگەیاندنیان، بەڵکو بریتی لەچارەسەرکردنی نەتەوەیەکی نەخۆشی لاواز، کە ڕەوشەکانی هێزو بۆ پێشەوە چوون‌و داهێنان‌و بەخشین‌و خۆشەویستی‌و چاودێری‌و سەرپەرشتی لەدەست داوەو تووشی ترس‌و لاوازی‌و دەروون بەزیووی‌و رواڵەت‌و ڕووکار پەرستی بووە، کە بەدرێژایی سەردەمەکانی دابڕان(انفصام)و چەوساندنەوەو بێ توانایی فیکری‌و دواکەوتوویی کەڵەکە بوون لەسەری.

پێویستە لەسەر زانایانی موسڵمانی بواری پەروەردە باش لەکاری خۆیان بگەن‌و ئیش بکەن لەپێناو دارشتن‌و بنیاتنانی بیردۆزەیەکی زانستیی ئیسلامی بۆ پەروەرش، کە نیشانەو ئامانج‌و شێوازەکانی ڕۆشن بن، بە تایبەتی پێویستە لەسەریان دەرکی جیاوازی نێوان لایەنە عەقڵی‌و لایەنە دەروونی‌یەکان بکەن، لە هەموو ئەو شتانەی کە بەتازە پێگەیشتووان دەگەیێنرێ، هەروەها دەبێت لەلایەنە دەروونی یەکانی ئەم نەتەوەیە تێ بگەن‌و بزانن چۆن لەڕێی ئەرکی مەنهەجی‌و پەروەردەیی یەوە چاکسازی تیادا دەکەن، دڵنیاین لەوەی کە هەرشتێك دەگەیێنرێ بە تازە پێگەیشتووان‌و بەلاوان، لەوەی کە گونجاوە لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەکردنیاندا، بەرهەمی خواستراوی دەبێ، نەك تەنها لەبوارەکانی عەقڵکاری بەڵکولەپێش ئەوەوە لەبواری کارایی دەروونی‌دا. ئەمەش بەسەر هەموو ئەو شتانەشدا بەجێ دێت کە پێیان دەگەیەنرێ لەوانەش گشت وانەکانی عەقیدەو پەروەردەو فێر کاری‌و ڕاهێنان.

گرنگە لەبەر تیشکی ئەوشتانەی کە سرووش دەری دەخات لەڕەهەندە گیانی‌و دەروونی‌و مەعنەوی‌و ماددیەکانی ئادەمیزاد، زانایانی دەروونناسی‌و کۆمەڵناسی موسڵمان هەڵسن بەچڕ کردنەوەی هەوڵەکانیان لەبواری ئیسلامییەتی زانستی دەروون‌و کۆمەڵناسیی ئیسلامی‌و وێنە کێشانی نەخشەیەکی گشتی سەبارەت بە بۆ چوونی ئیسلامی بۆ دەروونی مرۆڤ‌و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌و، سوود گەیاندن بە پەروەرشیاری موسڵمان تاکوو هەوڵەکانی لەسەر ئاگایی تەواوبن بە سروشتی دەروونی مرۆڤ‌و قۆناغەکانی گەشەی‌و چۆنیەتی پەروەردە کردنی‌و مامەڵە کردن لەگەڵیدا.

### ٢- ئیسلامییەت و زانستی سیاسەت:

زانستی سیاسەت باس لەتوێژینەوەی دیاردەی سیاسی و یەکەمینەکانی نەتەوەو هەموایەتی و دام و دەزگا گشتی و شێوازەکانی دەکات کە بەهۆی ئەوانەوە سەرکردە سیاسی یەکان هەڵدەبژێرێن، وە پرۆگرام و قەناعەتە سیاسی یە گشتی یە کۆیەکانی نەتەوەش پۆلێن و گەڵاڵە دەکات، وە سیستەم و یاسا و پەیڕەوەکانی دەچەسپێنێت، هەروەها دام و دەزگاکانی بەڕێوە دەبات و وزەو تواناکانی ئاراستەدەکات.

هەڵبژاردنی سەرکردەکان و ڕیزکردن و گەڵاڵەکردنی یەکەمینەو قەناعەت و یاسا ڕێژی و ئاراستەکردنی وزەکان و تازەکردنەوەی بونیادی دام و دەزگا گشتی یەکانی و دیاری کردنی دەورەکانیان دۆزێکی پڕ بایەخی نەتەوەیە، لە لایەنێکەوە بەهاو بنەما و قەناعەت و ئاراستە بنەڕەتی یەکانی نەتەوەی لەسەر بەندە، کە دەتوانین لێرەدا ناوی بنێین لایەنی(ئایدۆلۆژی و دەستووری) لەلایەکی تریشەوە بەندە لەسەر توانا و وزە ماددی و مەعنەوی و ژیاریەکان و داهاتەکانیان، وە بارو دۆخەکانی پێکهێنان و پێگەیاندنی ڕۆڵەی گەلەکانی ئەو نەتەوەیە، هەروەها بەندە لەسەر ئەو مل ملانێ و بارودۆخە دەرەکیانەی کە دەوریان داوەو وزەی ئەو گەل و نەتەوانەی ڕوو بە ڕوویان دەبنەوە.

توێژینەوەو ڕەفتارە سیاسی یەکان بە دەوری چەمکی ئەم ڕەگەزو پەیوەندیانەدا هەڵپێچراوە هەروەك دەرککردن بە شوێنەوارەکانی و پێشکەش کردنی ڕێگە چارەو وێنای گونجاو سەبارەت بەڵێ تێ گەیشتنیان، و هاوتەریب ڕۆیشتن لەگەڵ ڕووداوو گۆڕانکارییەکانی سەر گۆڕەپانەکەیان، بەو شتانەی کە گەشەو توانا و سەقامگیری و یەکێتی نەتەوە دەهێنێتەدی.

لەبەر ئەوە دام و دەزگا و دامەزراوەو کاروبارە بەجێ هێنراو پەیڕەوە گشتی و تایبەتی یەکانی ژیانێکی سیاسیانەی سەرکەوتوو لەو دام و دەزگا پێشکەوتووانەدا تەعبیر دەدرێتەوە کەوا لە تاکەکانی کۆمەڵ دەکا ئینتیمایەکی هەمواریان هەبێت بۆ ئەو دام و دەزگایانەو بەردەوام ئیشی بە بەرهەمی هاوبەشی تیادا بکەن بە چەشنێك هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە بگرێتەوە، هەروەها وایان لێ بکات هاوبەشی بکەن لەئاراستە کردنی ڕەوتی بزاوتەکەیان لەبواری بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەدا بەپێی تواناکانیان، ئەوەش هاوکات بێت لەگەڵ کار بۆ پێکەوە بەستنەوەی

هیواو ئاواتە کلانیان، هەروەها لەسەر کۆششی بەردەوام بۆ دابین کردنی پێداویستیەکان و بەر بەستی کۆسپەکان و بەرگری لەپیرۆزا یەتی و بەرەو پێش بردنی ڕەوڕەوەی چاکسازی و داهێنان و ئاوەدانکاری.

نمونەمێژوویەیە ئیسلامی یەکان، هەر چەندە لەخودی خۆیاندا وەك ئامانج دانانرێن بێ گومان ئەو کۆمەڵە دەرسە گرنگانەیە کە توێژینەوە ئیسلامی یە سیاسی یەکان دەیانگرێتەوە. ئەم نمونەو دەزگاو دامەزراوانە شوێن و سروشتێکی مێژوویی خۆیان و بارودۆخی تایبەتی و بەخششی ژیاریی خۆیان هەیە لەچوار چێوەیەکی وادا توێژینەوەی سیاسیانەی ئیسلامی دەتوانێت سوود وەربگرێت لەو پەندانەی کە لەم وانە ێژووییانەدا وەریان دەگرێت تا بەردەوام بێت لەبەرەو پێش چوون و پەرەسەندن و گەشەکردن و بەجێ هێناندا بۆ ئەوەی مەبەست و ئامانجەکان بە باشترین شێوە بهێنێتەدی بەپێی توانا بەگوێرەی ئەو واقیعە ناوخۆیی و بارو دۆخە دەرەکیەی تیایەتی

هەروەها گرنگە لە توێژینەوەی سیاسیانەی زانستیانەی ئیسلامیداو لەبواری سستەمە ئیسلامیە مێژوو ییەکاندا، تێبینی ڕۆڵی دامودەزگا ڕەسمی و ناڕەسمییەکان و ئەو ئامێرو هۆکارانە بکەین کە هەریەکە لە ئاستی خۆیانەوە کاریگەری یان هەبووە لەهێنانەدی ئەو ئاسەوارە مێژووییانەدا کە لەو نمونانەدا دەردەکەوێت، تابتوانین بە باشی لەو هۆکارانە تێ بگەین کە چارەنوسی ئەو دام و دەزگایانەیان دیاری کردووە هەروەها ئەو وانەو پەندە مێژووییانە لەهەموو بارەکاندا بە هەموارو نا هەموارەوە کورت بکرێنەوە، تا بتوانین بەو شێوەیە کاروانی نەتەوە ئاراستەو دیاری بکەین و بیگێڕینەوە بۆ هەستی کۆمەڵکاری و، توانای تاك و گەل و نەتەوەکانی لەکارکردنی هاوبەشدا دیاری بکەین، هەروەها بتوانین دامەزراوەو دام و دەزگاو سیاسەت گەلێکی گشتی وا بنیات بنێین و نوێ بکەینەوە کە گۆڕەپانی هاوکاری و هاوبەشیکردنی بۆ دەستە بەر بکرێت.

واتای نەتەوەو بونیادی قەوارەکەی نایەتەدی تا نەتەوە نەتوانێت ئەو دامەزراوە سیاسیانە بنیات بنێت کە لەگەڵ واقیع و بەهاکانیدا دەگونجێت و دەبێ ڕۆڵەکانی وا سازبدات بەشداری بکەن لەو بنیاتنانەداو مومارەسەی کاروبارو ئەرکی سەر شانی خۆیان بکەن لەپێناو گەیشتن بە ئامانجەکانی نەتەوەدا.

گرنگە لێرەدا لەبنیات نانی فکری سیاسیماندا دەرك بکەین و بزانین کە سەرکردەکانی نەتەوە،و جۆری ئەو دام و دەزگایانەی کە لەئارادایە،و جۆری ئەو

بەجیٚ هێنانەی تیایاندا جیٚ بەجیٚ دەکرێت بریتی‌یە لەڕەنگ دانەوەی حەقیقەتی هزرو کرۆك‌و ناخی دەروونی نەتەوە، هەرگیز ناکرێت سەرکردایەتی‌و دام‌و دەزگا سیاسی‌یە گشتی یەکان پێك بهێنرێن‌و بێننەوەو بەردەوام بن، ئەگەر هاو ڕەگەز نەبن لەگەڵ جۆری کرۆکی نەتەوەو هزرەکەیدا، وەك چۆن بونیاتی واقعی‌و دەرونی‌و هزریشی ئەو جەوهەرە دەنوێنن. لەبەر ئەوە ئەگەر ویستمان کاروانی سیاسیی نەتەوە ڕاست بکەینەوە یان جۆری سەرکردەو دام‌و دەزگاو شێوازی کارکردنیان ڕاست بکەینەوە، ئەوا ئەمەش لەجۆری ئەو هزرو پەروەردە دەرونی‌و هۆشیاری‌یە عەقیدەیی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌یە دایە کە هەمیشە ڕۆڵەکانمانیان پیٚ ئامۆژگاری دەکەین‌و مەشقیان پیٚ دەکەین لەسەری لە ڕاستی‌دا سەرکردەو دام‌و دەزگاکان ڕەنگدانەوەی حەقیقەتی هزری نەتەوەو نەفسییەتی نەتەوەن نابێت دام‌و دەزگاکان سروشت‌و شێوازی خۆیان سەربەخۆ بگۆڕن هەتا بناغەو هزرو نەفسییەت‌و بەهای نەتەوە نەگۆڕێت کە ئەو نەتەوەیە دەینوێنێت هەروەها بەهەمان شێوە ئەو دام‌و دەزگایانەی نەتەوە لەسەریان بەندە بۆ خۆیان ڕەنگدانەوەی سیاسەت گەل‌و ڕەفتار گەلن، لەبەر ئەوە ناچارین هەر کاتیٚ ویستمان لەدام‌و دەزگاو دامەزراوەکان‌و سەرکردایەتی‌و حکومەتەکاندا چاکسازی بکەین دەبێت ئەو بناغانە بگۆڕین کەئەو دام‌و دەزگایانە لەسەریان بەندن لەناخی عەقڵییەتی نەتەوەو هزرو نەفسییەتیدا.

دام‌و دەزگاو سەرکردایەتی سیاسیی هەمواری بە توانای سەقامگیر ئەوەیە فیکری نەتەوەیەکی وا بوێنێت کە بۆ چوونێکی ئیجابی هەبێت، لەگەڵ ئامانج‌و مەبەستی گەورەی یەکگرتوودا، وە جۆرێك لەبونیادی دەروونی کە ماناو ناوەڕۆکی هەموارانەی لەخۆ گرتووە لەرووی داهێنانی پێشەوایەتی کردنی شارستانیانەو، ژیانی گشتی لەسەر بناغەی ئەندامیەتێکی کۆمەڵایەتی یانەی ڕەسەن‌و باش بەرپا دەکات بۆ هەریەك لەڕۆڵەکانی گەل لەچوار چێوەی سنورە پانەکانی هەموارێتی‌دا بۆ ئازادی‌و مافەکانی مرۆڤ.

ژیانێکی سیاسیانەی ئیسلامیانەی ڕاست‌و دروست بیٚ گومان دەبێت پشت بە نەتەوەیەك ببەستێت کە لەکۆیدا هزرێکی دروست‌و، نەفسییەتێکی تۆکمەو بەهێز،و دیدێکی ژیاریانەی پەسەندی هەبێت، وەدەبیٚ سەرکردایەتی‌و دام‌و دەزگا سیاسی‌یە کانیشی پشت ببەستن بە متمانەی نەتەوەو هاوبەشی کردنی تاکەکانی

لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا بە دەرك پێکردنێکی ڕاستی بارو دۆخەکانی، وە بەراوێزکاری یەکی کامڵ لە سیاسەتەکانیدا.

پێویستە جارێکیدی بە قووڵیو وە بەوردی چاو بگێڕینەوە بە دۆزی هێزی سیاسی ئیسلامیداو بە دۆزی پەروەردەو ڕۆشنبیریی دەروونیو هێزیو سیاسی ڕۆڵەکانی نەتەوەو تازە پێگەیشتووەکانیدا، بە جۆرێك ئەم هێزو پەروەردەیە بینیەیەکی عەقیدەییو دەروونیو مەنهەجی ڕاستەقینە بنوێنێ، وەتێ گەیشتنێك بێت بۆ سروشتی ژیانی سیاسیو ئەو ئامانجە سیاسی یانەی لەسەریان بەندە، لەهەمان کاتدا تێ گەیشتنێکی بابەتی یانە بێت بۆ داموو دەزگا سیاسییە ئیسلامییە مێژوویی یەکان بە خۆیانو ئامانجەکانیانەوە، لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەی بە دەستیان هێناوەو زانینی ئەو هۆکارانەش کە بونەتە هۆی شکست پێ هێنانو بەر پابونی کەمو کوڕیو تێ شکان. پێویستە لەڕێی توێژینەوەی زانستیی سیاسی یەوە ئارامیو دڵنیایی بۆ نەتەوە بگێڕینەوە، لەگەڵ هەستی کۆمەڵ کاریو توانا لەکردەو بەجێ هێنانو ئاڕاستەکردنی بە کۆمەڵدا، هەروەها گەڕانەوەی چالاکیو زیندەگی داموو دەزگا سیاسی یەکانمانو بۆ چوونە ئیسلامی یەکانیان، بۆ چوونی سەرکردە سیاسییەکانمانو ڕادەی پابەندی ئیسلامییان. وە دەبێت جارێکی تر ئەم سەرکردانە ببنەوە جێگە متمانەی نەتەوەو وە پشت گیری لێ وەربگرنو تەعبیربکەن لەخواستی ئەو نەتەوەیە، وە دەبێ ئەم توێژینەوانە وا لەڕۆڵەکانی نەتەوە بکات ڕێگای ڕاستیان بدۆزنەوە تا بە ڕۆڵو ئەرکی خۆیان هەڵسن، و وایان لێ بکات واتای بوونی خۆیان بسەلمێننو پێویستی سیاسیو کۆمەڵایەتی یان بەدەست بێنن.

تێ گەیشتن لەژیانی سیاسیو شێوازە ڕاستەقینەکانی، هەروەها تێ گەیشتن لەواتای پەروەردەو گەشە پێ دانی دەرونیو هێزیو عەقیدەییو شێوازە ڕاستو دروستەکانیان دوو کلیلی بنچینەین بۆ گەڕاندنەوەی دڵنیاییو سەرفرازی نەتەوەو ناسنامەو تواناکانیو خستنەگەڕی وزە ژیارییە بنیاتنەرەکانی.

ئەوەی کە گرنگەو دەبێت هێزی سیاسی یانەی ئیسلامی هاوچەرخ هەر لەسەرەتاوە بایەخی پێ بدات تێ گەیشتنە لەدیاردەی سیاسیو ڕۆشنبیریو گەشە پێ دانی سیاسیو زاڵ بونە بەسەر ئەو پرۆگرامە ڕواڵەتیە یاسایی یەی کە زاڵە بەسەریداو، وەکو قووڵ بونەوەیە بۆ ناوەڕۆکی دروست بوونی هەستی چوونە ناو(وەلاء)و پەیڕەویی سیاسی یانە لەناخی ڕۆڵەکانی نەتەوەدا، وە دانانی

سنورێك بۆ لاوازی هەستی كۆمەڵكاریو لاوازی (وەلاء)و پەیڕەویی سیاسیانە لەناو ڕیزەكانی نەتەوەدا.

پێویستە ئەداو بنیاتنانی ڕاستەقینەی هێزی سیاسی ئیسلامیو داموو دەزگا سیاسی‌یە ئیسلامی یەكان وابن كە بتوانن ڕۆڵەكانی نەتەوەو گەلەكانی ڕزگار بكەن لەو بارەی كە تێی كەوتونو لەو لاوازیەی دەروونیان كە وەكو كۆیلەیان لێ هاتووەو ئیرادەی ئازادانەو دەست پێشخەری سەربەخۆیان لەدەست داوە، وە دەبێ سەركردەو پەروەرشیارو زانایانو دایكو باوكان سنورێك دابنێن بۆ ئەو دیوەزمەیەی لەدڵو دەروونی ڕۆڵەكاندا دروست بووە لە قەیرانی تۆقاندنی دەروونیو هێزی، كە چەمكەكانی بەندایەتی حەقیقیو ڕام كردنی دەروونە ئیسلامیەكان لەئاستی ڕاستی یەكی بابەتیانە بۆ واتاكانی خێرو خۆشیو داد پەروەری گۆڕیوە بۆ ئەو چەمكانەی كە مرۆڤ دەبێتە كەسێكی كۆیلەو بێ دەسەڵاتو بێ ئیرادەی ئەو تۆ متمانەی بە خۆی نەمێنێت تەنها لاسایی كردنەوە بزانێتو لاوازو ترسنۆكو دەستەو سان بێت، كە هەرگیز ئەمانە لەگەڵ چەمكی ڕاستەقینەی ئیسلامدا ناگونجێت. پێویستە دڵنیابین ئەو هێزە ئیسلامیە ڕاستەقینەیەی كە پێغەمبەر(ﷺ) وە یاوەرانی نواندویانە فكری پڕ لە عیززەتو شكۆمەندی بووە. خەسڵەتی ڕاستەقینەو خێرو هەق خوازیو لە خۆبوردنو هەوڵدانو واتا بەرزەكانی ڕەوشتو چاكسازی لەخۆ گرتبوو، ڕسواییو سوكایەتی پێ كردن تەنها خەسڵەتو سزا گەلێك بوون سەریان لەكوفرو خۆ بەزل زانینو سەركەشیو لووت بەرزی یەوە دەر دەچوو.

ئەو بارەی ئەمڕۆ دوچاری نەتەوە بووە لەپێچانەوەی لاپەڕەكانیو لاواز بونی وزەو تواناو بەجێ هێنانیو كشانەوەی ڕیزەكانی لەبەرەو پێش چوندا، زەلیل بونو بێ دەسەڵات بونی لەبەردەم دوژمنانیداو دوو چار بونی ئەم نەتەوەیە بە ترسو تۆقین لەدوژمنانیو بوونی بە نێچیری ئەو چاوبرسیانەو كەوتنە ناو تەڵەی فێڵەكانی یەوە یان كۆسپە ناو خۆی یەكانی نەتەوەی ئیسلامی، ئەمانە هەمویان ڕەنگ دانەوەی نەفسیەتێكی ترسنۆكو تۆقیوو لێك هەڵوەشاوو بێ دەسەڵاتن، كە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزە نەخۆشەی لەبونیاتنانی دەرونی تاكەكانی كۆمەڵدا هەیەو هەر لەو دەرونە نەخۆشەیشەوە سەرچاوەیان گرتووە، هێزێك كە شكستەیەو زۆر چەپاڵ واتای بێ دەسەڵاتیو كەسێتی كۆیلەو سیمای كۆیلایەتی تیا بەر جەستە بووە.

پێویستە لەتوێژینەوە زانستیە سیاسییە ئیسلامی یەکاندا جیاوازی بکرێت لەنێوان لۆژیکی سروش(الوحی) لەگەڵ ئیجتیهادی توێژینەوەئەکادیمی یەکانو بریاری کۆمەلایەتیو سیاسییە برافیەکاندا.

سروش ئەو کتێبەیە کە خوای گەورە ناردوویەتییە خوارەوەو پێغەمبەریش لەشێوەی کارو کردارو رێنماییدا بیّ کەمو زیاد گەیاندوویەتی، بەلام تەشریعی بزاوتانەی سیاسیو کۆمەلایەتی بریتییە لە تێروانین بۆ ئایین لەلایەن سەرکردەکانی نەتەوەو پێگەی لێپرسراویەتیان لە کارو رەفتارو نەخشە کێشانێکدا کە پشت بەستووی پابەندی بەئایینو ئامانجو مەبەستەکانیەوە بێت، هەموو ئەمانەش بە دیدێکی کردەییانەو هزرێکی زانستیانەوە بەسەر واقعو توانا و قەناعەتی نەتەوەدا جیّ بەجیّ دەکریّ. بەلام یاسا برافیەکان بریتین لەیاسا گەلێکی مولزیم بۆ تاکەکانی نەتەوە لەهەڵسو کەوتو مومارەسەو جمو جولی گشتی ژیانی کۆمەلایەتیاندا، ئەمەش نابێتە رێگر لەبەردەم بوونی قەناعەتی تاکەکەسیدا لەئاستی بەشێك یان چەند بەشێکی جیاوازدا کە لەگەڵ قەناعەتو تێروانینی سیاسیانەی گشتی نەتەوەدا وێك نایەتەوە، بەلام ئەمە هیچ لەو راستیانە ناگۆرێت کە پابەندی هەموو هاوولاتی یەکە بەو دامەزراوو تەشریعە گشتیو کاروبارانەی کە کاریگەریان هەیە لەسەر مامەلەو هەڵسو کەوتی گشتی تا ئەو قەناعەتو یاسایانە دەگۆرێت.

بەلام توێژینەوەی ئەکادیمیانەی بریارو زاناو توێژەران ئەوەیان شتێکی ترەو لۆژیکی سروش نییە، هەروەها تەشریعاتی سیاسیانەو بزوێنەرانەی نەتەوەش نییە، بەلکو ئەم توژینەوانە سەرچاوەیەکی سامانین بۆ هزری نەتەوە، وە پەنجەرەی تێروانینەکانی نەتەوەو دەروازەی یارمەتی دانی تێشوی نەتەوەن بۆ تێروانینو توێژینەوە لەگۆرەپانە جیاوازەکانی ژیاندا، لەوانەش تەشریعاتی بزاوتانەی سیاسیو یاسایی.

جیاوازی دیدو بۆچوونی توێژەرو زاناو لێکۆلەرەوان لەنێوان خۆیاندا و هەڵسەنگاندنیان بۆ تەشریعە گشتیو سیاسیو کۆمەلایەتی یەکان لەراو بۆچوونی هیچ کامێکیان کەم ناکاتەوە سەبارەت بە لایەنەکانی هەریەکە لەو دۆزانە بەمەرجێك بەدیدێکی راستو دروستەوە تیّی بروانن،و دەبێت هیچ راو بۆچوونو تێروانینێك دوور لەو دەلالەتەی خۆی نەروات کە تەنها دیدو هزرێکە کۆمەڵ بە نەتەوە دەکات بۆ تێگەیینو لێك جیاکردنەوە،و تێشویەکی دەداتیّ بۆ تیّ

ڕوانینێکی زیندوو پەرە پێ دانێکی بەردەوامی بڕیارە تەشریعیو سیاسی یەکان،و هێندەی ئەوەی کە هێزی زانایانو بیریاران بایەخی پێدەدرێت وە لێی تێ دەگەن بەو ڕادەیە نەتەوە شیاو دەبێو دەتوانێت بڕیارە یاسایی سیاسی یەکانی بە شێوەیەکی بابەتیانەی پێگەیشتوو بە پێی قەناعەتی ڕاستەقینەی خۆیو تێ ڕوانینە گشتی یەکەی وەربگرێت، بۆ ئەوەی بڕیاری یاسایی کۆمەڵایەتیو سیاسی تەعبیر لەناخی قەناعەتی گشتی نەتەوەو بەرژەوەندی باڵای ئیسلام بکات، هەرچەندە پێویست ناکات کە ڕاو بۆچوونی هەریەکە لەتاکەکان، یان کۆمەڵێکی کەم بە تەواوەتی جێ بەجێ بکرێ هەرچەندە ئەوانە لەناو نەتەوەشدا ڕێزو شوێنێکی تایبەتیشیان هەبێت.

بەم شێوەیە توێژینەوە ئەکادیمی یەکان سەرچاوەی هێزو دانایین، بەڵام تەشریعاتە سیاسیو کۆمەڵایەتی بزافیەکان وەك ڕێنومایی یەکی کارو جمو جۆڵو قەناعەت دەمێننەوە لە ڕوو بە ڕوو بونەوەی ئەو شتانەی کە دوو چاری نەتەوە دەبێت لەپێویستی یەکانی واقعو گۆڕانکاری یەکانی ژینگەو ئەو ئیعتبارە زانستی یانەی لەدەوروبەریدا هەیەو گەمارۆی سەرکردەکانی داوە، کە پێویستە سەبارەت بە ئەوانەش بڕیارو دەست بەکاری جێ بەجێ بکرێت، بەم پێیە دەتوانین دەرك بەو ڕاستی یە بکەین کە بڕیارە سیاسیو تەشریعی یەکان وەك توێژینەوە ئەکادیمی یە پەتی یەکان نین، هەروەها دەرك بەوەش دەکەین ئەو کاریگەری یانەی کە دەبنەهۆی فشار بۆ سەر سەرکردە سیاسی یەکان، جیان لە بارودۆخی کاروباری هێزی ئەکادیمی. هەریەکە لەم بوارانەش ئیعتیباراتی خۆی هەیە. وە هەریەکەیان ئەوی تریان تەواو دەکات بەبێ ئەوەی کە مل ملانێی لەگەڵدا بکاتو ڕێگەی لێ بگرێت یان هەر ساتەی ڕووی ناراستەیەك بێتو بارێکی دیاری کراوی نەبێت

لەکۆتایی داو لە ژێرسایەی کاروانی گەورەی نەتەوەدا پێویستە دەرك بەوە بکەین کە هەموو ڕەگەزەکان لەنێو لۆژیکی سروشو بەروو بوومی توێژینەوە زانستی یە ئەکادیمی یەکانو لە بڕیارەکانی تەشریعاتی سیاسیو کۆمەڵایەتی دا خۆیان دەنوێنن، تاکوو پێکەوە بە یەکدا دەچنو کارلێك دەکەنو یەکتری تەواو دەکەن تا عەقڵی نەتەوەو ویژدانو کاروانی مێژوویی بە ئاراستەی ئیسلامو ئامانجو پەیامەکەی پێك دەهێنن، جا هەر هەڵچوونو بە گژیەکدا چوونێك لەنێوان ڕەگەزەکانی پێکهێنانی ئەم هێزەی نەتەوەدا بەر پابێ، بەهۆی خراپ تێگەیشتنە

لەناخی هەریەکە لەوانەو لەرۆڵی هەر یەکێکیان لەدروست کردنی واقیعی نەتەوەو کاروانەکەی بە درێژایی ژیان و مێژوو، جا هەر تێکەڵاوکردنێکی لەم جۆرەو خراپ لێ تێ گەیشتنێك دەبێتە هۆی لاوازکردنی هێزی نەتەوەو لە بەریەك هەڵوەشانی قەوارەکەی و بە هەدەر چوونی وزەو تواناکانی.

یەکێك لەگرنگترین ئەرکەکانی زانایانی بواری توێژینەوە سیاسی و کۆمەلایەتی یە ئیسلامی یەکان ئەوەیە کە دەبێت نەگۆڕەکان (الثوابت) لە هێزو قەوارەی نەتەوەدا دیاری بکەن، لەگەڵ دیاری کردنی شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ نەتەوەدا لەبواری بونیادی تەشریعی و ڕێکخستندا، هەروەها لەڕووی ڕوو بە ڕوو بوونەوەو بەرەو پێش چوون و گۆڕاوەکان(المتغیرات).بەشێوەیەك کە بنیادی سەرکردایەتی و دەستوری نەتەوە سووکایەتی پێ نەکرێت و بتوانێت توانای سیاسی و تەشریعی و ڕێکخراوەیی بەشێوەیەکی زانستیی کاریگەر بهێنێتەدی.

ڕوون و ئاشکرایە کە سستەم و دامەزراوە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاتی یەکان ناکرێ تەعبیر لە(پێداویستییە رامیاری یەکان)ی نەتەوەی ئیسلامی بکەن. نەتەوەی ئیسلامی لەسەر شێوەیەکی جیاواز لەو نەتەوانەی تر، ڕاستی و ماف و داد پەروەری بە کارێکی پێویست و پیرۆز دەزانێ، حەقیقەت و ڕاستی لەسروش و زایندەی پاکو ژیری دا دەبینێ وەك حەقیقەتێکی بابەتی یانەیەو هەوڵ دەدا پێی بگات، ڕاپرسی و ڕاوێژیش بە پرۆگرامێکی بنەڕەتی دەزانێ بۆ گەیشتن بەو حەقیقەت و ڕاستی یە، وە هێنانەدی ئەو ڕاستی یە بە ڕێگەی دروست دەزانێ بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندی گشتی و تایبەتی لەواتا ئیسلامیەکەیدا، ئالێرەشدا دڵنیا دەبین کە ڕوو بەڕوو بوونەوەو قالب گەری حزبایەتی ڕۆژئاوا هەرگیز ئەو حەقیقەتە بابەتیە بەدی ناهێنێت و ئەو بزافەی ڕاوێژی ئیسلامی پێی گەیوە پێی ناگات، هەر وەکو خۆسەپاندن و فەرمان ڕەوایی و دەست بەسەرا گرتنی هاوشێوەی سستەمە ڕۆژهەلاتی یە مارکسی یەکانیش کە بەبێ ڕاوێژو پرس لەلایەن تاقمێکەوە مومارەسە دەکرێت ناگەنە شێوازو تەواویەتی ڕاوێژی ئیسلامی، ئەوەی ئەوان کارێکە زۆر دوورترە لەئایینی ئیسلام و سستەمەکەی.

پێویستی سەرشانی بیریارو لێکۆلەوەرانی ڕامیاری و کۆمەلایەتی موسڵمانانە کە لێکۆلینەوەو باسەکانیان قووڵ بکەنەوە بەرەو ڕەگو دەرچەکان و ئەو بنەمایانەی کە شارستانی یەتی نەتەوەکانیان لەسەر دامەزرێنراوە تاکو جیاوازی و ڕەنگ دانەوەکانی لەسەر سستەمو مومارەسەو ڕاپەڕاندنەکاندا تێ بگەن.

گەلان و ژیاری ڕۆژئاوایی سەردەم لەناوەڕۆکدا لەسەر چەمکی ژێریانەی ماددی پەتی دامەزرێنراوە بەڵام لایەنی بەهاو ڕەوشت و گیانی ئاینی ئەوە پاشماوەی کەلەپوورو شوێن کەوتەیی یە کە ناتوانێ خۆی لێ ڕزگار بکرێت بەهۆی هێزی ڕێژە شارستانی یەتی ئیسلامی یەوە لو کاتانەی کە ناو دەبرێت بەسەدەکانی ناوەڕاست وە بەهۆی ئەوەوە جۆشی خواردوە لەگەڵ قەوارەی ئەو نەتەوانەدا کە نەتوانراوە لێك جیا بکرێنەوەو دواتر چاکسازیش بەسەر ئاین و کەنیسەدا هێنرا.

وە لەبەر تیشکی ئەم ماددی یەتە عەقڵییەدا تاك سستمە دیموکراتی یەکان دامەزراوە کەوا دەزانێ بیرۆکەی زۆر بینەی پەرلەمانی باشترین وێنەو شێوازە بۆ بەدی هێنانی ئەو پەڕی ویستی تاکە کەس لەئارەزووە دەروونی یەکانی بەو پێ یەی بیرو ڕاو ئارەزووی خۆی بڕیاری لەسەر دەدات. بەمەش دەردەکەوێت کە بڕیاری دیموکراتی بڕیاری زۆرینەیە لەپێناوی بەرژەوەندی ئەندامانی نێو هاوپەیمانێتی یەکەی لەوەدا کە خۆیان دەیانەوێت پێش لەوەی کەمینە بتوانێت دژی بوەستێت و هیچی پێ بکرێت جگە لەدەنگ پێ نەدان.

مارکسی یەتیش هاتە پێشەوەو سەری هەڵدا وەك بزووتنەوەیەکی چاکسازی ڕۆژئاوایی کە توانی بنەماکانی ژیاری ڕۆژئاوا بگەیەنێتە جێی مەبەست کاتێك کە ژێری مرۆڤی کردە بت و خواوەندو ئینکاری ئاینی کردو بێ باوەڕی خۆی بەئاشکرا ڕاگەیاندو مرۆڤی لەماددەو داخوازی و هەوڵە ماددی گەرایەکەیدا کۆتایی پێ هێنا، و وای دانا کە ئابووری و پێویستی یەکانی ماددی ئەو پەڕی داواخوازی و ڕێڕەون بۆ مرۆڤ لەژیان و مێژوودا، بەمەش مێژووی مرۆڤ و قەوارەکەی بوونە زۆردارێك و بەسەر مرۆڤدا سەپێنران و واتاکانی ویست و ڕۆڵی مرۆڤ نەمان، لە سێبەری ئەم بیرەشدا سستمی خۆ سەپێنەری وا دامەزرا کە پاڵ بە کۆمەڵانێکی زۆری مرۆڤەوە بنێ و وەك ئاژەڵ بەر خۆیاندا، ئەوەی جێی کەڵکە کە لێرەدا هێمای بۆ بکەین ئەوەیە کە هۆی ڕاستەقینەی بێ بەشی و دابڕانی ڕۆژئاوا لەبەهرەی سروش بەڕەهەندە کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و ڕوحیەکەیەوە و گلانی بەدوای ماددییەت و عەقڵ کاریەوە هۆکاری سەرەکین بۆ قەیرانە کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕەوشتیەکەی.

ئەوەی کە واپێویست دەکات جێی سەرنج بێت ئەوەیە کە ئیسلام لەگەڵ بیری ڕۆژئاواییدا جیاوازە لەبنچینەو بناغەی هەنگاوەکانیدا، ئیسلام دان دەنێت بە ڕەهەندە جیاوازەکانی قەوارەی مرۆڤداو دان دەنێت بەوەدا کە ئامانجی بوونی

مـرۆڤ درێژەپێـدان و بەردەوامی‌یـەتی لـە ئـازادیدا لـە هـەڵبژاردنی لـەنێوان ڕاسـتی و چـەوتی، ڕەواو نـاڕەوادا، چاکـەو خراپـەدا، ئەمـەش هـەنگاو هەڵگرتنێکـەو فەلسـەفەیەکە کـە ئـاوات و ئامـانج و ڕەوایـی دەکاتـە ڕاسـتییەکی بابـەتی یانـە، لەدەرەوەی قـەوارەو ویستی مرۆڤدا، کە لەسەری پێویستە هـەوڵی بـۆ بـداو خولیـای بێـت، لەبـەر ئـەوەو واتـای فـەرمان ڕەوایـی کـردن لەئیسـلامدا فـەرمان ڕەوایـەتی زۆرینـە نی‌یـە واتـا(دیموکراتی‌یـەت)، بـەڵکو ڕاوێژەکـە بریتی‌یـە لـەپرس و ڕاو ڕاوێژکـردن و چـاو خسـتن بـۆ زانـین و ناسـین و گەیشـتن بـەوەی کـە کامـەیان ڕەواو ڕاستەو باشە لـەوەی کـە دەخرێتـە ڕوو بۆ نەتـەوەو جەماعـە لـەکاروبارەکان، ئـەویش بەپێی ئاڕاستەکانی سروش و سوننەتەکانی ژیـان و پێداویسـتی یـەکانی جەماعـە بـێ گوێدانـە هـەواو ئـارەزووی نادروسـتی هـەندێ کـەس. بـەم پـێ یـەش شـورا دەرچـەو ئامـانجێکی جیـای هەیـە لەدیموکراتیـەت هەرچـەندە هـەندێك لەیـەك چوونیـش لەهـەندێك ڕووەوە هـەبێت وەك پێویسـتی پابـەندبوون بەزۆرینـەی دەنگـەوە ئەگـەر ڕاسـتی نـا ڕوون و لێـڵ بـوو، وە پێویسـتمان بـەبڕیارێك هـەبوو کـە نـەدەتوانرا ڕای کـۆ(الاجمـاع)ی بـۆ بەدەسـت بـهێنرێ، کـە لـەو حاڵەتـەدا ڕای زۆرینـە بەڕاسـت وەردەگیرێ و بڕیارەکەش بەلای خـوارەی مـەقبوڵ لەقەڵـەم دەدرێ بـۆ بـەجێ هێنـانی هـەر بڕیـارێکی گشـتی.

دەزگاکـانی ڕاوێـژو یاسـاکانی بـێ گومـان دەبـێ ڕەنگدانـەوەی سروشـتی ڕاوێژیـن لـەداواکردنی مـاف و ڕاسـتی و چاکـە لـەتوێی فەرمایشـتی سروشـداو لـەتوێی پێویستیەکانی زایینـدەو ڕەویەتـەکاندا، بەمـەش بـێ گومـان جیادەبێتـەوە لەسسـتمە دیموکراتـی یـەکان و دامـەزراوەکانیان و کارەکانیـان کەهـەوڵی بڕیـاری خـودی دەدات لـەئارەزوو حـەزەکانی ئەندامـەکانی‌دا کـە هـاودەنگن هـەڵ دەقوڵـێ و دەسـەڵات دارو دەسـت ڕۆییـون، بەرژەوەندی خۆیـان و نەتـەوەکانیانی تیـا بـەدی دەکـەن.

چـاك وایـە بزانـین کـاتێك زانسـت و پابـەندی پێـش وەخـت بـە بنـەماو ڕێسـای دیاریکراو پێویسـتن بـۆ هـەر لایـەنێکی سسـتمە کۆمەڵایەتیـە ڕۆژئاواییـەکان بـۆ نموونـە سسـتمی داد وەری تەنانـەت ئەگـەر یاسـای سـوێند دراوانیـش واتـە شـەریکی هـەڵبژێرراویان بۆ دانرێت تـا حوکم بەسەر تاوانکـاردا بـدەن بـدەن، ئەمـە مانـای وایـە کـە سسـتمەکەو دام و دەزگاکـانیش سروشـتیان و سروشـتی پێویسـتییان بـۆ زانسـتی پێش وەخـت تیایـاندا ڕەنـگ دەداتـەوە، بۆیـە دەبێـت دادوەری پسـپۆڕ لەتـەك حاکمـە

سوێند دراوەکاندابن بۆ ڕێنمایی و ڕوون کردنەوەو تەماشاکردنی بڕیارەکان لەپێش وەختدا.

جا هەرچەندە سستمی سیاسی ئیسلامی جیاش بێت لەسستمە سیاسیە دیموکراتیە ڕۆژئاواییەکان لەڕووی سروشت و دەرچەکانیەوە بەلام هەردەبێت دامەزراوەو دام و دەزگاکانی هەمان سروشتیان تیا ڕەنگ بداتەوە. پێویستە ئازادی ویست و بیرو ڕاو هزرو بەجێ هێنانی کۆمەلایەتی ڕەنگ بداتەوە لەسستمی سیاسی ئیسلامی‌دا، هەروەهاش قەناعەت و پابەندیە باوەڕییە کەشی کە لەسەر مەبەستی چاکەو داد بۆ هەموان بەندە بەپێی بنەماکانی سروش و سونەنی فیطرە بە شێوازی ڕاوێژی شایستە، ئەمەش پەیدا نابێت لەڕێی ئەو سەرکردانەوە نەبێت کە نوێنەری کۆمەڵن و لەوا نیشەوە هەڵقولاون و دارای زانست و پابەندین و ئەمینن لەسەر دام و دەزگاو ژێر دەست و کارو باردا.

بەلکو ئەم خستنە ڕووە گرنگیی بینیەی گشت گیری ڕوون بکاتەوە بۆ تێ گەیشتن لەسستم و ڕژێمەکان و بەراورد لەنێوانیاندا، وە کۆمەکمان پێ بکات لەسەر کێشانی هێڵ و نیشانە سەرە کیەکان وەك سەرەتایەکی بیرکردنەوە لەڕێساو یاسا گەلێکی ڕەسەنی ئیسلامی سوود مەند لەئەزمونی خەڵکانی تر بە بابەتیانەو دوور لە لاسایی کوێرانەی کاروانی ئەوان کە دەرچەکانمان لەیەك جیایەو ئامانجمان وەك یەك نیە.

کەواتە ئەەو یاساو سستمە کامەیە لەروح و واتای ئیسلامی دەر دەبڕێت لەگۆڕەپانی کردەی سیاسی‌داو چۆن دەکرێ بەدی بێت؟

گومان لەوەدانی‌یە کە سیستمی ئیسلامی کۆمەڵێ مەرج و شایستەیی عەقیدەیی(ئایدۆلۆژی)و دەستووری تایبەتە کە پێویستە کارامەییان تیا دەستەبەر کرابێ لەشێوازی پەروەردەکردن و ڕۆشنبیرکردن و وشیار کاری سیاسی و لەڕێبازی کاری سیستمی سیاسی ئیسلامی و دامەزراوە ڕامیاری و یتاسایی‌یە کانیەوە، هەروەکو ئەوەندە کیفایەت و نەرمی پێویستە لە ڕێکخستنی سیاسی لایەنە سیاسیەکاندا کە ڕاوێژو شارەزایی و کارامەیی پێویست برەخسێنێ تا نوێنەرایەتی ڕوانگەو بینیەی ئیسلامی بکات و بەئەمەك بێت بەرانبەر مەرجەکانی جێ بەجێ کردنی، ئەمەش ڕەنگە واتای فرە ئاستی‌ی لەدەسەلات و فرەیی ئەنجومەنەکانی ڕاوێژو بڕیار بگەیەنێ بەپێی پێویستی کردەیی لەبارە بنچینەیی یەکانی ژیان و کەرت و کارە کۆمەلایەتی‌یە گرنگەکاندا.

ئامرازەکانی دەربرین و ڕێکخستنی سیاسیش بەپێی خۆیان دەبێت هێندە نەرمییان پێوە دیاربێت کە نوێنەرانی نەتەوەو سەرکردایەتی یە ڕامیاری یەکەیان بتوانن لەجووڵەیەکی سیاسی پتەوی دامەزراو لەسەر بنچینەی قەناعەتە نزیکداندابن لەهەر مەسەلەیەکی گرنگدا. پارتە ڕامیاری یەکان لەسیستەمی ڕامیاری ئیسلامیدا زیاتر بە کۆمەڵ بوونە پەرلەمانی یەکانەوە نزیکترن کە مل کەچی کۆت و هەڵوێستە پارتی یە پێشترەکان نین، کارو ئاوێتە بوونیان لەگەڵ ڕووداوەکانیان بیناکراوە لەسەر قەناعەتە بابەتی یەکان و ئەوەی ڕاوێژ بەدەستی خستووە لەکار بەجێی و واتاو پرۆگرام بۆ هەڵوێست وەرگرتن و بڕیار دەرکردن.

وە لەگرنگترین هەنگاوەکانی کە ئێمە ئاواتە خوازی سەرکەوتنینی و بەئاواتی گەشەکردن و بڵاوبوونەوە ببین ئەو هەنگاوانەیە کە پارتە حوکمڕانەکانی هەندێک وڵاتی ئیسلامی ناویانە، کاتێک کە ڕێگەیاندا بەدروست بوونی چەندەها پارتی ڕامیاری و لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک سەرکردەو سەرکردایەتی ئیسلامی بەهێزیان هێنایە نێو ریزەکانی خۆیان، کەپابەندن بەئیسلامی ڕاست و دروست و داناو بە ئاگان لەواقعی سیاسی و ڕێزی جەماوەریشیان مسۆگەر کردووە،بەم پێیە ئەم پارتانە هەموو گرۆ سەرکردەیی یە بەتواناو کاریگەرە کانیان گرتۆتە خۆ، کە بۆتە هۆی نەرم گیری لەبڕیاردانی سیاسی و ڕاوێژ کاری و ئاوێتە بوونی لەگەڵ گشت چارەسەرە گونجاوەکاندا.

ئەوەی کە دەیبینین لەپەرە سەندنی ژیانی سیاسی هاوچەرخ دا کە بە (دەوڵەتە پێشکەوتووەکان) دەناسرێت، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چۆن دەکرێت ڕۆڵی نەتەوە لەڕێکخستنی ژیانی سیاسی دا لەگەشەو گەورە بووندا بێت و بیشیپارێزێ لەگەندەڵی، هەروەها کاریش بکات بۆ وەدەست هێنانی دوانگە سیاسیەکان و بەرەو پێش بردنی کاری سیاسی بەشێوەیەك کە سەربەخۆیەتی زیاتر بۆ سەرکردایەتیە سیاسیەکان و بابەتییەتی بڕیارەکان مسۆگەریکات، لەگەڵ مسۆگەرکردنی نوێنەرایەتی ئەو سەرکردایەتیانە بۆ جەماوەرو بەرژەوەندی بالای نەتەوە. هەموو ئەمانە پێویستە ببنە فاکتەرێکی هاندەر بۆ بیریارو یاسا دانەری موسڵمان لەپێناو خستنە سەرکاری سستەم گەلی جێگرەوەی وا کە گونجاو بێت لەگەڵ پێداویست و سروشتە پێکهاتەی عەقیدی و دەروونی نەتەوەدا بێ ئەوەی ناچاری لاسایی و خۆ هەڵواسین ببێت.

ئەگەر بڕوانینە ئەو گەورەبوونەی قەوارەی ئوممەتی ئیسلامیو گەشەسەندنو بڵاوبوونەوەی کە لەسەر ڕووی زەوی بەدی هاتووە،و کە ڕەگی چۆتە ناو کۆمەڵگای جۆر بەجۆری مرۆیی لەڕووی ژینگەو مێژوو و ژیارییەوە، هەست دەکەین ئەگەر بەرپرسی لە حوکمڕانیدا بەسەر ئاستە جیاوازەکان لە(شارو لادێ، موقاطعەو ولایات) دا دابەش بکرێت بەشێوازێکی بەکگرتوویی هاوپەیمانی(کۆنفدراڵی) کە نەرمی تیابێت، ڕەنگە شێوازێکی گونجاو بێت لەگەڵ بارو دۆخی هەنوکەیی وڵاتە ئیسلامییەکاندا، وە ئاسانکاری بێت بۆ کاری سیاسی قیادییەکانی، هەروەها چوار چێوەیەکی شیاوتر بێت بۆ بەشدار بوونی تاکو گرۆکانی ئوممەت لەهەڵگرتنی بەر پرسیارێتیدا.

پێویستە پێشەکیە ئیسلامیەکان لەزانستی سیاسەتو کاری سیاسی ئیسلامیدا ئەو حاڵی بوونە لەسستمی خەلافەت کە دەڵێت سستمێکی مێژوویی پەتی بووەو تەنها لاسایی و بەر چاوگرتنی ڕەوشە مێژووییەکەی کۆنی بەسە، دەبێت ئەو حاڵی بوونە بگۆڕدرێت بەوەی کە خەلافەت سستمێکی بزاوتییە تێ دەکۆشێت بۆ بەدی هێنانی ئامانجو مەبەست گەلێکی دیاری کراو، وە هەوڵی پتەوکردنی بەهاو بنەما گەلێکی دیاری کراو دەدات لەژیانی مرۆییدا، لەبەر خاتری بەرژەوەندیە دینیو دنیاییەکانی ئوممەت.

بۆیە چاوگێڕانەوە بەسستەمو دامو دەزگاکاندا لەپێناو داڕشتنەوەیان بەشێوەیەك کە خزمەت بە ئوممەت بکات کارێکی ئیسلامیەو جێی خۆیەتی.

ئەو گومانەی لەدڵی زۆر لەتوێژەواندا دروست بووە کە گوایە سستمی خەلافەت سستمێکی بەستوو بێ گیانە لەسەر بنەمای ناوەندێتی دەسەڵاتو حوکم بەرپابووە، گومانەو هەڵەیە تەنها حاڵی بوونێکی ڕواڵەتیو کەمو کوڕە کە دەبێت بەپێرۆزو دروست نەزانرێت، چونکە هەر سستمو ڕێکخستنێکی سیاسی کە ئوممەت بەرپای بکاتو پێی ڕازیبێت وە لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجو مەبەستە دینیو دنیاییە ئیسلامیەکانیدا بێت، ئەوە کرۆکو پوختەی سستمی خەلافەتەو پێویستە ئوممەتی ئیسلامی هەوڵی گێڕانەوەو بەدی هاتنی بدات، وە نابێت توێژەران ئەوەندە بەلای ڕواڵەتە مێژووییەکاندا لابکەنەوە کە لەناوەڕۆك دایان بڕێتو چەمکەکان تێکەڵ ببێتو دیدەکان ئاوەژوو ببنەوە بەرەو سۆزکاریو ئەندێشە.

هەروەها لەپێشەکی و سەرەتا ئیسلامی یەکانی زانستەکانی سیاسەتەکە دەبێت رۆڵی ئامانج و مەبەست و بۆ چوونە ئیسلامییەکان و کاریگەرییان لەسەر ژیانی نەتەوەو سستەم و دیدو جیاوازی شوێنکەو بەرژەوەنیدا بزانرێت و لەبەر چاو بگیرێت.

چەمکی واقع گەرایی و ئەندێشەگەرایی بۆ ئەم جۆرە دۆزانە چوار چێوەیەکی فکری سیاسی رۆژئاوایین، کە پێی وایە رەوشت و پێوداندگەکان دژن بەواقع و پێداویستەکانی بۆیە هەوڵی لاوازکردن و سڕینەوەی دەدەن.

جا ئەگەر مرۆڤی رۆژئاوایی ئەو بیانوەی بەدەستەوە بێت و بوار بێت لەوەی کە ئامێرو کەرەستەی ئەو دیدە هەموایەتیەی بۆ بوونەوەر پێویستە لای دەست ناکەوێت بەهۆی ترازانی رۆشنبیرییەکەی لەسەرچاوەی سروش کە حەقق و باطڵی لا تێکەڵ کردووەو متمانەی بەنیشانەو بەڵگە نەماوەو تەرازووی مامەڵە لەگەڵ فیطرەی مرۆییدا لەنگ بووە لەلای، ئەوە لەئیسلامدا بوارو جێ نیە بۆ ئەو ئەندێشە گەرایییە، لەئیسلامدا باوەڕوایە کە ئامانج و مەبەست و ئاراستە لەئەسڵی ئەو بەدیهاتن و فیطرەو رەوییەدان کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر راوەستاوەو هیچ پەیوەندییەکیان بەئاوات و خۆزگەی مرۆڤەوە نیە.

لە ئیسلامدا روو بەڕوو وەستان لەنێوان رەواو نارەوا دایە، لەنێوان خێرو شەڕدایە، لەنێوان هیدایەت و رێ وَنکردندایە هەروەها لەنێوان خۆ یەکلایی کردنەوەو لادلاندایە. لەسستەمی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ئەندێشە گەرایی و واقع گەرایی نەخشێکی نیە، بەڵکو حەق و هیدایەت و خۆڕاگری هەیە لەبەرانبەر فەسادو لادان و رێ وون کردن، کە ئەمەش بەئەندازەی پابەندی و هەست بە بەرپرسی و هەوڵ و جیددییەتی کۆمەڵگەو تاکەکان زیادو کەم دەکات.

ئەگەر رێنمایی سروش و هەستی فیطرەی دروست بۆ حەق و دادو چاکە لابرێت لەدەروونی مرۆڤدا تەنها پاڵنەری شەڕو خراپەو دەست درێژی دەمێنێتەوەو. رێک راوەستاوی بۆ کۆمەڵگەی ئادەمیزاد نایەتەدی بەبێ کاریگەری حەق و رەوشتداری مەبەست و بەدوای دادو خێردا گەڕان. چەندە رەوشت و بەها راست و بەرز بێت ئەوەندەش کاری تاک و کۆمەڵ رێک دەوەستێت، ناتوانین دەست بەرداری حەق و رەوشت بەرزی ببین ئەگەر بمانەوێت واقع دروست و پەسەندو پارێزراو بێت لەکاریگەری فەسادو لادان و سەرلێ تێک چوون.

هەروەها گرنگیشە کە فیکری ئیسلامی هاوچەرخ پاك بكرێتەوە لەچڵكی ناتەبایی‌و جیا خوازی‌و كاریگەری رەهەندی جیای كاتی‌و جێیی كە بوەتە هۆی ئەوەی دەقەكان لەشوێنی خۆیان‌و حەقیقەتی مەبەستیان بترازێن‌و دۆخی زەمانی‌و مەكانی پشت گوێ بخرێن، كە بوە هۆی ئەوەی خەڵكانی تر هەلەكە بقۆزنەوەو بەپێی مەبەست‌و ئارەزووەكانیان حوكم‌و سیاسەت پیادەبكەن، لێرەدا بەهۆی كێشمە كێشی نێوان فارسی گەری‌و تیرەگەری عەرەبەوە دەعوای سەرخستن‌و پشتگرتن بۆ بنەماڵەو بنەچەو رەگەز سەری هەڵدا وەك بیانوویەك بۆ فەرمانڕەوایانی عەرەب لە بنی امیەو دواتریش تیرەكانی(جنوب) - كە دانیشتوی وڵاتی شام بوون - حوكم‌و فەرمانڕەوایی یان بۆ ئەوان بەڕەواو پەسەند دەزانی لە لایەكەوە، لە لایەكی تریشەوە بۆپشت گرتنی ئەوانەی كە دۆڕابوون‌و توورە بوون لەنەوەكانی ئیمپراتۆریەت‌و شارستانیەتی دۆڕاوی وڵاتی فارس‌و دانیشتوانی(شمال) كە لەوڵاتی عێراق نیشتەجێ بوون،

هەروەها ئەو حیكمەتە سیاسیەش كە رەچاوكرابوو لەگرتنە دەستی قورەیش بۆ كاری خەلافەت گۆڕدرا بۆ دەعوای بنەماڵەیی‌و رەگەزی‌و ویصایەت‌و خۆ بەپاكتر زانین‌و داكۆكی كردن‌و بیانوو هێنانەوە بەهەندێك دەق كە بۆ بارودۆخێكی تایبەت دابەزیبون ئەمەش تەنها بۆ هێشتنەوەی دەسەڵات‌و حوكمڕانی خۆیان - ئەمەش لەكاتێكدا كە تیرە عەرەبەكان یاخی بوونی سیاسی‌ی خۆیان ڕاگەیاند دژی یەكەم دەوڵەتی ئیسلامی لەمەدینەدا. بەناوی بانگەشەی یەكسانیشەوە دەنگی خەوارج‌و ئاژاوە گێڕی بەرز بۆوە دژی هەر خاوەن ماف‌و شایستەو خاوەن رێزو توانایەك كە شایانی بەڕێوەبردنی نەتەوەو ئاسایش‌و پاراستنیەوە بوو. ئەم بانگەشەیەش تەنها بۆ دەرچوون بوو لەفەرمانی جەماعەو بیانوو بوو بۆ ئاژاوەگێڕی‌و لەت‌و پەت كردنی وڵات‌و ناحەزی بوو بۆ بەرپرسان‌و خاوەن دەسەڵاتانی سیاسەتی ناوەندیی ئوممەت.

بەم شێوەیە نەتەوەو بیریارەكانی لەناوەڕۆكی یەكتاپەرستی دابڕان لەبواری حوكمڕانی‌و واتای شوراش سەبارەت بە بیناكردن‌و بەڕێوەبردنی كاروباری ئوممە، بەرەو بە یەكدادانی دەقەكان‌و بەگژ یەكادانی دەعواو بانگەشەكان، كە بەمەش ئوممەتی ئیسلامی هێزی ئەوەی لێ بڕا بتوانێت پەیامی ئیسلام هەڵگرێ‌و بیگەیەنێت‌و سستم‌و كۆمەڵگاكەی دابمەزرێنێت.

بە ئیسلامی کردنی ژیانی سیاسی مانای ئیسلامی کردنی بۆ چوونو پەروەردەیە، بە ئیسلامی کردنی بنکەو سەرکردایەتیو ڕێکخستنو هەڵسوکەوتەکانە، مانای پابەندییە بە بەها سەرەکیو مەبەستە ئیسلامییەکانەوە، بەپێی پرۆگرامێکی شوورایی کرداری واقعی دروست،و پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانی نەتەوەو بناغە سیاسیە کەیەتی لەسەر ئەو پابەندییو پەیڕەوە دروستە ئاسانکراوە.

بەڵام ئیسلامی کردنی توێژینەوە سیاسیەکان مانای پابەندییە بوونە بەئامانجە ئیسلامی یەکانەوە لەگەڵ سەرچاوەکانی هزری ئیسلامیو پرۆگرامەکەیدا، هەروەها توێژینەوە لەواقعو سستمو پەیوەندییەکان بەشێوازو هۆکاری زانستیانەی گونجاوو ڕاست لەبەر ڕۆشنایی ئەو پابەندییەدا،و لەڕێی ئەو پرۆگرامەوە، ئامانجیش لەوە ڕوونکردنەوەی دیدو ڕوانگەو، ئاسانکردنی تێگەیینو لێکدانەوەی سیاسیو پێشنیارکردنی چارەسەریو بدائلی سیاسیی ئیسلامییە.

هەروەها گرنگیشە لەپێناو تێگەیشتن لەشوێنگەی فکری سیاسیو کۆمەڵایەتی سەلامەت، بزانین کە پەند وەرگرتن لەکۆتاییدا بەجۆری دەرك پێکردنی هزری کۆمەڵایەتییە کە ڕەنگ دەداتەوە لەسەر جۆری بڕیاری سیاسیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی موسڵمان، ئەم بڕیارەش بەرەنجامی کارلێکردنی دەق واتە سروشو مەبەستە ئیسلامییەکانە لەگەڵ فیطرەو ژیانی واقعیدا لەڕێی دەرك پێکردنی سەرکردایەتیو بڕیارو مومارەسەکانییەوە، لەبەر ئەوە چەمکی قورئانی بەڕوونی ئەم پەیوەندیو پێك بەستنەی نێوان ئەم بەشانە بەبێ لێك دابڕان دەخاتە ڕوو وەك خوای گەورە دەفەرموێ﴿ أطيعوا الله وأطيعوا الرسول واولى الامر منكم ﴾ النساء: ٥٩. واتە: (گوێ ڕایەڵی فرمانەکانی خواو فرمانەکانی پێغەمبەرو سەرکارەکانی خۆتان بکەن). گوێ ڕایەڵیو بەر فرمانیو مومارەسەش ئیسلامی یانە نابێتلەڕێی دیدێکی پەتیی تیۆرییەوە بۆ دەقەکانی سروش، بەڵکو دەبێت لەمیانەی کارلێکی کرداری نێوان دەقو واقعی ژیاندا ڕەنگ بداتەوە لەسەرکردایەتی یەکی ئیسلامی یانەی پابەندی ئەوتۆ کە نوێنەرایەتی نەتەوە بکات، وە ڕەنگ دانەوەی ئەو واقعە بێتو لەدەرچەی ئەو پێداویستیو ئەو ململانێ یانەی کە ڕوو بەڕووی دەبێتەوە دەربچێت، بە ئاڕاستەی حیکمەتی دەقو مەبەستەکانی، خۆ ئەگەر وانەبێ ئەوا دەقی سروش(الكتاب والسنه) وەك هەموو

دەقێکی تر دەبێتە شتێکی نوسراوو وشەیەکی بێ گیانو هۆکارێك بۆ لێك هەڵوەشانو ئامێرێك بۆ لێك دوورخستنەوەو بوارێك بۆ خراپ لێ تێ گەیشتنو بەر بادیی یەکانی هزر.

نابێت نەتەوە سارد بێتەوە لەوەی کە لەنێو ڕیزەکانیدا سەرکردایەتی یەکی ئیسلامی یانەی پابەند دروست بکات، ئەم شێوە سەرکردایەتی‌یە مەرجی سەر بەنەتەوەیە تی‌یەو ڕێگەشە بۆ سوود بینین لەسروشو ئاراستەکانی، وە ناشبێ ئەو دووانە لێك جیابکرێنەوە، جا ئەگەر پرۆگرامەکانی هزری خۆمان چاك کردەوە ئەوا بێ گومان دەشکەینە ئەو چەمكو هۆکارانەی کە بناغەیەکی ئیسلامی یانەی کۆمەڵایەتی بەر فراوانیان لەسەر بنیات بنرێت، وە سەرکردایەتی یەکی ئیسلامی یانەی بەتواناو پابەندیان لێ هەڵ بقولێت.

ئەو هزرە ئیسلامی یەی کە پێش بینی یەکانی لەسەر دەستی گەورە پیاوانی وەك پێشەوا (ماورودیو* ابن تیمیەو* فەیلەسوفی بیریار فارابیو* سیاسەت مەداری فەیلەسوف ابن خلدون) دەرکەوتو چرۆی کرد پێویستە کە ئەمڕۆ زیاتر پەرە بسەنێتو ڕەهەندە زانستی یەکانی تەواو بکاتو درێژە بەتوێژینەوەپرۆگرامی‌یە کانیان بدرێت تا ئەو هۆکارانە دابین بکرێت بۆ ئەوەی نەتەوە بتوانێت بەڕۆڵی شارستانیانەی گرنگی خۆی هەڵسێ.

## ٣ـ ئیسلامییەتو زانستە تەکنەلۆژی‌یەکان:

لەقۆناغێکی ڕابردووی ژیانی نەتەوەکەماندا،و لەژێر ئەو فشارە ژیاریو شارستانی یەی کە لەلایەن خۆراواوە خرایە سەر نەتەوەکان،و بەهۆی لێل بینیو هزر لاوازی یەوە، ڕۆشنبیرە موسڵمانەکان دوو بابەتیان تێکەڵاو بەیەکتر کردووە:

یەکەمیان: بابەتیانەی حەقیقەتو سروشتو مۆركو(سونەن).

دووەمیان:بەکارهێنانی خۆیی مرۆییو کۆمەڵایەتی بۆ ئەو حەقیقەتو سونەنو مۆركو بونەوەر یانە،

ڕۆشنبیرە موسڵمانەکان پێشوازییان لەشارستانێتی خۆراواو مەعریفە جۆراو جۆرەکانی کردو بەگشتی هەموویان وەرگرتو لاسایی یان کردەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە ژیارو مەعریفەیەکی بابەتیانەیە بەخۆیو هەموو زانینە کانیەوە بۆ سونەنو سروشتی شتەکانو، بەکار هێنانیان لەخزمەتی مرۆڤی خۆراوادا بکات، خەسڵەتی گشتگیرانەی بابەتیانەیان دایە پاڵ هەموو جۆرە شارستانیەتێکی

خۆراوایی‌و مەعریفەکانی، وایان داناوە کە هزری خۆراوا هزرێکی بابەتیانەی بێ لایەنەو جێ بەجێ کردن‌و یەکارهێنانە کانیشی ڕەهاو جیهانی‌و بێ لایەنانەیە.

بەپێشکەوتنی هوشیاری مرۆیی‌و پتەوبوونی پەیوەندی نێوان نەتەوەو شارستانیەکان، زۆربەی زاناو بیریارەکان دانیان بە تایبەتمەندێتی زۆربەی لایەنەکانی هزری مرۆیی‌دانا، وە دانیان بە تایبەتمەندێتی برێکی زۆری چەمك‌و مەبەست‌و ژیارو مرۆڤایەتی‌و پراکتیزە کردنی ڕاستیەکان‌و سونەن‌و یاساو چەمك‌و بەهاکان‌و بەکارهێنانی کەرەستەکان‌و بونەوەریاندا نا.

بەمەش ژیاری خۆراوا - کە وەك هەموو ژیارە مرۆییەکانی تر - شارستانیەتێکە لەعەقیدەو کەسێتی‌و ڕووکارو مێژووی خۆیەوە هەڵقوولاوە، تەعبیر لەوانەش دەداتەوەو بۆ هێنانەدی ئەوانە کار دەکات، بەڵام لەلایەکی ترەوە سەرچاوە مەعریفیە گشتی‌یە ڕەببانیەکانیشی لەدەست داوە، لەگەڵ پشکی خۆی لەڕووی ڕێنمایی خوایی‌یەوە، ئەمەش بەهۆی دوو چاربوونی بەو لادان‌و گۆڕانکاریانەی بەسەریا هاتووە، تا لەکۆتایی‌دا بوو بەشارستانیەتێکی جورنی ئەوتۆ کە زۆربەی کاروبارەکانی لەسەر ئارەزوو کاری‌و حەزو پێداویستییە مادیەکان — بە تەنها — بەندە، لەئەنجامی ئەمەشدا بوو بەشارستانیەتێکی مادیانە، کە تاك‌و حەزو ئارەزووەکانی کردووە بەخوا وەندی خۆی‌و دەیپەرستی‌و مرۆڤ لەهەموو ئەو پەیوەندیە دادەڕنێت کە پەیوەندیان بەلایەنی ڕۆحی‌و گشتیەتی لەبوونی خۆی‌و ئامانج‌و مەبەستەکانیەوە هەیە لە ژیانیدا، لەبەر ئەوە هەرچەندە ئەم شارستانیەتە گەلێك بەرووبوومی مادی بەدەستەوەداوەو چەندین ئامانجی مادیانەیشی پێکاوە، بەڵام ئەو گەلانەی پابەندن بەو شارستانیەتەو مرۆڤایەتیش بەگشتی، لەپشتی ئەم ژیارەوە لەبارێکی دەروونی شڵۆقدا دەژی، دوو چاری مایەپوچی لایەنی ڕۆحی بووە، لێك هەڵوەشاوەو مل ملانێیەکی کۆمەڵایەتی دژوار ڕووی تێ کردووە، جەنگ‌و کاولکاری هەڕەشەی لێدەکەن چەندین ترس‌و قەیران دەوری داوە.

گرنگە ئەو ڕاستیە بزانین، کە مەعریفەی خۆراوایی هەمووی بابەتیانە نیە، جا ئەگەر بابەتەکانی زانستی کۆمەڵایەتی خۆی لەخۆیدا بوارەکانی توێژینەوەیان ئەمرۆ تاڕادەیەك تێگەیشتن‌و دەرك پێکردنیان ئاسان کرابێت، ئەوا زانستە تەکنەلۆژیە کانیش لەڕاستیدا جیاوازی یەکی ئەو تۆیان لەگەڵ ئەو زانستەدا نی‌یە، مەگەر تەنها لەڕووی پلەوە، ئەمەش چونکە ئەو زانستانە تەنها توێژینەوەیەکی

پـەتیو هەڕەمـەکی نـین سـەبارەت بەسروشـتی شـتەکانو ماددەکـان لەگـەردووندا، بـەڵکو توێژینـەوەو زانسـتێکن لـەئامانجو وێنـای خودیـی مرۆڤـەوە هـەڵقووڵاون، هەوڵیش دەدەن بۆ هێنانەدی ئەو وێنـاو ئامانجانـە. لەبـەر ئـەوە مەعریفـەی مرۆیـی لـەبواری ڕاسـتیە بابەتیـەکانی سـونەنو سروشـتی شـتەکانەوە لایـەنێکی خودیـی مرۆڤیشی تێکـەڵاوبووە.

لەو ڕووەوە کە ئەو زانستانە هۆکار گەلێکن بۆ هێنانەدی ئامـانجو وێنـای مرۆیـی فراوانـترو گشـتگیرانە تـر، هـەر مامەڵـەکردنێك لەگـەڵ کولتـوری نەتەوەکـەماندا لـەم زانستو مەعریفانـەدا لـەبواری ڕاسـتیی سـونەنو سروشـتی شـتەکاندا، لایـەنی خۆیـی خۆی هەیە لەو ڕووەوە کە ئەمانە هۆکـارن بـۆ ئامـانجو وێنـای مرۆیـی، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە کـە مەعریفـەو زانسـتەکانی شارسـتانێتیە بیانیـەکان لـەچوار چێـوەی ڕاستەقینەی خۆیاندا دابنرێنـەوە، لەگـەڵ ئـەو ئامـانجو مەبەسـتانەی کـە دەینوێنـن، هـەروەها ئامـانجو مەبەستو ڕووکارو گریمانـەکانیانو ئـەو شـتانەش کـە ئەولـەویاتیو هـزرو بایـەخو گرنگیـە کانیـان پێـك دەهێنـن. مامەڵـە کـردن بـەو شـێوەیە کەلاسـایی کردنەوەیەکی کوێرانـەی بیـانی بێـت، عـەقیدەو هـزرو وێنـای نەتەوەکـەمان دەخاتـە بـارێکی پشـێویو تێـك ڕمـانێکی ئـەوتۆ کەهـەموو وزەکـانی گەشـەپێدانی ئـایندەو تواناکـانی ڕەسـەنایەتی پـارێزیو دەست پێشـخەری دەمرێنێـت.

باسکردن سـەبارەت بابەتیـەتیو بـێ لایـەنی زانسـتو مەعریفـەی خۆراوایـی هیـچ پاڵپشـتێکی نیـیە، چونکـە ئامـانجو بەڵگـەو ڕێنومـایی یـەکانی لەگـەڵ نیـیە، مەگـەر تەنها چەند ئامـاژەیـەك لـەپاشماوەی پەیامـە دێرینـەکانو فیطـرە سـاغەکانەوە بۆیـان ماوەتـەوە، کـە ئەمانـەش نـاتوانن کەلەبـەری ئـەو مەترسـییە پڕبکەنـەوەو، ئـەو دۆزینـەوە کەمـە تەکنەلۆژیـە نوێیانـەی سـەبارەت بەیاسـا ماددیـەکانی گـەردوونو فیطرەی بوونـەوەریان ئـەنجامیان داوە نابێتـە ڕەصیـدی شارسـتانیەتی خـۆراوا.

ئـەو دەسـتکەوتو داهێـنراوە خۆراوایـی یانـەی لەخۆرهـەڵاتو خـۆراوای جیـهاندا بڵاوبۆتـەوە لەهـەموو بـوارە زانسـتیو کۆمەڵایـەتیو تەکنەلۆژیـەکاندا لـەناوەڕۆکدا هیچ پـەیوەندی یـەکی بەمەسـەلەکەوە نیـیە، بـەڵکو تەنـها پـەیوەندی بـە بەشـێکی زۆر کـەمی بوونـەوەرو دیـاردەو خەسـڵەتە ماددیەکانیـەوە هەیـە، بـەڵام لـەڕووی هەموایـەتی گشـتیەوە شارسـتانیەتێکی گومڕایـەو مرۆڤـی خسـتۆتە خراپـترین بـاری سەرسامیو تـرسو گومـانو ڕاڕاییـو مـل ملانـێو وێرانکاریـیەوە. عـەقڵی ئیسـلامی ئـەمڕۆ پێویسـتە هەسـتێت بەپشـکنینو پـاکژ کردنـەوەی ئـەو شارسـتانیەتە تـا

ڕووکارەکانی کەمو کورتیو ناتەواویو خراپ ئاڕاستەکردنو جێ بەجێ کردنی ڕاست بکاتەوە. نەتەوەی ئیسلامی ڕۆشنبیرو زاناو سەرکردەکانی دەبێت لەبارێکی هۆشیاری تەواودابن سەبارەت بەشارەزا بونیان لەسروشتی ژیاری خۆراواو ڕەگو ڕیشەو لایەنی هەموارو ناهەموارو تایبەت مەندیەکانی، لەهەموو بوارە کۆمەڵایەتیو تەکنەلۆژیەکانیدا. جا بۆ ئەوەی ئەو ئامانجە بپێکن دەبێت پرۆگرامو شێوازو پێوەری ئیسلامی یانەی ڕاستو دروستیوا هەڵبژێرن کە تۆکمەبنو لەتواناکاندا هەبێت ئەو هەموو لایەنانەی شارستانییەتیە کە بپشکنو هەڵی بسەنگێنن بۆ درێژە پێدان بەدەست کەوتە هەموارو بەجێکانیو لەناوبردنی ڕوکارە ناهەموارو ناتەواوەکانی.

باس کردنێکی ڕاستەقینە سەبارەت بە بابەتایەتی زانستەکان، بە تایبەتیش سروشتیو تەکنەلۆژیەکان بەبێ لۆژیکی ئیسلامی بەجێ ناگات، چونکە هەزری ئیسلامی لەگەڕانو توێژینەوە لابەشیە کانیدا دەربارەی سروشتی ماددەکانو فیطرەو سونەنی گەردوونی لەدەرچەی دیدێکی کەمو کورتو جوزئی دیاریکراوەوە سەرچاوەی نەگرتووە بەڵکو ئەمانە دەبنە پاشکۆیەك بۆ تەواوکردنی زانستێکی ڕەببانی گشتگیر. ئیتر لەو بارەدا مەعریفەو زانستەکان ئامانجو ئاڕاستەیەکی ڕاستییان دەبێت، پێداویستیە ماددیو ڕۆحی یەکانیش بۆ مرۆڤ دابین دەکەن، وەخۆش گوزەرانیو دڵنیاییو ئارامی ماددیو مەعنەوی دەروونی دەست گیردەبێت، باوەڕدارانی ڕاستەقینەش بەپلەی ئاشتیو ئاسایشێکی سەرانسەری شاد دەبن.

تەواوکاری نێوان(سروش)ی هەموایەتی ژیریو هۆشی جوزئی لەبنیات نانی مەعریفەی مرۆییو مەعریفەی سونەنو فیطرەو سروشتی شتەکان لەگەردوونو بونەوەریاندا یەکێکە لەگرنگترین ڕوکارەکانی بەخششە ئیسلامی یەکان بۆ شارستانیەتی مرۆڤایەتیو ڕاگیرکردنو ڕێنومایی کاروانەکەی لەجیهانی ئەمڕۆدا. سەلامەتی ڕوکارو ئاڕاستەی توێژینەوەی زانستیو جێ بەجێ کردنەکانی مەعریفەو بەکار هێنانەکانیو ئەو فەلسەفە شارستانێتی یەی کە فەرمانبەری دەکات بایەخی کەمترنیە لەو داهێنانە زانستیانەی کە لەسونەنی فیطرەی ماددیو یاساکانی بونەوەردا دۆزراونەتەوە، بەڵکو هەموایەتی مەعریفە هەر خۆی بڕیار لەسەر چاکیو بەجێیی ئەو مەعریفەیەو ڕوکارە پڕ لەخێرو چاکانەی دەدات.

ئیسلامییەت لەزانستەکاندا بەگشتیو لەزانستە سروشتیو تەکنیکییەکاندا بەتایبەتی ئەوە ناگریتەوە کە ناوەڕۆکەکەی بەشێوەیەکی ماددیو هونەری گۆڕدراو بێتە کایەوە کە دەشێت تێ بینییەکانی عەقڵی مرۆییو تێڕوانینیو بیرکردنەوەی لەسروشتی فیطرەو یاسای پێکهاتنو جمو جوڵیان پێی بگات. بەڵکو تەواوێتی مەعریفەی ئیسلامی دەبێ بۆ چوونو واتایەکی زۆر گەورەتر لەو هەولانەی کە عەقڵو دەرك پێ کردنی مرۆڤ پێی دەگات برەخسێنێت. ئەو بنچینەیەش دەگەڕێتەوە بۆ سەلامەتی گریمانەکانی مەعریفەی ئیسلامیو بۆ چوونە هەموایەتیەکانیو تەواویی سەرچاوەکانی.

بەمەش ڕوو دەکاتە ئەو خێرو بێرەی کە عەقڵ بەتەنها لەئاستیدا بێ ئاگایەو پێی ناگات، وە شتێکی پێ دەبەخشێت کە پێشتر عەقڵ نەیزانیوە، هەروەها شتێك لەناخیدا دەچێنێت کە پێشتر مرۆڤ دەرکی بەبوونی نەکردووە.

ئیسلامییەت لەجەوهەردا واتە سەلامەتی بۆ چوونو ئامانج وەسەلامەتی ئەو فەلسەفەیەی کە توێژینەوەی ئەو زانستانەو بایەخ پێ دانو جێ بەجێ کردنو داهێنان تیایاندا مەبەستیانە کە بەمەش زانستی ئیسلامی دەبێتە زانستێکی چاکسازی بنیات نەری یەکتاناسی ڕەوشت بەرزو کامڵ.

ئەگەر لەگەڵ کاروانی شارستانییەتو زانستدا بەناخی مێژووی مرۆڤایەتیدا بڕۆینە خوارەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لەسایەی ژیاری ئیسلامیدا خونچە گوڵەکانی زانستی نوێو پرۆگرامگەراییو دامودەزگا خزمەت گوزارییە کۆمەڵایەتیو تەندروستیو پیشەسازی یەکانی گەشەدەکەن، وە بەهێندەی ئەوەی شارستانیەتی ئیسلامی هێنایەتییە دی لەبواری بنیاتنانو چاکسازیدا وزەو زەمینە کە مێژووی ئیسلامی پڕکردۆتەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە زیانو هۆکارەکانی تیاچوونو کاولکاری ئەوەندە تیایدا بەرچاو ناکەوێت. شارستانیەتی خۆراوا هاتو لەگەڵ خۆشیدا جیهانی پڕکرد لەچەکو تەقەمەنیو هۆکارەکانی قەلاچۆکردنو وێران کاری، ئیتر وێران کردنو ستەم کاریو توندو تیژیو خراپ کاریو دوژمنایەتیو خۆسەپاندنو داگیرکاری بوون بەدیاری یەکی دەستی ئەم شارستانێتییە بۆ گەلانی سەر زەوی.هەر لەوکاتەوە کە خۆی گرتوبووە خاوەنی سوپاو کەشتی گەل بۆ بڕینی دەریاکان تا گەلان بخاتە ژێر دەستی خۆیانەوەو یاری بەچارەنوسیان بکات، تا لەئاکامدا لەسایەی شارستانێتی خۆراوادا ـ لەگەڵ ئەو هەموو داهێنراوە زانستیو مەعریفیو تەکنیکی یانەشیدا گەلو نەتەوە تا

خۆراوایی یەکان ـ نەهامەتی یان، توو شبوو برسێتی گەدەی ڕۆڵەکانیان هەڵ دەپێچێت و عەقڵیان لەگێژاوی نەفامی‌دا نوقم دەبێت، هەموو پێگەی ژێر دەستەکانیان دەبێتە نێچیری نەخۆشی یەکان و پێشبڕکێ کردن بۆ کڕینی چەك لەوان و، بەرهەم هێنانی و کۆمەڵکردنی، لەگەڵ ئامێرەکانی کوشتارو خوێن ڕێژی و تێکدان و کاولکاری، بەڵکو ئەو بەروبوومە زانستی یەی کە ئەمڕۆ لەجیهاندا هاتۆتە ئاراوە بەروبومی ئەو توێژینەوەو سەرمایە بلۆك کراوانەیە کە لەپێناو پیشەی کوشتارو پێشبڕکێی ماڵ قۆرخ کردن و هۆکارەکانی کاولکاری و پەرەسەندنی هۆکارەکانی جەنگ و کوشتاردا مۆڵ کراوە.

ئەو ململانێ یەی کە ڕوو بەڕووی ئیسلامیەت دەبێتەوە دەبێت بیری لێبکاتەوە، ئەوەیە کە تێڕوانین و وێناو ڕوانگەیەکی تازە پێشکەش بەمرۆڤایەتی بکات کە وا لەزانست و مەعریفە بکات لەخزمەتی مرۆڤ و ئەرکی خەلافەتەکەیدابێت و ئامانجی چاکسازی و ئاوەدانکردنەوەو چاودێری گەردوون و بونەوەر بهێنێتەدی.

ئیسلامیەتی زانستە فیزیایی و تەکنیکی یەکان دژی فەلسەفەی زانست و پەیوەندی یە کانێتی بەژیانی کۆمەڵگەوە، لێ بڕانی مرۆڤی چاکە خوازە بۆ ژیان و بونەوەر، لەڕوانگەیەکی ئیمانیانەی یەکتاناسی ڕەوشتیی گشت گیردا، ئەو خراپ کاری یە چاك بکاتەوە کە لەئەنجامی سەر کوێری ڕۆحی یەوە، هەروەها لەئەنجامی گەشەی ماددی و کەم و کوڕی لەپرۆگرامدا کە شارستانیەتە ماددیەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە لەخۆرهەڵات و خۆراوادا بەدەستیەوە دەناڵێنن سەری هەڵدا.

بەڕاستی ئەوە کارێکە زۆر جێگای سەرسامی یە کە مرۆڤ لەسایەی شارستانێتی خۆراوای هاوچەرخدا لەئاستی هەموو شتێك دەستەوسان بێت جگە لەپێش بڕکێی خۆپڕ چەك کردن و هەر خەریك بوون بە بەرهەم هێنانی چەکی وێران کەرەوە،و نەتوانێت هەست بەئاسایش بکات مەگەر لەنێو هاوسەنگی یە کانی ترس و بیمدا، تاوای لێ بێ هەق بدرێتە دەست ئەو کەسانەی کە چەکدارو بەهێزن و قسەیان ڕەوابێت دەوڵەمەندی و خۆش گوزەرانیش تەنها بۆ چەند کەسانێکی کەمی گەلان بن.

ئەوبارە ترسناکەی کە ئەمڕۆ دوچاری مرۆڤایەتی بۆتەوە کارێکە فیطرەی مرۆیی ڕاستەقینە، بەر پەرچی دەداتەوەو نایەوێت،و بێ گومان دەبێت دیدو ڕوانگەیەکی باشترو شایستەتر بۆ مرۆڤ هەبێ دەربارەی بوونی،و ژیانی،و

ئامانجی لەم بوونەوەرەداو ژیان لەم گەردوونەدا،و بۆ چەندین شتی تر لەمانەش کە لەبەر خاتری ئەوانە مرۆڤ عەقلْو هۆشیاریو ویژدانو سۆزو فیطرەی ڕاستەقینەی پێ بەخشراوە.

مرۆڤایەتیو شارستانێتییە کەیو مەترسی مل ملانێکانی گەیشتۆتە سنورێك پێویستە ڕێنمایی هەموایەتی ڕەببانی چاودێری بکات، وە پێویست دەکات بە تێڕوانینێکی گشتی بابەتیانەی ئیسلامییەوە، بڕوانینە شتەکانو هاتنەکایەی شارستانیەتێکی پڕ لەچاکسازیو ئاوەدان کاری بووەتە حەتمی یەت. بەلام ئەوەش بەبێ بەلگەی بەر چاو، نمونەی زیندو ئەو وێناو ئیسلامییە پێك نایەتو خەلکیش لەڕێگە چارەی ئیسلامی تێ ناگات. هەستانی موسلّمانان بە ئەنجامدانی ئەرکی خۆیان بە خۆڕزگار کردنیانو ژیانی خۆیان، دەبێتە هۆی تێگەیشتن لە(بینیە)ی بابەتیانەی ئیسلامیو وەرگرتنو سوود لێ وەرگرتنی لەلایەن گەلانی سەر زەوی یەوە.

وە ئیسلامیەتی زانستەکان هەروەها مانای ڕوو بەڕوو بوونەوەی قەیرانی هزری پەروەردەیییە کە دووچاری قەوارەی ئیسلامیو دامو دەزگا زانستیو فێرکاری یەکانی بۆتەوەو دەیگرێتەوە، کە لەئەنجامی کەمو کورتی کردەی ئیسلامی لەم بوارانەدا هاتۆتە کایەوەو ناچار بووە کە تەرجەمەی حەرفی سەرچاوەی مەعریفە بیانی یەکان بکات، بەلکو زۆرێك لەقوتابخانەکانی جیهانی ئیسلامیش، بەتایبەتی خوێندنی بالا تائێستاش بە شێوازێك ئەو زانستانە دەخوێنن کە لەسەر چوار چێوەیەکی هزری ئەو نەتەوەو ژیارە بیانی یانە داڕێژراوە بەخۆیانو دیدی هاوردیانەی جوزئی کەمو کورتیانەوە، ڕوونو ئاشکرایە کە ئەرکی بە ئیسلامی بوون لەبوارەکانی زانستە تەکنیکییە کاندا لێرەدا واتە چاکسازی لەچوار چێوەی ئەو هزرە عەقیدەییەی ئەم ماددە زانستییە پێشکەش دەکات، وە دانانی لەنێو چوارچێوەی ئیسلامیدا بەدەرچەو گشتێتیو بەهاو ئامانجەکانییەوە، بەگیانێکی هەموارانەی وا کە وزەی مرۆڤی موسلّمان بجولێنێو بیخاتە بەردەم ئەو بەرپرسیاریەتییانەی کە لەئەستۆی دایە لەدۆزینەوەو داهێنانو پێ ملکردنو بنیاتنانو ئاوەدانکردنەوەو هەستان بە ئەرکی خەلافەتێکی چاکسازانە لەسەر زەویدا.

ئەو ئەرکە پەروەردەی یە گرنگەی کە پێویستە سەرکردەو پەروەرشیارانی ولاتە ئیسلامی یەکان بەو پەڕی بایەخ پێدانەوە بیگرنە ئەستۆ، ئەرکێکە کە چەند

لق و پۆپێکی لێ دەبێتەوە چەند شتێك دەگرێتەوە لەوانە دانانی پرۆگرام و کتێبی خوێندنی زانستی لەسەر هەموو ئاستەکاندا، هەر لەنزیکترین قۆناغەوە تا بەرزترین یان بەشێوەیەك کەتێ ڕوانین و چەمك و ئامانجە ئیسلامی یەکان تیایاندا ڕەنگ بداتەوە چونکە ئەو ئەرکەی لەگەڵ سەرەتای دەسپێکردنی ژیانی ساوایەکدا سەر هەڵدەدات و پلە پلە لەگەڵ قۆناغەکانی تەمەنیدا شیاوە لەگەڵ قۆناغەکانی پەروەردەو فێرکردنیشیدا دەبێت بەو پەڕی گرنگەیەوە لەلایەن سەرکردەو پەروەردەکارانەوە کاری بۆ بکرێت و خاوو خلیچکی تێدا نەکرێت، تا دەروون و عەقڵی ڕۆڵە تازە پێگەیشتووەکانمان بەدەست ئەو کێشانەوە نەناڵێنن کە باو باپیرانیان بەدەستیانەوە دەیانناڵاند لەو خوارو خێچیانەی کە لەپەیکەری دەروونی و هزری و سستی لەبەجێهێنانی ئەرکە شارستانیەکاندا بەدی دەکرا.

# ئیسلام و ئاینده

گرنگــه کــه لــەکۆتایی ئــەم باســەدا جــارێکی تــر جــەخت لەســەر ئەوڕاســتییەبکەینەوە کەچاکســازیی ئیســلامی وەك یــەك لەخزمــەتی هەریەکــە لەنەتەوەمرۆڤایەتی‌دایــە،لەبــەر ئــەوە پێویســتە هــەوڵو تێکۆشــانی کارایان‌وسەرکردەئیسلامیەکان بەسێ ڕووکــاری ســەرەکیدا ئاڕاســتە بکرێــن:

**یەکــەم:** کــارکردن بەئاڕاســتەی ئــایندەی نەتــەوە، واتــە لــەڕیزی تــازە پێگەیشــتوان‌و ڕۆڵــەکانی نەتــەوەدا.

**دووەم:** ئەمەشــیان ڕۆڵــی دامــەزراوە زانســتیەکانە لەهێنانــەدی ئیســلامی بــون‌و بنیاتنــانی تــێڕوانینێکی ئیســلامی لــەبواری زانســت‌و بەجێــهێنانی شارســتانیانەی کاریگــەرو پێگــەیاندنی نەوەیــەکی شیاو بــۆ هــەلگرتنی پــەیامی ئیســلام.

**ســێیەم:** کــارکردن بەئاڕاســتەی ئــایندەی بونێتــی مرۆیــی‌و بنیــاتی شارســتانی، ئەوەشــیان لەئەســتۆی نەتــەوەو هــزرە ئیســلامی‌یە کامڵەکەیدایــە، تــاکو کــاروانی شارســتانێتی مرۆڤایــەتی ڕاســت بکاتــەوەو کــاروانی هــزری مرۆیــی هاوچــەرخیش بگرێتەبــەرو پێگەیشــتووی بکــات.

### ١ـ ئایندایەتی بینای نەتەوە:

ئاشــکرایە ئــەو هــزرەی کەئێســتا نەتەوەکــەمان لەســەریەتی پێویســتی بــە چاکســازی‌هەیە، هــەر وەك ئاشکرایشــە کــەبونیادی دەرونــی نەتەوەکــەشمان بــەو شــێوەی ئێســتای شــڵەژاوە، خــۆ ئەگــەر لــەتوانای تــاك‌و نــەوەکاندا بێــت، پێویســتە بزانــن چ هــزرو زانیاریــەکی نوێیــان پێشــکەش دەکرێــت، چونکــە ئــەو زانــین‌و دەرك پێ‌کردنــە خــۆی لــەخۆیدا کردارێکــی زەینیــی عــەقڵی دەرخەرانەیــە، لەجەوهەریشــیدا جیــاوازە لــەکرداری بنیاتنــان‌و پێکــهێنانی دەرونــی، کەخەســڵەت‌و ڕوخســارە بنچینەییــەکانی لــەقۆناغی منــاڵی‌و هــەرزەکاریدا هــەڵ دەگرێتــەوە، بــەڵام ئــەو شتانەی بەســەر بنیاتنــانی دەرونــی مرۆڤــدا دێــت، بــە تایبــەتیش پــاش بــاڵق بونــی لەقۆناغەکانی ئایندەی تەمــەنی‌و لــەزنجیرەی پێکــهێنانی دەرونیانــەی تــاك دا،ئــەوەی لــەم قۆناغــەدا دەردەکــەوێت بــەرێژەی ڕاســت کردنــەوەی ئــەو ئاڕاســتەو ئامانجانەیــە کــە کاریگەرییەتیەکــەی لــەو خەســڵەتە دەرونیانــەی لەقۆناغــە بەراییــەکانی

ئەمەنیداهـاتیبوە وەرگرتـووە، پێغەمبـەر (ﷺ)دەفـەرموێت باشـترین کەسـتان لەسـەردەمی نـەفامیدا باشـترینتانە لـە ئیسلامیشـدا ئەگـەر تێگەیشـتوبێت)(١) لەبـەر ئـەوە ئـەو دەشـتەکیە تونـدو تیـژو سەربەسـتانەی دواتـر ئیسـلامیان وەرگـرتو ئامـانجو سسـتمەکەیان پەسـەندکرد،توانیـان لـە ماوەیـەکی کـەمدا کاروبـارو دەسکەوتی گـەورەیان لێ بوەشـێتەوە لـەڕووی چـەندێتیو چۆنیەتیشـەوە.

لەبـەر ئـەوە ئەونەوەیـەی ئێسـتا لـە ڕۆڵـەکانی نەتـەوەی ئیسـلامی ڕۆڵـی بنچینـەیی‌دەنوێنێت، لـە دەرك کـردن بـە سروشـتی گۆڕەپانەکـەو، شـوێنی کـارو، تواناکـانیو، پێشکەشـکردنی هـزری تـازەو، بنیاتنـانی دایەنگـەی پێگـەیاندنی تـازە پێگەیشـتوان، لەسـەر شـێوازێکی نمونـەیی بـەرز، وە بـەو هۆکـارە ڕاسـتو دروستانەی خەسڵەتی باشیان تێدا دەڕوێنێت، هـەروەها بـاوەڕێکی قـوڵ بـە ئامـانجو مەبەستە ئیسلامیەکانو تەشریعاتەکانی لـەدڵیاندا دروست دەکـات.

توانـای گۆڕانکـاریی لەقـەوارەی نەتـەوەدا لـەکار بۆکـردن بـۆ ئـایندەداو ئامـادەکردنی تـازە پێگەیشـتوەکاندا حەشـاردراوە بـە هەردوولایـەنی دەرونـیو هزرییەوە، لەسـەر بناغەیـەکی ڕاسـتو دروسـت، کـە بـۆ بـەجێ‌هێنانی ئـەو ئـەرکو ڕۆڵە شارستانیەی پـاش پێگـەیاندنی تـەواوی دەکـات، ئامـادەو سـازی دەکـات، جـا ئەگـەر نـەوەی ئـەمڕۆ ڕۆڵـی خـۆی بینـی لـە ئامـادەبونیدا بـۆ پێکـهێنانی نـەوەی ئـایندەو، ئـەوا مانـای وایـە توانیویـەتی بـە ئـەرکی خـۆی هەڵبسـێت، بـەڵام ئەگـەر گومـانی وابـوو کـە توانیویـەتی بـە شـێوەیەکی ڕاسـتو دروسـت ئـەرکی سەرشـانی ڕاپـەڕێنێت، کـەچی لەبنەڕەتیشـدا وانـەبوو، ئـەوا بـەم کـارو گومانـەی ئامـانج نـاپێکێتو ئـەو وزەیـەش بەهـەدەر دەدات کـە بۆنـەوەی ئـاینده پێویسـتە، ئەمـەش بـەهۆی هەڵـەی پێکـهێنانی دەرونیـەوە، کـەوادیارە نـاتوانرێت بگۆڕدرێـت، لـەم قۆناغـەدا، مەگـەر لەئاستێکی کـەمدا نـەبێت، کە ئـەوەش بەشـی ڕزگـارکردنی نەتـەوە لەو قەیرانـە ناکـات.

بایـەخی ڕۆڵی ئـەم نەوەیـە بەپلـەی یەکـەم لـەو خۆئامـادەکردنو کـار بـۆ کردنـەدا دەردەکـەوێت کـە دەیگرێتەبـەر بـۆ پێگـەیاندنی نـەوەی ئـایندەو سـازکردنی دەرچـەی ڕاسـتو دروسـتو هۆکـاری گونجـاو بـۆی، جـا هـەر کـاتێك لـەم وانـە بنچینەییـە

---

(١) بخاری گێڕاویەتیەوە.

تێگەیشتین، ئەوا پێویستە لەسەرمان هەوڵەکانمان بۆ هێنانەدی ئەم سێ خاڵە چڕوپڕبکەینەوە:

١. دابینکردنی وزەی پێویست بۆ بنیاتنانو پاراستنی لە بەهەدەرچوون. ٢. هێنانەدی هزرو چەمكو مەعریفەو تیڕوانینی ئیسلامیانەی ڕاستو دروست.

٣. ئاراستەکردنی ئەو وزەیە بۆ تەرجەمەکردنی ئەو هزرو چەمكو بینیە ئیسلامیانە، وەك پەروەردەکردنێکی تازە پێگەیشتوانو بنیاتنانێکی دەرونی بەهێزو ڕاستو دروستو کاریگەر.

ئەمەش واتە پێویستە لەسەر بیریارو سەرکردە ئیسلامیو جەماوەری نەتەوەو دەرك بەوەبکەن، کە تازەکردنەوەی وزەو تواناو ڕۆڵی سەرکردایەتی کردنی نەتەوە لەکاروانی مرۆڤایەتیدا، لەمیانەی بونیادێکی دەرونی لاوازەوە نایەتە دی، یان لەوزەیەکی هزری شارستانانیانەی خراپەوە، بەڵکو ئەمانە خەسڵەتی نەوەیەکی دواکەوتوی شارستانیەت ڕوخاوە، لە بەرئەوە دەبێت ڕۆڵی نەتەوەو سەرکردەکانی لەم قۆناغەدا بە پلەی یەکەم کارکردن بێت بۆ تازەکردنەوەی هزرو بینیەی ئیسلامیانەی ڕاستو دروست، جا هەر بەرەو جەنگێك کەبەشدار نەبێت لەهێنانەدی ئەو مەبەستو ئامانجانەی ئەو قۆناغەدا، ئەوە بەرەو جەنگو ڕوو بەڕوو بونەوەیەکی بێسودەو، لەگەڵ قۆناغی بنیاتنانی وزەدا ناشێت، وە دەبێت هەوڵەکانو وزەکان بەو ڕوکارەدا ئاراستەنەکرێن، مەگەر هێندەی بۆ نەتەوە پێویست بێت، وەك بەر پەرچ دانەوەیەکی دوژمنان، بەم پێیە ئەم ڕوبەڕووبونەوانە نابنە بەرەی بە فیڕۆدانی ئەو هەوڵو تێکۆشانەی بۆ هێنانەدی ئامانجە سەرەکیەکان کۆکراوەتەوە.

جەوهەرو ناوەڕۆکی بنیاتنانی ئایندەیی لە سەرەتاوە لەم قۆناغەدا سەر هەڵدەدات لە گۆڕەپانی هزریو پەروەدەییدا، ئەمەش گۆڕەپانو بواری سەرەکی بە دەست هێنانی وزەی پێویستو یەکلا کەرەوەی جەنگەکانی نەتەوەو ڕوبەڕوبونەوەی مل ملانێکانێتی، وە دەبێت هەولو وزەکانی نەتەوە لەجەنگی سیاسیو سەربازیدا بە فیڕۆنەدرێت، کە ئەمرۆ بەسەر نەتەوەکەماندا سەپێنراوە، مەگەر تەنها بڕێکی کەم لەو وزەیە بەکار بهێنرێت، ئەویش بۆ پاراستنی ئەو هەولو تێکۆشانەی گەلو نەتەوەکەمان بنیاتنانو چاکسازیی.

هەروەهاپێویستە لەسەر بیریارو سەرکردەکانی نەتەوە کە مانای بنیاتنانی دەروونی بۆ پەروەردەکارانو جەماوەری نەتەوە ڕوون بکەنەوە، هەروەها بایەخو

ڕۆڵو ڕەگەزەکانی پێکهێنانی ئەو بنیاتنانە ڕوون بکەنەوە، ئەوەی ئایندە وەك ئەوەی ئەمڕۆ نەبێت، وەك بەرەکانی ڕابردوو لاوازو دواکەوتو وەرەس هێنراونەبێت، بەڵکو ڕۆڵەو قوتابیو لاوەکان پێبگەیەنێت بە پێگەیاندنێکی دەرونیانەی ژیاریانەی ئەو تۆ کەوەك باو باپیری پەروەردەکارەکان نەبن، بەڵکو ڕۆڵی ئەو باوباپیرانە ڕێ نوێنیو هاندانی نەوە نوێیەکان بێت بۆ بەردەوام بونی نەوەکان لە کاروانی گەیشتنیان بە ئامانجو مەبەستە خوازراوەکان، نەك ڕۆڵی پێشڕەوو نمونەییان پێبدرێت، نمونەی ئەمەش وەك پزیشکێکە کە هانی نەخۆشەکەی بدات بۆ بەردەوام بوون لەسەر خواردنو بەکار هێنانی داو دەرمانە کۆنو ئێکسپایەرەکان، کە لەم بارەدا لەوانەیە پزیشکە کە خۆی دوچاری دەردی دەرونی هاتبیو بووبێتە نێچیری. بەهەمان شێوە دەکرێت پەروەرکارێك کەپێشەنگێتی تەواوی پێناکرێ کاریگەربێت ئەگەر بچێتەژێر کەمو کوڕیەکانیو مەشقکاران لەو کەمو کوڕیەو هۆکارەکانی ئاگاداربکات، نمونەی ئەمەش وەك ڕاهێنەرێکی وەرزشیی بەتەمەن وایە، کە بەهۆی ئەزمونی چەند ساڵەیەوە دەتوانێت بە شێوەیەکی تەواو لەڕووی تیۆریەوە زانیاریو مەشقەکان بە بەردەستو قوتابیەکانی ڕابگەیەنێت، بەڵام هەرگیز ناتوانێت بە کرداریو بەشێوەیەکی تەواو جێبەجێیان بکات.

داهاتووی ئەم نەتەوەیە بەستراوە بەوەی ڕوودەدات لە گۆڕانکاریو پێگەیاندنی نەوەکانی داهاتوو و داڕشتنی دەروونیو هزریان. ئەمەش بەشێکی کراوەیە لەڕووی نەتەوەو ئەم نەوانەدا، بە ئەندازەی ئەوەی کە دادەنرێ لەدەروونی تازە پێگەیشتووەکاندا لەهێزو ووزەو دیدو بۆ چوونو کۆششی ڕاستو دروست بەرهەم دەبێتو کارەکەش بەپێزدەبێت.

وە لەسەر بیرتیژانی نەتەوە وەلەسەر زاناو ڕۆشنبیران پێویستە کە توانای مێشکی خۆیان تەرخان بکەن بۆ ڕاست کردنەوەی بیری ئیسلامیو داڕشتنی دیدی ئیسلامی لەسەر بناغەیەکی ڕاست،و پێش کەش کردنی ئەم دەستکەوتە بە نەتەوەو کەسەکانیو دامەزراوەکانی بۆ ئەوەی بیکەنە ناوەڕۆکێك بۆفکرو و بەڵگەی کاربێت بۆ هەوڵەکانی کاروانەکەو دامەزراندنی داهاتوو و ئایندەی نەتەوە.

وە لە پێناو بەدی هێنانی ئەم مەبەستو ئامانجەدا پێویستە لەسەر بیریارانو زانایانو ڕۆشنبیرانی ئەم نەتەوەیە کە هەموو تواناکانیان بخەنە گەڕ بۆ لێکۆڵینەوەی کاروانی مێژوویی،و ناسینی ئەوەی لەبیری نەتەوەدا بەجێ

هێشتووەو، لەشوێنەوارو کاریگەری‌و ئەوەی ئەم کاروانە تووشی هاتووە لە لادان، تاکو بتوانرێ کاروانی ئەم نەتەوەیە سەر لەنوێ بخرێتە سەر ئەو ڕێگەیەی کەوای لێدەکات بیرو دیدی ڕاست‌و دروست بێت بۆ کاری ئایندەیی پتەوو داهێنەرانە.

لەسەر بیریارو زانایان‌و ڕۆشنبیرانی نەتەوەش پێویستە لە بناغەو بنچینەو واتاکانی بیری ئیسلامی‌و پێکهاتەکانی‌و پرۆگرامگەرایی یەکەی‌و پێکهاتەکانی وردببینەوەو تێی بڕوانن، لەگەڵ پەیوەندی‌یەکانی ئەو پێك هاتانەش لە نێوان خۆیاندا، و ڕۆڵ‌و کاریگەرییەکانی لەدروست بوون‌و لە دایك بوونی بیری ئیسلامیداله هەموو ڕووەکانی ژیان‌و کۆمەڵگەدا.

لەسەر بیریارو زاناو ڕۆشنبیرانی ئوممەیە کەڕەسەنایەتی‌و گشت گیریتی‌و فیطری‌و واقیعییەت بگێڕنەوە بۆ هزرو بینیەی ئیسلامی‌و ئەو بارودۆخ‌و ئەزمون‌و کۆسپە مێژووییانە بەجێ بهێڵن کەبوونەتە هۆی لادانی فکرو بینیەی ئیسلامی‌و بەتاڵ کردنەوەی لەناوەڕۆك.، وە گۆڕینی بۆ شێوەو کەش‌و بۆنەو دروشمی تراویلکانە کە نەتەوە بە درێژایی سالآنی دوورو درێژ نەگەیشتوەتە بەرهەمێك یان ڕاستەڕێیەك بە هۆیانەوە.

لەسەر بیرتیژو زانایان‌و ڕۆشنبیرانی نەتەوە پێویستە بەبنەماکانی بیری ئیسلامی‌و گەشانەوەو درەوشاندنەوەی لایەن‌و بابەتەکانی پرۆگرامگەراییەکەیدا بڕواننەوە بۆ ئەوەی دیدو بیرو زانستی ئیسلامی ببەخشێت، نەك تەنها لەبوارەکانی سروش‌و دەقەکان‌و زماندا، بەڵکو لە بوارەکانی ژیان‌و کۆمەلآیەتیە مرۆییەکاندا بە گشتی، پرۆگرامگەرای هزری ئیسلامی شارەزایی‌و زانیاری‌و دیدو بەخششێکی زیندووی ڕێکخراوی تەواوکاوی بە بەرهەمی وا پێشکەش دەکات کە گشت گیربێت بۆ هەموو بوارەکانی ژیان‌و دەروون‌و کۆمەڵگە لە پەروەردەکردن‌و ڕامیاری‌و کۆمەلآیەتی‌و ئابووری‌و بەڕێوەبردن‌و ڕاگەیاندن‌و، فەلسەفەکانی هونەرو ئاوەدانکردنەوەو زانستەکان‌و سروشت جگە لەوانیش لە زانستەکانی ترو ئەو بوارانەدا کە بیرو هۆشی مرۆڤ بۆی دەچێت‌و پێویستی‌یەکی ئەو ژیانەیە کە هەمیشە لە گۆڕاندایە.

لەسەر زانایان‌و بیریاران‌و ڕۆشنبیرانی نەتەوە پێویستە بزانن کە لێپرسراوێتی باری نەتەوە خستنە سەر ڕێگەی ڕاست‌و دروست لەسەر شانی ئەوانە بەپلەی یەکەم پێش خەڵکانی‌تر، وەکەسانی جگە لەوانیش لەو بوارو کارانەدا شوێن کەوتەی دیدو بۆ چوون‌و ڕاوێژو بەرهەمی ئەوانن، ئەوانیش چەندە خۆڕاگرو بە

ئارام بن و سەرکەوتووبن لە پێشکەش کردنی دیدو راوێژی راستو دانانی بە شێوازێکی زانستی راستو قەناعەت پێکەرانە ئەوەندە سەرکەوتوون لە بزواندنی نەتەوە لە بواری خزمەتکردنی پەیامەکەیو بنیاتنانی ژیانی نەتەوەدا مەودای بزاوتنی نەتەوەش بەرەو توانایەکی ئیسلامیانەی داهێنەر لەبواری بنیاتنانی ژیاندا هەر خۆی دەبێتە پێوەری سەرکەوتنیان لەراپەراندنو جێ بەجێکردنی ئەرکەکانی سەر شانیاندا. و بەئەندازەی پشت گوێخستنی کاری ئەمان لەراپەراندنی ئەم رۆڵەدا ئەوەندەش کۆسپەکانی نەتەوە گەورەدەبن و لارو وێرەوە یاخی بوونی نەتەوە لە گرتنە بەری رێبازی راستو لەدامەزراندنی ژیان دا زۆر دەبێت.

لەسەر بیریارانی نەتەوەی ئیسلامی پێویستە کە بزانن ئەوان لێپرسراون لەپێش کەشکردنی دیدی شارستانی هاوچەرخو چاکسازی پرۆگەرایی بیری ئیسلامیو، بەدیهێنانی رەسەنێتی گشت گیرانەی زانستی لەم بیرەداو پێش کەشکردنی بۆ چوونو بەدیلە ئیسلامیەکان، لەبواری رێکخستنی کۆمەلایەتیو پەروەردەی کۆمەلایەتی‌دا تاکو نەتەوە رابەرێکی دەست بکەوێت بۆ کارو بنیاتنان.

دامەزراندنی هۆشیاری ئیسلامیی سەرکردەکانو جەماوەریش لەسەر ئەوانە لەم قۆناغەدا، دامەزراندنی پرۆگرامێکی بیرکردنەوەی گشت گیرانەی ئیسلامی راستو رێک، هەر لەسەر ئەوان پێویستە لەگەڵ چەسپاندنی دەستورو پرۆگرامەکانو شێوازەکانی بنیاتی دەرونیی راست بە تایبەت لە قۆناغەکانی سەرەتای فێرکردندا، سەرەتا دایەنگاو باوەشی ماڵو قوتابخانەکانو ئەوەی بە دوایدادێت لە قۆناغەکانی فێرکردنی گشتیدا،(سبەینی) تازە پێگەیشتووەکەیەو هێزیش لاوێتییەکەیەتی.

ئەوەی بەلای بیریارو پەروەردەکارانەوە گرنگە لە ئامادەکردنی ئەوەی سبەینی‌دا(داهاتودا) دەرك کردنی رۆڵی باوکێتیو باوکانە سەبارەت بە پەروەردەو شێوازو پەروەردەی رۆڵەکانیان ئەوەش کارێکە کە هیچ کارێکی تری پەروەردەیی پێناگات چونکە دارشتنی دەروونیو رەوشتی تا ئەندازەیەکی زۆر بەندە بە پەیوەندییەکانی باوکانەوە بۆ رۆڵەکانیان بەرەمەڵسوکەوتو بەهاو ئەو بۆ چونانەوە کە لەناو خێزان دا پرورەدەبنو دەردەکەون،و هەر هەوڵێك لەقوتابخانەو کۆمەڵگەدا گەر نەگاتە قەناعەتی باوانو خێزان ئەوا ئەو هەوڵانە شکست دێننو بەدوور نازانرێت کە خێزان بەر بەستی بکاتو شوێنەواریشی تێك بدات.

وە هەر كارێك قەناعەتی باوكانی لەگەڵ دابێ ئەوا باوكان سست نابن لە هەوڵدان بە هەموو شێوازێكەوە بۆ بە ئەنجام گەیاندن و گەیاندنیان بە ڕۆڵەكانیان هەرچەندە هەوڵی پێچەوانەش زۆر بێت.

كەواتە سەر كەوتویی بیریارو پەروەردەكەران لە گۆڕیندا لەبناغەدا دەگەڕێتەوە بۆ گەیشتن بە قەناعەتی باوكان و بە جوانی گواستنەوەی بابەتە پەروەردەییەكە بۆ ڕۆڵەكانیان، تاكو ماڵەوەو باوكان بەكاری خۆیان هەڵسن لەبەدیهێنانی ئامانجەكان و سەركەوتنی هەوڵە كانیاندا، وزەی باوكانیش لە قوربانیدانیان لە پێناو ڕۆڵەكانیان و بەدی هێنانی سەركەوتنیان و پاراستنی بەرژەوەندیەكانیاندا هاو وێنەو هاوتای نییە.لەبەر ئەوە وتاری باوكان و جوانی جێ بەجێكردنی ئەم وتارەو ڕوون كردنەوەی و ئاسان كردنی كارێكی سەرەكی یەو پێویستە لەهۆشی بیریارو پەروەردەكارو ڕێكخەراندا بێت لەم قۆناغی بنیاتنانی نەتەوەدا، ئەمەش ڕێگای بنەڕەتی یە بۆ سەركەوتن بەسەر هەموو كۆسپەكان و هەر كۆسپێكیشدا كەسستەمو دامەزراوەكان دایان نابێت یان دای بنێن لەڕووی چاكسازی و گەشەكردن دا سەرەڕای هۆكارو ئامانجەكان.

## ٢ ـ ئیسلامییەت و دامەزراوە زانستییەكان:

قسە لەسەر ئایندە تەواو نابێت پێش ئەوەی باس لەڕۆڵی دامەزراوەی زانستی ئیسلامیانە بكەین لەهێنانەدی ئیسلامییەت و بنیاتنانی ڕوانگەی ئیسلامیانە. ڕوون و ئاشكرایە كە لەكۆتاییدا قەیرانی نەتەوەی ئیسلامی بەرەنجامی چۆنیەتی بەدوایەكا ڕیزكردنی بەهاو وێنا بنەڕەتیەكانیەتی لە واقیعی كۆمەڵایەتی ژیاریانەی تۆكمەو سەقامگیردا. هەروەها ئەوەش ڕوون و ئاشكرایە كەهەوڵو تێكۆشان و قوربانیدانە سیاسی و سەربازییەكانی نەتەوەش نەبۆتە هۆی دوورخستنەوەی نەتەوەكەمان لەو واقیعە پڕ لە دواكەوتوییەی تیایەتی، بەڵكو دوزەخی نارەحەتیەكانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قوڵتر دەبێت و دەلاقەی ناوەندی نەتەوەو گەلانی ئیسلامیش لە فراوان بووندایە، بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەو گەلانی پێشكەوتوودا، بەخۆی و واتاكەی لەڕۆچوون و دژایەتی كردنی نەتەوەی ئیسلامی و پێشێلكردنی مافەكانی و بە فیڕۆچوونی خوێنی شەهیدانی و زەوت كردنی سەروەت و سامانەكەی.

دابەزاندنی نمونەی ئیسلامی بۆ ناوجەرگەی واقیعی ژیان کە مەبەستو ئامانجی ژیاری بەرزو نەخشەی کاری کاریگەرو بەرهەمدارو سستم گەلێکی کۆمەلایەتی پێشکەوتوو سەقامگیر بنوێنێت، هەرگیز نایەتەدی تا هاوکاریو بەدەمەوەهاتنی ئەو سەرچاوەمەعریفیو زانستیو پرۆگرامە هزریە زانستیە راستو دروستەی لەپاڵ دانەبێت کە لەناخی ویژدانو زەینی نەتەوەو پێکهاتەی پەروەردەیی رۆڵەکانی نەتەوەدا هەیە.

گۆرەپانی گەورە لەولاتی ئیسلامیدا بریتییە لەدامەزراوە زانستیو فێرکارییەکان شان بەشانی(مال)و (خێزان)، هەر ئەوانەش دەبنە شوێنگەیەکی گرنگو سەرەتایی بۆ گەشەپێدانی هێزو توانـاو وزەو دەرچەکان، هەر ئەم دامەزراوانە خۆیشیان پشتیان پێ دەبەسترێت لە سازاندنی گۆرەپانەکەو پێگەیاندنی رۆڵەکانی نەتەوەو کادرو بەگەڕ خستنی تواناکان.

نابێت دامودەزگا زانستیو فێرکاریەکانی ناوجیهانی ئیسلامی تەنها وەك کۆمەڵە پەیکەرێك وابن کەتەمبەڵیو سستی عەقڵیو لاساییکردنەوەی کوێرانەی هزری بیانی بکەنە پیشەی خۆیان، ئەگەر بمانەوێت ئەو دەزگایانەمان سەرکەوتووبن لەبەجێهێنانی ئەرکەکانیدا.

نابێت دامودەزگا زانستیو فێر کاریەکانی نەتەوەی ئیسلامی هەروا بە نەزۆکیو دەردەداری بمێننەوەو بەردەوامیش عەقڵە ئیسلامیەکان پێویستیان بە بردنە هەندەران بێت بۆ پەراوەو فێرکردنو بە دواداچوون، چین لەدوای چین ، بەبێئەوەی کە لەناخی خودی نەتەوەکەمانو لەخاکی ولاتماندا وزەو توانا زانستیو شارستانیەکانمان گەشەبکاتو چەند پۆلێك لە زاناو توێژەرەوەی بەتوانای وا پێبگەیەنێت کە هۆکارو کادری زانستیانەی نوێ پێشکەش بە نەتەوەکەمان بکات، یان پێویستمان بەوە هەبێت کە لەسەر سفرەو خوانی بیانیەکان دابنیشینو پاشماوەیان کۆبکەینەوە.

بێگومان دەبێ دامەزراوە گشتیە زانستیەکان لەجیهانی ئیسلامیدا گرنگی جێگەو شوێنی خۆیان بزانن، دەبێ گۆرانکاری بەسەر ژیریاندا بهێنن،و پشت بە نەتەوەو، هەوڵو ووزەکانی نەتەوەو، بڕواو ئایینەکەی ببەستن، لەگەڵ بیرو بۆچوونی هزریو ئامانجو ئاواتەکانیو وانەکانی کاروانو پەندو ئامۆژگاریە مێژوویەکانیشی، بۆئەوەی بتوانن کە پرۆگرامو شێوازی زانستی گشتگیر پێش کەش بەنەتەوە بکەن، کە ووزەکانو تواناکان بەشێوەیەکی چالاکانەی ڕێکخراوی

درووستو بەجێ بخەنەکار، تابتوانرێ بەرگری لەو هێرشانە بکرێت کە ڕوو بە ڕوومان بوونەتەوە،و پێداویستی‌یە ڕاستەقینانەکانی نەتەوەکەمان دابین بکرێن‌و ئاسان بکرێن.

بۆ ئەتەوە ناگونجێ کە دامەزراوە زانستی‌یەکانی جگە لەوەرگێڕانی پێت بەپێتی زانستو زانیاری‌یەکان‌و پرۆگرامەکانی ڕۆژئاوایی‌و ڕۆژهەلاتی شتێکی‌تر پێش کەش بەنەتەوە نەکات،و ئەوپەڕی ئەوەی ڕۆشنبیرانی موسلمان لەبەشداری‌کردنی زانستیانەدا پێی گەیبون زەرکەفتو ڕووکەش کردنی بەرهەمی ژیری خەلکانی‌ترو بەرهەمی بیری خەلکانی‌تربێت بەدەق‌و ناوو ژمارەو سەرژمێری ناوخۆیی‌یەوە، ئەمەش لەڕاستی شوێن کەوتن‌و چاو لێکەری‌و لاسایی‌کردنەوەو بێدەسەلاتی‌و لەدەستدانی ڕەسەنایەتی کەم ناکاتەوە، بگرە هەر ئەویشە.

پێویستە هەنگاوەکانی دامەزراوە زانستی‌و فێرکاریەکانی جیهانی ئیسلامی لەهەموایەتی‌و قەناعەت‌و مەبەستەکانی نەتەوەو ئەوەی لە ویژدانی ئەو دایە سەرچاوە بگرن‌و بەڕێبکەون، واتە هەنگاوەکان نابێ نامۆبن بەنەتەوەو پێکهاتەکانی ناوەکی‌و دەرەکی ئەو نەتەوەیە،و ئەو دامەزراوەو مەلبەندو یەکەو کۆمەلە زانستی‌یانە دابمەزرێنێت، کە کاردەکەن لە پێناوی دارشتنی پرۆگرامە زانستی‌یە ئیسلامی‌یەکان‌و گەشەپێدانیاندا، لە هەموو لقێك لە لقەکانی زانستدا،و پێویستە ئیسلامییەتی مەعریفە دەست بکات بەکار لەسەردانانی پرۆگرام گەرایی ئیسلامی‌ی پێویست لەهەموو لایەنەکانی زانستو زانیاری‌و دانانی پێشەکی‌و سەرەتاکانی‌و بابەتە گشتی‌و بنەڕەتی‌یەکانی، بۆ ئەوەی کەئەم پرۆگرام‌و دامەزراوەو پێشەکیانە ببنە دەرچەو چوارچێوەیەك بۆ لێکۆلینەوەو ئیجتیهادی زانستی‌و شارستانی‌یەتی ئیسلامی بۆ ئاڕاستەکردنی هەولەکان‌و بایەخەکانی ئەوەی پێشکەوتوو.

بۆ سەرخستنی هەولەکانی چەسپاندنی(ئیسلامی‌یەت) لەبەشەکانی زانستو زانیاریدا ئاڕاستەکردنی ووزەی لێکۆلەوەران لە زانایان‌و مامۆستایان‌و خوێندکاران پێویستە بەرەو چوارچێوەیەکی زانستی ئیسلامی نوێ‌و ئامانجە نوێیەکانی ژیاری ئیسلامی، لەسەر بناغەو بنچینەی پرۆگرام گەرایی زانستی‌یانەی ئیسلامی نوێ،و ئەوەی لەسەری دادەمەزرێ لەسەرەتاکان‌و ئەگەرە ئیسلامی‌یەکان‌و بەخششەکانی،و گەشەپێدانی ئەم عەقلییەتە، وەهەلاوێردنی پاشەکەوتە زانستی‌یە بەدەست هاتووەکان کە لەبەر دەستماندان لە کەلەپووری نەتەوەکانی

دەوروبەرمان لەسەر تیشکیو لەبەر ڕوناکی ئەو پرۆگرامەو واتاکانیدا. نمونەی ئەو جۆرە هەوڵانە تاقانە ڕێگەی کردەیی‌یەکە تواناو پێگەیشتنو هێزو پێزی زانستیی پرۆگرامیی ڕەسەن دەهێنێتەدی.

سەرهەڵدانی بەشەکانی زانستیی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی لەهەندێك لە زانکۆ ئیسلامیەکاندا وەك بەشەکانی ئابووری ئیسلامیو ڕاگەیاندنی ئیسلامیو شارستانی ئیسلامی، یان دامەزراندنی مەڵبەندەکانی لێکۆڵینەوەو لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتی‌یە ئیسلامی‌یەکان بۆ نموونە وەك مەڵبەندەکانی لێکۆڵینەوەی فکری ئیسلامیو ئابووری ئیسلامیو، ووتنەوەی ماددە کۆمەڵایەتی‌یە ئیسلامی‌یەکان لەهەندێك لەلقەکانی زانیاری کۆمەڵایەتیدا، وەك ووتنەوەی پەیوەندی‌یە دەولیە ئیسلامی‌یەکانو بیری سیاسیی ئیسلامیو سستەمەکانی فەرمانڕەوایی ئیسلامیو گەشەسەندنی ڕامیاریی جیهانی ئیسلامی، هەموونەم هەنگاوانە هەنگاوی باشن، پێویستە هان بدرێنو پشتگیریان بکرێت،و پێویست بەئامادەکردنی ئامرازو پێویستی‌یەکانی دەکات بۆ گەشەپێدانو فراوانکردنی مەودای کار ئەنجام دانیو بڵاوکردنەوەی، وەدەبێ لێکۆڵەری شیاو لەبواری پسپۆری یەکەیانو سەرچاوەکانی مەعریفەی ئیسلامی‌دا بۆ دابین بکرێت، ئەمەش بۆ کارکردنو یەك لایی‌بوونەوە بۆ خزمەتی لێکۆڵینەوەکانیو گەشەکردنیو بە ئەنجام گەیاندنیان.

لەگرنگترین کۆسپەکانی سەر ڕێگەی ئاڕاستەکردنەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی‌یە ئیسلامی‌یەکان، کەمیی ئامرازو تواناکانە، هەر یەکێك لەو مەڵبەندو بەشو یەکانە بگرین هەست بە لاوازیی تواناکانی دەکەین،و هەست بە دەستەبەر نەبوونی لێکۆڵەری شیاوو تایبەت دەکەین بۆکارکردن لەپێناوی خزمەتی پرۆگرامە تازەپێگەیشتووەکانیدا.

وە لەم قۆناغەدا هەر ئەوە بەس نی‌یە کە مەڵبەندێك یان بەشێك بکرێتەوە، یان بڕیاری خوێندنی فلانە ماددە بدرێت پاشانیش لێکۆڵەرەوەی ئامادەکراوو گونجاوو پسپۆڕو ئامێری یارمەتیدەریان بۆ دەستەبەرنەکرێت، بۆڕاپەڕاندنی کارەکەیانو لێکۆڵینەوەکانیان یان دابین نەکردنی هۆیەکانی بڵاوکردنەوەو ڕەواج پێدانیانو بانگەشە بۆیان تاکو ئامانجە خوازراوەکان بێنێتەدی.

ئەگەر قورسایی کارکردن ووتنەوەی پرۆگرامی ئیسلامیی تەکنیکی‌یان کۆمەڵایەتی بخرێتە سەر شانی لێکۆڵەرانو ئەو مامۆستایانەی کەکاری قورسی ژیان بەسەردا دراوە بەشێوەیەك کەماوەی لێکۆڵینەوەی زانستیی قووڵیان

نەماوە، ئەوە ئەو شێوازە بێبەرهەمە لەم قۆناغەی کاروانی زانستیو ژیاریی نەتەوەدا، ئەمە شێوازێکە لەبیانوو بەدەستەوەدانەوە نزیکترە وەك لەداوای بەرهەم هێنان،و لەدروشمەوە نزیکترە وەك لەلێبڕانو بۆکارکردنو قەناعەت.

ڕێگەی سەرکەوتنی بە ئیسلامیەت کردنی مەعریفەو ئیسلامی کردنی زانستو پرۆگرامە زانیاریو فێرکاری نایەتەدی مەگەر لەبەرەنجامی کاری بەردەوام دا،و کەڵەکەبوونی یەك لەدوای یەك، ئەوسا قەوارەو دیدو ماددەی زانستی ئیسلامی ڕەسەن دەکەوێتە بریسکانەوەو شەوق دەداتەوە، ئەوە باسێك نیە ڕابگەیەنرێت یان بڕیارێك بێت لەدەزگاکانی وەك ئێزگەو ڕاگەیاندنەوە دەربچێت، یان دروشمێك بێت لەودروشمانەی کە پسپۆڕەکان بەرنامەی بۆ دانەڕێژنو بەبەردەوامی کاری ڕێکخراوی لەسەر نەکەن، تاکو ئاستێك هەندێکی دەچێتە پاڵ ئەویتر، بۆ ئەوەی داری خوار ڕاست بێتەوەو بەهێزو خۆڕاگر بێتو لق دەربکاتو بەربگرێت.

یەکەم هەنگاوی ئیسلامی پێویست بۆ بەئیسلام کردنی مەعریفەو ئیسلامیەتی نەتەوە ئەوەیە کە دامەزراوە زانستیە ئیسلامیەکان بەم کارانە هەڵسن:

(أ) لێکۆڵینەوەو پۆلێن کردنی دەقەکانی سروش لەقورئانو فەرموودەی ڕاست(صحيح)،و ئاسان کردنی واتاکانیانو لێکدانەوەی مەبەستەکانیان بۆ لێکۆڵەرانو ڕۆشنبیران، هەریەکە بە پێی گرنگی پێدانی خۆیو بواری پسپۆڕیەتەکەی.

(ب) بەدواداچوونولێکۆڵینەوەو پۆلێن کردنو دەرخستنی لەکەلتووری پەسەند لەکەلتورە سەرەکیە ئیسلامیە پسپۆڕەکان،و ئاسانکردنی واتاکانیو گەیاندنی بە وورياییەوە بۆ لێکۆڵەرانو ڕۆشنبیران.

کرداری گەیاندنی مەعاریفی فێرخوازی موسڵمانو پرۆگرامەکەیو ویژدانی بە بنەماکانی ئیسلامو کە لەپوورەکەیو ئاسانکردنی بۆی بە لێکۆڵینەوەو بەش بەش کردنیو شیکردنەوەی بۆیان بناغەیەکی گرنگە لە بنچینەکانی دروست بوونو بەرهەم هێنانی ڕەسەنایەتیو(انتماء)وە یەبێ دەستەبەرکردنی ئەمەش هەموو هەوڵێکی چاکسازیی هێزی ئیسلامی هاوچەرخ دەبێتە تراویلکەو بەفیڕۆدانی هەوڵو کاتیش.

(ج) لەسەر دامەزراوە زانستیو زانست خوازەکانو زانکۆ ئیسلامیەکان پێویستە کە زانایانی خاوەن توانا لەخۆبگرن لەوانەی کەدەستیان هەیەو بەتوانان

لەپسپۆڕیی کۆمەڵایەتیدا،و زانان‌و بە توانان‌و هەستیارن بەبیرو بۆ چوونەکان‌و کەلتووری‌ئیسلامی، بۆ کارکردن‌و لێکۆڵینەوەی ڕێک‌و پێکی بێ پسانەوەی تایبەت لەشێوەی لێکۆڵینەوەو بەدوادا چوونی زانستیانەدا، کە بەهۆیەوە دیدی زانستی ڕوون ببێتەوە لەگەڵ پرۆگرام گەرایی زانستی‌یانەی پێویست، مەڵبەندە زانستی‌یە پسپۆڕەکان‌و بەشەکانی خوێندن‌و لێکۆڵینەوەی بالا کە لەسەرەتاوە، باشترین شێوازن دەگونجێ یاریدە دەربن بۆ بەدیهێنانی خوازراو، لەم شوێنانەدا لێکۆڵەوارەوان خوێندکاران یارمەتی یەکدی دەدەن لەدەستورێکی بەردەوامدا، بۆ ئەوەی دیدی زانستی ئیسلامی ڕوون بکرێتەوەو بدرەوشێتەوە، لەسەر ئەم بناغەیەش دەتوانرێت زانستەکان‌و پرۆگرامەکان‌و پەرتووکەکانی خوێندن‌و لێکۆڵینەوەی تێروپڕ دابمەزرێنرێ، وردە وردە شوێنی پرۆگرامەکان‌و بیرو بۆچوونەکان‌و زانستە بیانی‌یەکان دەگرێتەوە،و لەوزانستە بیانی‌یانە هیچ نامێنێتەوە مەگەر ئەوەی یان ئەوەندەی زانست‌و لێکۆڵینەوە بەراوردکاری‌یەکان پێویستی‌یان پێی هەبێت لەهەموو بوارێکدا بەپێی پێویستی‌و داخوازی‌یەکەی.

ئەو دیمەن‌و وێنەیەی لای خەڵکی باوە، ئەوەیە کەموسڵمانان لاوازو بێ‌دەسەلاتن لەڕووی کەمی کەرەسەو خۆ ئامادەکردنەوە، شان بەشانی ئەمەش بڵاوکردنەوەی کتێب‌و دانراوی ڕووکەشانەی پڕ لەهەراو هۆسەی ئەوتۆ کەدەرفەتێکی لەبار بۆ ئامادەکردن‌و پێگەیشتن‌و کامڵ بوونی ئەو کتێب‌و دانراوانە نەڕەخساوە بەهۆی پەلەکردن لەخێرا بەدەستەوەدانی بەرهەمی ئەو کتێبانە، لەڕاستیشدا ئەم کارە جگە لەبازدان‌و خۆشاردنەوەمان لەئاستی ئەرک‌و بەرپرسیاریەتیەکانماندا هیچ واتایەکی تری نی‌یە، ئەگینا بێ ئومێدی‌و لێڵ بینی‌و پەرێشانی‌و پەشۆکاویمان نەدەگەیشتە ئەم ڕادەیەو بەم ڕۆژگارەش نەدەگەیشتین کەڕابەرو ڕێ نیشاندەرێکمان نەبێت.

(٥) لەسەر دامەزراوە زانستی‌یە ئیسلامی‌یەکان پێویستە کەهەڵسن بەکرداری وریاکردنەوەی گشتی بۆ سەرکردەکانی نەتەوەو ڕۆشنبیرو زاناکانی،و خستنە بەرچاوی دۆزەکانی ئیسلامیەتی مەعریفە بۆیان،و ڕوونکردنەوەی ئەو لەوبیانوو پێگەکانی لەنەتەوەداو لەم سەردەمەی ئیستاماندا، لەگەڵ ئەوەی کەپێویستە پێی بگات لەگرنگی پێدانیان‌و هەوڵەکانیان، هەروەك لەسەر ئەم دامەزراوانە پێویستە کەدەرگاکانی بخاتە سەرپشت لەبەردەم ئەم کۆمەڵە سەرکردەیی‌یانەدا

لەسەرشێوەی کۆڕو کۆبوونەوەی زانستی‌و ڕۆشنبیری، تاکو لایەنەکانی ئەم باس‌و بابەتە ڕوون بکاتەوە بۆیان،و دوانگەیەك سازبکات کە بەشداربوانی بەخشندەیی‌و هاوبەشی خۆیانی تیابخەنە بەرچاو لەهەموو لایەنێك لەلایەنەکانی زانستیدا کەپێویستی نەتەوە بێت،و جێی ڕێزی ڕۆشنبیران‌و سەرکردەکانی بێت.

هەروەها لەسەر ئەم دامەزراوانە پێویستە کە کاری دروست بونی کۆمەڵە زانستی‌یەکان ئاسان بکەن، هەروەها کاری سازدانی خولی زانستی تایبەت‌و کەهۆیەکی بنچینەیی‌یە بۆپەرەپێدان‌و چالاك کردنی هاوبەشی زانستی‌و، پشتگیری لێکردنی‌و، موژدەدان بەم باس‌و لایەنە،و بکرێتە باس‌و لایەنی نەتەوەو خەمی کۆمەڵگەو ئامانجی سەرکردایەتی‌یەکان، کاتی ئەوە هاتووە قۆناغی درووشمی بەتاڵ‌و بۆش بەسەر بچێت کە گۆشەیەك لەگۆشەکانی بورج‌و بەرزاییەکانی زانستی‌دا ژمارەیەکی دیاریکراوی لەکارایان لەخۆگرتووە.

(هـ) لەسەر دامەزراوە زانستی‌و ئیسلامی‌یەکان پێویستە ئاراستەی ناردە زانستی‌یەکان‌و لێکۆڵینەوەو خوێندنە بالاکان‌و لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکان بەرەو ئەو بابەت‌و باسانەبکەن کەخزمەتی ڕەسەنایەتی زانستی ئیسلامی بکات، وەخزمەتی باس‌و بابەتەکانی ژیانی نەتەوەبکات لەڕوانگەی ئیسلامی‌یەتی ڕەسەنەوە،و چاودێری خوێندکاران‌و لێکۆڵەران بکات، لە هۆیەکانی خوێندن‌و لێکۆڵینەوەکانیاندا لەپێناوی خزمەتکردنی ڕەسەنایەتی مەعریفەدا بۆئەمەش لەسەر دامەزراوانە پێویستە کەشارەزاو کادێری زانستی‌ی پێویست ئامادەبکەن، بۆ مەشخەڵ هەڵگرتن‌و، بەردەوامی کاروان‌و، تاکو لێکۆڵەر ون نەبێت یان لەگەشتە خۆراواییەکەی کە زانست‌و ژیری‌یەکەیشی خۆراوایی کردووە، وە(انتماء)ەکەیشی لاوازکردووەو بووەتە ئامێرێك لە ئامێرەکانی داگیرکاری ڕۆشنبیری داگیرکاران، کەزۆر لەمێژە ئێسکی نەتەوەو یاسا عەقیدەیی‌و بیری‌و ئەکادیمی‌و هونەری‌یەکانی پووت دەکات.

پێویستە لەسەرمان دڵنیابین لەوەدا کە بەتواناو تێکۆشانی بەرنامە بۆ دانڕاوو ڕێك‌و پێك‌و کاری بەردەوامی پڕبەرهەم دەگەینە ئەوەی کەکاری خۆمان ڕاپەڕاندبێ‌و ئەرکی سەرشانمان بەجێ‌هێنابێ‌و دەتوانین داوای ڕەزای خوابکەین لەگەڵ داوای سەرکەوتن لێی، بەڕاستی هەر ئەویش باشترین سەرپەرشتی کارەو باشترین‌و چاکترین پشتیوانە.

**٣ ـ ئاییندەی کاروانی مرۆڤایەتی:**

ئەگەر ئاییندەی داڕشتن و دامەزراندنی نەتەوە بەندبێت لەسەر ئەندازەو مەودای سەرکەوتن لە چاکسازی پرۆگرامەکانی بڕی نەتەوەو شێوازە پەروەردەیی و ڕێکخستنەکانی چەسپاندنی مەعریفەو کۆمەڵناسی و کۆمەڵایەتی ئیسلامی، ئەوا ئاییندەی پڕ لەدوڵی و دانەمەزراوی هەڕەشەلێکراوی مرۆڤایەتی بۆ ماوەیەکی نزیك، بەندە بەسەرکەوتنی نەتەوەی ئیسلامی‌یەوە لەچاك کردنی پرۆگرامەکانیداو ڕوونکردنەوەی بەرچاوی پێش کەش کردنی نمونەیەکی ئیسلامی زیندوو.

ئیسلام ئامانجایەتی‌یەکەی سەلمێنەر لەبووندا دەبەخشێتە ئادەمیزادەکان چ تاك چ کۆمەڵ، و بنەماکانی پابەندێتی بەڕەوشتی بەرزەوە پێشکەش بەقەوارەیی مرۆیی دەکات، هەروەها هەستە فیطریەکان لەبەرچاوی مرۆڤدا بەڕۆشنی نمایش دەکات لەگەڵ ڕەهەندە هەموایەتیەکانی‌دا، بەنادیارو دیارەوە لەنێودەروون و کۆمەلگەو بوونەوەردا.

ئیسلام ئاسوودەیی کۆمەڵایەتی و بناغەکانی ئەو ئاسوودەیی‌یە بە مرۆڤایەتی دەبەخشێ، هەروەها پێشکەوتنی شارستانێتی، و ئاشتی و ئاسایشی جیهانی‌ی بۆ دەستەبەر بکات.

ئاینی ئیسلام سەروەری و بونیادی دامەزراوەی خێزان دەپارێزێت، و بنەمای داد ڕەوا دەبینێ، هەروەها سەرپەرشتی کردن، و لێپرسراویەتی تاکە کەسی و کۆمەڵایەتیش، و ئازادی سەربەستی بڕواو عەقیدەو بیرو ویژدان، وەدان بە بنەماو ڕەویەتی ڕاوێژدا دەنێ و پەسەندی دەکات و پشتی دەگرێت، وەدان بەبنەمای یەکپارچەیی مرۆڤەکاندا دەنێ لەڕووی بنچینەو بەرژەوەندی و چارەنوسیانەوەهانی مرۆڤ دەدات بۆ زانست و زانیاری و بانگەواز بۆ شارەزابوون و زانیاری دەکات، فەرمان بە چاکسازی و ئاوەدان کردنەوەو بنیاتنان دەدات، و فەرمان دەدات بەجێ بەجێ‌کردنی پێویستی‌یەکان و ئاسان کردنی ڕێگەی چارەسەرو دابین کردنیان، وە ئەم دیدو بۆ چوونە ئیسلامی‌یە ڕاست و ڕێکە کە مرۆڤایەتی هەوڵی بۆ دەدات، ڕێ دەگرێت لە نەخۆشی‌یەکانی سەردەم و مەترسی‌یەکانی شارستانی‌یەتی‌یە ماددیەیە ون و گومڕاو سەرلێ شێواوەکەی کە بێبەشە لەدەست گیرۆیی و ڕێ نموونی خوایی.

مایە پوچیو دەست بەتاڵی شارستانییەتی ماددی ئەمڕۆش لەکەس وونو نادیار نییە،جگە لەڕمانی دامەزراندنو بناغەکانی خێزان لەو کۆمەڵگایانەدا، ئەوەش کەڕۆڵەکانی ئەو کۆمەڵگایە تووشی هاتوون لە هەموو جۆرەکانی دلەڕاوکێو دەروون دانەمەزراویو دەست بەتاڵیو مایە پووچیی گیانی

مرۆڤایەتی ئەمڕۆ لەسێبەرو سایەی توانای شارستانیەتی ماددیدا، کۆمەڵگاکانی شەقو پەق دەبنو دەڕمێن دونیاو جیهانەکەشی دابەش بووەو دابەش کراوە بۆ باکوورو باشوور، ڕەشو سپی، دەوڵەمەندو هەژار، برسیو تێر، داگیرکراو داگیرکەر، گەورەکانو کۆیلەکان، هەموویان سەرقاڵی کێبەرکێی وێرانکارییو هۆیەکانی وێرانکارین،و بۆ مرۆڤایەتی هیچ شتێك لە واتاکانی ئاشتی نەماوەتەوە جگە لەترسو بیمو تۆقین لەوێرانکارییەکی تێکڕاییو تێك شکێن بۆ جیهانی نەتەوە پەرستیو چینایەتیو سەربازگە بەگژیەکا چووەکان نەبێ.

مرۆڤایەتیو گەلە بەتواناکان لەزانستو ماددەدا لەم چاخو سەردەمەدا لەهەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بە ئیسلامە لەبەر ئەوەی ئەو واتاو چەمکانەی تیایە کە وەڵامی هەموو لایەنە لاوازەکانی قەوارەکەیان دەداتەوە کەلەئاییندەدا شەلو پەتردەبن وە کۆی هەموو ئەو چەمکانە لەم دووخاڵەدا دیاری دەدات:

## خاڵی یەکەم:

ئایینی ئیسلام کۆمەڵگایەك دادەڕێژێو دادەمەزرێنێ کە لەسەر بناغەی یەك پارچەییو واتاکانی برایی دابمەزرێتو دابڕێژێ،و تێڕوانینی چڕی خۆی دەخاتە سەر وەڵامدانەوەی پێویستییە بنەڕەتییەکانی تاکە کەسو خاڵە گرنگو هاوبەشەکانی نێوان تاکەکان لەگەڵ یەکتریدا لەهەموو ئاستێکدا، لە خێزانەوە بۆ دراوسێو بۆ هۆزو بۆ مرۆڤایەتی.

وە ئەم گەلانە کە ووزە ماددییە فرەکانی وێانکاری دەخەنەکار ناتوانن بژین لەسایەو سێبەری فەلسەفەکانی ڕوو بە ڕووبونەوەو کێشەی لەنێوان تاکەکانو هۆزەکانو نەتەوەکانو چینەکاندا یان ئەوەی کە بەفەلسەفەی(تێفە بەرامبەرەکان) ناسراوە بێ گومان لەگەڵ دەستەبەربوونی ئامێرە جیهانیە وێرانکارەکان دا وە لەسایەی دەروونایەتی کێشەو ڕوو بەڕووبوونەوەو گرنگی دان بەلایەنو ڕووەکانی جیاوازیو پێچەوانەییو دژ بەیەك دا، هیچ گومان لەوەدا نامێنێ لەبەر تیشکی ئەوەی دیومانەو دەیبینین لەخوێن ڕشتنو دەست

درێژکاری گەلاندا کە کلیلو زمانە لەساتێکی شێتییەتی خۆکوژی مرۆییدا بترازێو وەك پێشتریش ڕوویداوە کارەساتێکی وێرانکارو تۆقێنەر لەداهاتودا بەڕیابکات زیاتر لەڕابردوو خەتەرناك بێت.

لێرەوە دەزانین کە دونیای ئیسلام یان دونیاو جیهانی(ئەڵقە بە ناویەکدا چووەکان) و(ئاسودەیی کۆمەڵی) فەلسەفەی سبەینێ دەبێت کە جگە لەویش ڕێگەیەکی تر نییە بۆ هێنانەدی ئاسوودەییو ئاشتی ڕاستەقینە بۆ جیهانی ئایندە.

خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ ياايها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالاكثيرا ونساءا ﴾ النساء: ١

﴿ ياايها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا، ان اكرمكم عندالله اتقاكم، ان الله عليم خبير ﴾ الحجرات: ١٣

﴿ ومن آياته خلق السماوات والارض واختلاف السنتكم والوانكم ﴾ الروم:٢٢

﴿ وماكان الناس إلاّ امة واحدة فاختلفوا ﴾ يونس: ١٩

﴿ وبالوالدين احسانا وبذي القربى واليتامى والمساكين والجار ذي القربى الجار الجنب والصاحب بالجنب وابن السبيل ﴾ النساء: ٣٦

﴿ من اجل ذلك كتبنا على بني اسرائيل انه من قتل نفسا بغير نفس او فساد في الارض فكأنما قتل الناس جميعا ومن أحياها فكأنما أحيا الناس جميعا ﴾ المائده:٣٢

﴿ ولا تنسوا الفضل بينكم ﴾ البقره: ٢٣٧

﴿ وقولوا للناس حُسنا ﴾ البقره: ٨٣

﴿ لاينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم ان تبروهم وتقسطوا اليهم ان الله يحب المقسطين ﴾ الممتحنه: ٨

﴿ و ان عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به ولئن صبرتم لهو خير للصابرين﴾ النحل: ١٢٦

﴿ وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلوكم ولا تعتدوا ﴾ البقره: ١٩٠

﴿ فان انتهوا فلا عدوان الا على الظــالمين ﴾ البقـره: ١٩٣

﴿ولا يجرمنكم شنآن قوم على الا تعدلوا اعدلوا هو اقــرب للتقــوى واتقــوا الله﴾ المـائده: ٨

﴿ واذا قلتم فاعدلوا ولو كان ذا قــربى ﴾ الانعـام: ١٠٢

﴿ واذا حكمتم بين الناس ان تحكموا بــالعدل ﴾ النســاء: ٥٨

﴿ وتعاونوا على البر والتقوى ولاتعاونوا علــى الاثم والعــدوان ﴾ المـائده: ٢

﴿ وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فاصلحوا بينــهما، فــان بغــت احداهمــا علــى الاخرى فقاتلوا التي تبغي حتى تفيء الى أمــر الله،فــان فــاءت فــاصلحوا بينــهما بالعدل واقسطوا، ان الله يحب المقســطين، انمــا المؤمنــون اخــوة فــاصلحوا بــين اخويكم، واتقوا الله لعلكم ترحمون، يايها الذين آمنــوا لايســخر قــوم مــن قــوم عسى ان يكونوا خيرا منهم ولا نساء من نساء عســى ان يكــنَّ خــيرا منــهن ولا تلمزوا انفسكم ولا تنابزوا بالالقــاب ﴾ الحجـرات: ٩-١١

**خــاڵی دووەم:**

پەیوەندی بــەواتای زانیــاریو ڕێگــەکانی لێکۆڵینــەوەی زانســتییەوە هەیــە، بــیری مــاددی لەبنــەڕەتدا لەســەر شــێوازی ژیریــی ئــەزموناوی ئیســتیقرائی بــەندە لەجیــهانی هەســت پێکــراوو ئــەزمونو شــارەزاییە بەدەســت هاتووەکانــەوە ســەرچاوە دەگرێت، بۆ ناســینی ئــەو یاسایانەی کــە ژیــانو بوونــەوەر بەڕێوەدەبــەن، ئەمــەش بیرێکــە لەهــەر زانیاریــەکی پێشــووتر یــان لــە سروشــتی خوایــیەوە جودایــە لەبــەر چــەند هۆیــەکی تایبــەتی بــە ئایینــە گــەورەکانی تــرەوە ـ بەتایبــەتی گاورێتی(مەسیحیەت) ـ کە لەتوانای شوێن کــەوتووەکانیدا نیــیە متمانــەو بــڕوا بــە هیــچ زانیاریــیەك بکــەن کە کتێبــی پــیرۆزی ئــەوان هێنابیــەتی یــان تیــا هــاتبێت کــە بــەدرێژایی مێــژوو دەســتکاری کــراوە پڕیــووە لەچــەندەها شــت کــەژیریو زانســتو فیطرەی بێگەرد بەڕاستی نــازانێ.

ئەگــەر هەســتمان کــرد بــەو ئاڵۆزیــیە زۆرەی سروشــتی کۆمەڵایــەتی ئــادەمیزادو، زۆریــی ژمــارەی هۆکارەکانیشــمان زانــی کــەکار لەڕەوشــتو هەڵسوکــەوتی مرۆیــی دەکــەن، هــەروەها زانیمــان هــەرگیز نــاگونجێو بــەدوور دەزانرێ کــە هــەندێکیان جێگــیر بێــت لەمرۆڤــەکانداو یــان مــل کــەچ پێکردنــی مــرۆڤ بۆئــەنجام دانــی ئــەزموونی

کارگەیی لەسەری، ئەوا ئەو کاتە هەست بە کەوتن و هەڵسانەوەو لارو ویری زۆر لەزانیاری و زانستە کۆمەڵایەتی یەکان و ــــ بەدوایەکدا هاتنی بیردۆزو بیروڕا دژ بەیەك لە گۆڕەپانی زانستە ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی یەکاندا دەکەین.

مادام شوێنەواری هەڵەکان لەم بوارانەدا لەماوەیەکی کورتدا ڕوون نابێتەوە، و بەئاسانی شوێنەوارە ویران کەرەکانی نافەوتێنرێت و لەناو نابرێت دوای ئەوەی کە گەیشتووەتە ئەندازەیەکی ئەوتۆ کاریگەری لەسەر دروست کردن و پێك هێنانی کۆمەڵانێکی زۆر لەمرۆڤ و بونیادەکەی هەیە.

ئەگەر ئەوەمان زانی، واتەوەش دەزانین کە تایبەتمەندێتی یەکی بۆ ماوەشی لەبواری مەعریفەی ئیسلامیدا هەیە کەیەك دەگرێتەوەو دەگونجێ لەگەڵ زانیاریی ژیریی ماددیدا لەڕەچەڵەك و بناغەی زایندەیی و، سوونەتی بونەوەریاندابەڵام هەربەوەشەوە ناوەستێ بەڵکوو پاکی ئەکاتەوەو لەزیانی لایەنەکانی کەم و کوڕی دەیپارێزێت.

لەکاتێکدا کە لەسەر موسڵمان پێویستە چاوبگێڕێتەوەو بە قووڵی وورد ببێتەوەو تێبگات لەدروست کراوەکان و ئەوەی کە خوای گەورە پێی داوون لەزایندەیی و پەیڕەوو ڕەویەت و مامەڵەیان لەگەڵ بکات بۆ سوود لێوەرگرتنیان، دەبێ بشزانێت ئەندازەیەکی باش لەدەرچەو بەڵگە نەویستە پێشترەکانی پێیە کە لەڕێی سروشتی خواییەوە پێی گەیشتووەو تایبەتە بەلایەنەکانی کۆمەڵایەتی یە ڕەووشتی یە بنچینەیی یەکانەوە، ئەگەر موسڵمان هەڵەیەکیشی لەتێگەیشتن و واتاو یاساکانی بوونەوەرو بوون و پەیوەندی یەکاندا کرد، ئەوا سروش هەیەو پارێزەریەتی لەپەشیمان بونەوە.

هەر شتێك دژ بووەستێتەوە بەرامبەر حەڵاڵێك یان حەرامێك یان شوێن پێ هەڵگرتنێکی ئیسلامی هەموانەیی کەلەسەر بنەمای واتای ڕاستی دەقی قورئان و سوننەتی ڕاشکاون ئەوە کارێکی هەڵەیە، بەم شێوەیە زانیاریی ئیسلامی لەیەك کاتا سەرچاوەکانی مەعریفی ژیری و ئەزمونی لەگەڵ سەرچاوەکانی ڕێنموونی گشتی ی خوایی ڕێك و سەرکار دەخات، بەم پێیە موسڵمان بۆی هەیە کە مامەڵە بکات و کڕین و فرۆشتن ئەنجام بدات هەرکاتێك بیەوێت، ئەوەی خواش بڕیاری لەسەر لەبازرگانی و بەرهەم هێنان، مەگەر کارێك نەبێ کە ئازار بەخەڵکی بگەیەنێ یان سووخواردن و ستەم بێ، نەك توانا سەرف کردن و قازانج گۆڕینەوە، موسڵمان بۆی هەیە چۆن ئارەزووی لێیە وابکات لەگرتنەبەری شێوازەکانی ژیان و عادەت و

ڕەوشتو دابی ژیانی خێزانداریی بەڕێزو پیرۆزدا، مەگەر ئەوەی حەلاڵ نییە لەئەنجام دان لەچنو مێردایەتی‌دا یان بۆ بڕیارو(عقد)ێکی ڕێ پێدراو کەدابینی ڕێزی ژنو منالەکەیشی بکات، مافە دەروونیو ماددییەکانیشیان دابین بکات، ئەگەر بەم شێوەیە نەبوو ئەوا ستەمی لەخۆی کردووەو کاری ناڕەوای ئەنجام داوەو دەست درێژی کردووە، خوای گەورەش دەست درێژی کارانی خۆش ناوێت.

بەم شێوەیە حاڵو باری سروشو دەستورەکانی ئیسلام لەکۆتو لەقالبیش نەدراون، بەڵکو مەشخەڵو نیشان کردو دەست گیرۆیی کاران لەسەرە ڕێگای ژیاندا بۆ لادانو لابردنی گومڕاییو سەر لێشێواویو کاری بەدو خراپو بەدیهێنانی بوونو پەیوەندییە کۆمەلایەتی‌یە هەرە جوانو باشترەکان.

﴿ ان الله يأمر بالعدل والاحسان وايتاء ذي القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر والبغي، يعظكم لعلكم تذكرون ﴾ النحل: ٩٠

نەزانیو بێئاگایی شوێن کەوتوانی ئیسلام هیچ لەم ڕاستی‌یە ناگۆڕن بەهۆیسەبارەت بەدەوری عەقل کاری‌یە لەبەرانبەر نەقل(دەق)داو کەم گرنەوەی پایەی ئەو دەورەش ئەمە کارێکە لەدوای ووزەو تواناکانی خۆیانەوەیە بەهۆی دابڕانو جیابوونەوەیەکەوە کە بارەکانی ژیانو ڕووداوەکان لەسەر سەرکردایەتی هزرییانو سەرکردایەتی کۆمەلایەتییان بۆ چەند سەدەیەك پێویستیان کردووە.

ئەم دووخاڵەی بریتین لە(مجتمع الوحدە)واتە(کۆمەلگەی یەکپارچە)و یەکبوو، لەبەرامبەر(مجتمع الصراع)واتە (کۆمەلگەی ململانێ)،و تەواو گەیاندنی یاساکانی پەیوەندی لەچاوگو سەرچاوەکانی زانستی مرۆڤایەتیدا، ئەگەر موسڵمانان بە چاکی تێیان بگەنو ببنە پێشەنگ بۆ دنیای سبەینێ، گرنگی‌یەکی تایبەتی لەو دووخاڵەدا هەیە لەکاتێکدا کە کۆمەلگای مرۆیی ناتوانێ باجی هەڵەکانی بدات، وەك لەڕابردوودا پێوەی ڕاهاتووە، کاتێك لەشەڕو جەنگە مێژوویی‌یەکاندا دەیەهاو سەدەها پیاو تیاچوون، وە نەتەوەکانی‌تر کە لەو گۆڕەپانانەدا نەبوون پارێزراوو لە ئاسایشدا بوون، تاکو گەیشتە ئاستێك کە زەوی بوو بەیەك گۆڕەپان، هەر هاوارێك هەستی بیستنی هەموو ئەوانەی دەورووژاندو دەڕووشاند کە لەوێدا بوون،و هەرکارەساتێکی دڵ تەزێن چاوی ئەوانەی تری دەبرد کە لەو کاری لەدیتنیان دەکرد،و هەموو ئازارێك کەسەری هەڵدەدا هەموو ئەوانەی دەگرتەوە کە لەو مەیدانەدا بوونو.

ئەو کاتەی کە مرۆڤایەتی گەیشتە دڵنیایی تەواو لەوەدا کە پێی گەییوە لەهۆیەکانی وێرانکاری‌و تێکدان‌و هەڕەشەکردن لەبوونی زەوی لەبۆشایی بوونەوەرو ئاسماندا.

تەنها لەو کات‌و ساتەش دا مرۆڤایەتی هەست دەکات کە پێویستی زۆری بەیاساو وورده کاریگەرە بڕیار دەرەکان هەیە، کە لەقورئانی پیرۆزو فەرموودە ڕاستەکاندا باسکراوون‌و کە پێویست دەکات ڕێزیان بگیرێ‌و جێگەی متمانە بن لای هەموو بەویژدانێکی چاوتیژو وریا، بۆ ئەوەی لە خلیسکان بۆ ناو دۆزەخی برانەوە بیپارێزێ.

وەتەنها هەر لەو کات‌و ساتەشدا دەربازبوون بە هەوڵی ڕوو بەڕوو بوونەوەو خۆ زاڵ کردن نابێت بەڵکو بە هەوڵی یەکبوون‌و لەیەك نزیك بوونەوە بۆ توێژینەوە لەهۆکارەکانی هاوبەش بوون‌و بەرژەوەندە هاوبەشەکان دەبێت.

بەڕاستی پێویستە لەسەر موسڵمانان لەپەیام‌و بەرنامەکەیان تێبگەن، وەك بەجێهێنانێك بۆ ئەرکی سەرشانیان‌و هێنانەدی هیواو ئامانجەکانی‌پەیامەکە لەم بوونەوەرەدا بەپێی حیکمەت‌و کار دروستی خوای پەروەردگار.

خوای گەورەش ڕاستی فەرمووە: ﴿ وكذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ﴾ البقرة: ١٤٣

﴿ فمن يعمل مثقال ذره خيرا يره * ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره ﴾ الزلزلة٧ـ٨

ئەمەیە کەوا دەکات لێپرسراویەتی نەتەوەی ئیسلامی‌و زانایان‌و بیریاران‌و ڕۆشنبیرانی موسڵمان چەند قات بێت، لەبەر ئەوەی ئەوان ئەگەر ماناو واتاکانی ئایینیان بەڕاستی هێنایەبوون‌و ئاشکرایان کردو کۆمەڵگەیەکی نموونەیی وایان دامەزراند کە شیاوی پێشەنگی‌و بە نموونە هێنانەوە بێت، ئەوا ئەوان هەر خۆیان ڕزگار نەکردووە بە تەنها، وە چاکسازی‌یان بە تەنها لە کۆمەڵگەکەی خۆیان‌و داڕشتن‌و دامەزراندنی کۆمەڵگەکەی خۆیاندا نەخستۆتەکار، بەڵکو بەمە چاکسازییان لەحاڵ‌و باری مرۆڤایەتیدا بەگشتی ئەنجام داوەو شارستانی‌یەتی مرۆڤییان لەسەر زەوی ڕزگار کردووەو هەروەها بەرنامەکەیشی لە چاکسازی‌و ئاوەدانکردنەوەدا، بۆ خۆیان‌و بۆ هەموو مرۆڤ کۆمەڵگەیەکی پڕ لەدادو ئاسوودەیی‌و ئاشتی دادەمەزرێنن، و ڕێنمایی هەوڵە دۆزیارەکانی زانست‌و

پێشکەوتنی ماددیو ئاوەدانکاری زیاری دەکەنو دەگرنە دەست،و ئەو کۆمەڵگە جێنشینەی کە خوا فەرمانی پێکردووە لەسەر ئەم زەوییە دادەمەزرێنن.

## کەواتە: ئیسلامییەت دۆزی نەتەوەیە

مەبەست لەم لێکۆڵینەوەیە باس کردنی باری نەتەوەیە لە وێنە گشتیو هەمەلایەنەکانیدا، وەخستنە بەر چاوی ڕۆڵەکانێتی بۆ ئەوەی ببێتە دەرچەو خاڵی دەست پێکردن بە دیتنی لەبارەوە بۆ ئەوەی شوێن کاروانی نەتەوە بکەوێت لە مێژوودا،و لێکۆڵینەوەی دۆزە گرنگەکان ئەوانەی باریان گەیاندووەتە ئەم بارە، تاکو بتوانرێ هۆیەکانی ساغیو چارەسەر بۆ تاکو نەتەوەی موسڵمانو مرۆڤایەتی بە گشتی دابین بکرێو بەرچاو بخرێت

ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەبەدی هێنانی ئەم ئامانجە گەورەنەدا هیوای پێیەتی چەسپاندنی دیدی هەمەلایەنەیە لەبیری مرۆڤ دا، وە پاڵ نانە بەژیریی موسڵمانەوە بۆ وردبوونەوەی دیدێکی بنەڕەتی لە دۆزەکانو ئەوانەی نەتەوە دوادەخەنو دەیڕمێننو هەروەها گفتو گۆکردنە لەسەر ئەم بابەتانە بە وورییاییو سەلیقەو کۆڵ پێوە هەلگرتنو لێبڕانو بابەتییانەوە، بۆ ناسینو زانینی هۆیەکانو ڕوون کردنەوەی چارەسەر.

هزرو فیکری نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیەو ڕۆشنبیریو ئەزموونو ورد بوونەوەکەی، گەیاندوویەتییە ئەو باوەڕو قەناعەتە،کە نەتەوە لەداهاتو تواناو بەهاکاندا لەهیچی کەم نییە، بەڵکوو کەمو کوڕی نەتەوە تەنها لە پرۆگرامێکی هزری دروست دایە،و دەردی کارەکەش لەکەمو کوڕی هزرایە لەتێکچوونی بینیەی کۆمەڵایەتیدا، وە تێکچوونو شێواندنی پەروەردەی ئیسلامی،و ڕمانو تێشکانی دامەزراوە گشتییەکان، تاوای لێهات نەتەوە تاك تاكو لەتو پەت بێت،و لەژێر دەستیو بێدەسەلاتیو گوێ ڕایەڵییاندا بۆ یارمەتی دانو هاوکاری کردنی دوژمنانیان بۆ سەر خۆیان زیاتر خۆیان بەکۆیلە نیشان بدەن.

هیواو ئاوات ئەوەیە ئیسلامییەت لەگشت گیرییەکەیو هەمە لایەنی یەکەیدا، وە لەئیسلامییەتی مەعریفەدا لەوەش دا کە دەیگرێتەوە لە چاکسازی پرۆگرامەکانی بیرو پەروەردەدا، ببێتە دۆزو جێبایەخی نەتەوەی ئیسلامی لەسەدەکانی داهاتوو لەمەودوادا، تاکودەگاتە ئەوەی داری خواری نەتەوە ڕاست دەبێتەوەو گەشەدەکات، تاکو دەگاتەوە ئەوەی تەندروستیو لەش ساغیو ووزەو

پڕو سـووریو ڕێـزو سـەروەرییەتییەکەیو ڕۆڵـی خـۆی لەچاکسـازیو ئاوەدانکردنـەوەدا بۆ بگێڕێتـەوە، تادەگاتـە ئـەوەی کـە بتوانـێ لێپرسـراویەتی خـۆی لـەڕێ نموونـی کردنـی مرۆڤـەکاندا هـەڵبگرێ بـۆ ڕێگـەی ڕاستو ئایینی ڕاسـتی خـوا.

هیـوای نووسـەریش ئەوەیـە کـە سـەرکردەو سـەرکردایەتییە ئیسـلامییەکانو کۆمـەڵانیان بـۆ ئـەم دەست پێکـەریو هـەنگاو هەڵنانـەو نـەڕوانن کەـ لەبـەر ئـەوەی ئـەم دەرچەیـە کـەبۆ گوایـە هـەنگاو کـاری ڕیشـەیی فکـریو ڕەواجو بـرەو پێدانـی کـاری بزووتنـەوەیی ڕامیـاری نیـە مانـای وایـە بـەتاڵ کردنـەوەی بـەهای هەوڵـەکانی ئەوانـە، کـاری ڕامیـاریو بزووتنـەوەییش جگـە لەدەسـتگیرێکی بـیریی و ووزەی دەروونی بۆ خـەرج کردنو سـەرکار خسـتن بـێ هوودەیـیو قورسـایییە کـە دەبێتـە هـۆی بـەرگری دژی تێگەیشـتنو پشـت لێهـەڵکردنی ووریـاییو وشـیاری بـە ئاگـایی ڕاستە لەئێستـەی ئـەمرۆداو دژی پـەرەپێدانی ئامرازەکـانی کارکردنـە تێیـدا.

گرنـگ ئەوەیـە دڵنیـابین کـە کێشـەکە نەتەوەیەکـەو شـیاو کردنیـەتی بـۆ بەرزبوونـەوە بـۆ ئاسـتێ سـەرکردایەتی کردنـی شارسـتانییەتو کێشـەکەی بـاسو کێشـەی دەسـەڵاتو وڵاتو پـارتێك نییـە، وە بـیریش هۆکـارێکی بنـەڕەتیو بنەماییە بـۆ سازدانو ئامـادەکردن تـاکو هەوڵـەکانو بەرنامـەکان بـەرووبومی خۆیـان بدەن.

هـەروەها گرنگیشـە دڵنیـابین لـەوەی کـە هەوڵـەکان لەهـەموو بوارەکـاندا یـەکتری تـەواو دەکـەنو پشتی یـەکدی دەگرن گـەر کارێك بـە گرنگـترین کـار هـەڵبژێرین بـەهۆی بـارو دۆخێکـەوە یـان پێویستییەکەوە مانـای وایـە کـارێکیتر پشـت گـوێ خـراوە یـان لادراوە، وە لەبـەر ئەمـە پێویستـە شـان بەشـانی هەوڵـە ڕامیـاریو بزاوتیـەکان گرنگـی بەلایـەنی بـیریش بدرێـت بـەڵکو لەبـەر چـاوگرتنی لایـەنی ڕامیـاریو بزووتنـەوەییش بەپلـەی یەکـەم کـارێکی بـەرگرین بـۆ بەدەسـت هێنـانی بـارودۆخو توانـا بـۆ گەشەکردنو چاکسـازی سـەرچاوەکانی ووزە لەعـەقڵو دەروونـەکاندا.

بـەڵکوو گرنگیشـە ڕوون بکرێتـەوە کە کاری بیرییو هـزری ئاسـتو بـواری دیـاری کراوی هـەن، هـەندێکیان بنەڕەتیو ڕیشـەیین کـە پـەیوەندییان بـە پرۆگـرامو بناغـەو یاساکانو سەرچاوەکانو ئامانجەکانـەوە هەیـەو سروشـتی بینیـەو دیـدو بـۆ چوونـی هـزری نـوێ دەکاتـەوە،و هـەندێکیان کردەیـیو سـتراتیژی بزاوتـین، وە پێمـان خۆشـە کـە جـەخت بکەینـەوە لەسـەری ئـەوەی کـە بـەدگومانی نەتـەوە لەئاسـتە هـەرە قووڵەکانیدایـە کـە پـەیوەندی بـە ژیریـەتیو پرۆگرامـەوە هەیـە،و بـیری کردەیـی

ستراتیژی و بزووتنەوەییش سەرکەوتنی خۆی لەسەربێ ساغی و دروستیی ئاستی هەرە بەرزی قوولّ دا دادەمەزرێنێ لەجۆرایەتی عەقلّییەت و پرۆگرام دا، ئەمەش ئەوەمان بۆ لێك دەداتەوە کە بۆچی بیریارێکی بزووتنەوەیی ستراتیژی وەك (عبدالرحمن الکواکبی)لەپەرتووکەکەی(ام القری)دا کە نزیکەی سەدسالّ لەمەوبەر نووسراوە بەدەربڕینێکی ڕوون بەرنامەکان و بیروڕاکان و پێشنیارە بزووتنەوەییەکانی چاك سازی ئیسلامی هاوچەرخ دەگرێتەوە نەیتوانیوە ئامانج و ئاواتەکانی بێنێتەدی، مەگەر سەرکەوتنێکی کەمی بچووکی پارچەیی، وانەبێت کە جێگەی نەتەوەی لەمێژوودا ناگۆڕێ.

هیوا ئەوەیە کە هەولّەکان زۆر چڕبن و بکەونەکار دوور لە تراویلکەی لەت و پارچەیی تابتوانرێ کاری ئیسلامی چاکسازانە بگوێزرێتەوە بۆ ئاستی بەر پەرچ دانەوە لەئاست و پلەی نەتەوەکانی جیهانیدا.

نووسەر گومانی لەوەدانییە کە ئەگەر کاتێك ئەم ئەندازەیە لەبینینەو تێڕوانینی دروست دا بۆ بیریارانی نەتەوەو زاناکانی و ڕۆشنبیرانی ڕوون کرایەوە، و ئەوانیش بە ڕاستی هاتنە پێش و خۆیان سازدا لە ئاگادار کردنەوەی نەتەوەداو نیشان دانیان و پالّ نانی هەولّەکانی بەرەو ڕاستی، کارەکە وەك دەهێنانی مویەکی لێدێ لەناو ماست دا، شەبەقی بەیان کێلگەکان دادەپۆشێ، وەك خول خولۆکەی کارگەکانی لێدێت کەل و پەل لەسەر شێوەی باشترین نموونەی، و وانەکانی مێژووش ئامۆژگاری و پەندەکانی لەم بارەوە ڕوون و ئاشکران، کە نەتەوە خرایەوە سەرڕێگەی خۆی، کە بیری نەتەوەو هەنگاوەکانی چاك کرا، ئەو کاتە ووزەکەیی و کۆمەلّەکانی وەك لافاوێکی زل پالّ دەنێ، ڕێگەی خۆی دەگرێتەبەر لەجێ بەجێکردن و بەکاربردن و بەرهەم هێناندا، بەوەی کە لەتوانای پێشتریداو بزوتنەوەی پێشتریداو ئامادەکردنی ڕۆلّەکانیدا پێوەی ڕانەهاتبوو، کاتێکی زۆر نابات باری نەتەوە دەگۆڕێت، و جێ بەجێکردنی کارەکەی لەبارو چاك دەکات، بەم شێوەیە حسابی کات درێژەدەبێتەوەو درێژە دەکێشێ لەسەرلێ کەوتەو گومڕاداو کورت دەبێتەوەو بەشی تواناو لەخۆڕادیتن و پشت قایمی ناکات.

لەسەر بیر تیژو زانایان و ڕۆشنبیرانی نەتەوە پێویستە، کە خۆیان گورج بکەنەوەو لێ ببڕێن و چاوو گوێ بکەنەوە بۆ چاکسازی لەمزرو، بۆڕوون کردنەوەی ڕۆلّەکانی نەتەوەداو پیاوەکانی و سەرکردەکانی، وە ئەوکاتەش پشت بەخوا ڕیزەکانی نەتەوە لەچاو تروکانێکداو بە ووزەیەکی بەهێزەوە ئالای سەرکەوتن

هەڵدەکەن‌و کۆشك بەرز دەکەنەوەو بەرەو ئاسۆکانی پێش کەتن‌و بەرز بوونەوە دەردەچن.

وە کۆتایی قسەشم بەوە دەهێنم کە ڕووبکەمە خوای بەرزو بەتوانا کە دانایی‌و ڕاستیمان پێ‌ببەخشێ،و ڕزگارمان کات لەخلتەی ئەم خۆڵەمێشەی کە لەژێر قورساییەکانیدا نەتەوەو مرۆڤایەتی دەناڵێنێ، وە داوای لێ‌دەکەم کە بمانگێڕێت بە کارکەرو پیاوچاکانێك کە گوێ لەووتە دەگرن‌و شوێن باشترەکەیان دەکەوون،

واخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمین.

# سەرچاوەکان

**یەکەم:** للمؤلف د. عبد الحميد أحمد أبو سليمان

**نظرية الإسلام الاقتصادية: الفلسفة والوسائل المعاصرة**، القاهرة: مكتبة الخانجي، ١٣٨٠هـ/١٩٦٩م.

**المشكلة والبحث عن حل:** بحث قدم إلى مؤتمر الشباب المنعقد في طرابلس بليبيا، ١٣٩٣هـ/١٩٧٣م.

**مبدأ التوحيد وانعكاساته الاجتماعية**، الندوة العالمية للشباب الإسلامي بالرياض ، ١٣٩٣هـ/١٩٧٣م.

**الأسباب التاريخية لانحراف المجتمعات الإسلامية ومتطلبات تصحيح البنية الحضارية الإسلامية** بحث قدم لندوة الإسلام والحضارة ودور الشباب المسلم، الندوة العالمية للشباب الإسلامي، الرياض، ١٣٩٩هـ/ ١٣٧٩م.

**إسلامية المعرفة**، بحث قدم إلى المؤتمر العالمي الثاني لإسلامية المعرفة المنعقد في إسلام آباد بباكستان ١٤٠٢هـ/١٩٨٢م ونشر في **المسلم المعاصر** ، الكويت العدد ٣١، السنة ١٤٠٢هـ/ ١٩٨٢م.

**دووەم:**

**إسلامية المعرفة:** سلسلة إسلامية المعرفة، المعهد العالمي للفكر الإسلامي ، هيرندن، فيرجينيا، ١٤٠٦هـ/١٩٨٦م.

◦ سيد سابق:

**العقائد الإسلامية** دار الكتاب الحديثة، القاهرة، ١٣٩٦هـ/١٩٧٦م.

◦ علي بن أحمد بن سعيد بن حرم:

**الفصل في الملل والأهواء والنحل**، محمد علي صبيح، القاهرة، ١٣٨٤هـ/١٩٦٤م.

* أبو الفتح محمد بن أبي قاسم الشهرستاني:
**الملل والنحل**، تحقيق محمد بن فتح الله بدران، مطبعة الأزهر، القاهرة ١٣٢٨هـ/ ١٩١٠م.
* محمد عمر فروخ:
**تاريخ الفكر العربي إلى أيام ابن خلدون**، دار العلم للملايين ، بيروت ١٤٠١هـ/١٩٨١م.
* **البداية والنهاية**، عماد الدين أبو الفداء ابن كثير، مكتبة الفلاح ، الرياض ١٩٨١م.
* أبو العباس شمس الدين أحمد بن خلكان:
**وفيات الأعيان**، دار صادر، بيروت. د.ت
* محمد زكريا البرديسي:
**أصول الفقه**، الطبعة الثانية، دار التأليف، ١٣٧٦هـ/١٩٥٦م.
* فخر الدين الرازي:
**المحصول في أصول الفقه**، تحقيق د. طه جابر العلواني.
جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، الرياض ١٣٩٩هـ/١٩٧٩م
* جلال مظهر:
**حضارة الإسلام وأثرها في الترقي العالمي**، مكتبة الخانجي، القاهرة ١٣٩٤هـ/١٩٧٤م.
* قدري حافظ طوفان:
**تراث العرب العلمي**، دار الشروق، بيروت ١٣٨٣هـ/١٩٦٣م.
* فؤاد سزكين:
**تاريخ التراث العربي**، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، الرياض ١٤٠٣هـ/١٩٨٣م.